ناوی کتێب: قیامەت ڕووداوەکان و گۆڕانکاریەکان
نـــاوی نووسەر: د. شکار عزیز محمد
دیزاینـــی بەرگ: نـــاوەندی ڕێنوێن
دیزاینی تێکست: زەردەشـت کاوانی
نۆبەتی چاپ: یەکەم ٢٠٢١
چـــاپ: نـاوەندی ڕێنوێن
تیـــــراژ: (١٠٠٠) دانـــــە
ژمارەی سپاردن: لە بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی کتێبخانە گشتییەکان
ژمارە ( ١٤٨٤ )ــی ساڵی (٢٠٢١)ــی پێ دراوە.



**ناوەندی ڕێنوێن**
07701932749 - 07501269689
hakem1423@yahoo.com
renwen2009@yahoo.com
سلێمانی - بازاڕی ئاوباریک - نهۆمی یەکەم
بەرامبەر کاسۆمۆڵ - دوکانی ژمارە (٦٦)

# گەشتێك بەناو ڕووداوەكانی ڕۆژی یەكلایی بوونەوەو لێپێچینەوە

# گەشتێكی نمونەیی بەناو دیمەن و ڕووداوە یەك لەدوای یەكەكانی ڕۆژی قیامەت

# پێشــەكی

**د. شكار عزيز محمد**

بسم الله الرحمن الرحيم

الحمدلله رب العالمين، والصلاة والسلام على من لانبي بعده

خوێنەری بەرێزو هێژا: سەرەتا سوپاس و منەتباری پەروەردگاری جیهانەكانم كە هاوكاری كردم و توانیم بە پێنووسەكەم یەكەم بەرهەمی نووسراوی خۆم بخەمە ناو كتێبخانەی كوردییەوەو هیوادارم توانیبێتم بەشێكی باش لە زادی خوێنەران و دۆستانی كتێب پڕ بكەمەوەو خوای گەورەش لێی وەرگرتبم و بەرەكەت بخاتە ناو بابەت و نوسراوەكانمەوە .

ئەوەی پێویستە لێرەدا بوترێ ئەوەیە كە یەكەم بەرهەمم دەستم پێكردووەو پێنووسم لێ هەڵگرتووە ئەویش بابەتی: (قیامەت – دیمەن و ڕووداوەكان – گۆڕانكاریەكان)..ە ، لەبەر كاریگەری و گەورەیی ئەو ڕووداو و كارەساتانەی كە لە داهاتوویەكی نزیكدا ڕوو دەدەن بە پێویستم زانی لەسەر ئەو بوارە بنووسم و زۆر بە وردی و بە جیاوازییەكی نوێو و سەرنج ڕاكێشەوە تیشكم خستۆتە سەریان .

ئەوەی من لە ئێوەم دەوێت وەك نوسەری ئەم كتێبە تەنها دوعای خێرە و داوای بەدەستهێنانی فیردەوسی ئەعلام بۆ بكەن لە پەروەردگار.

جزاكم الله خيرا.

لێرەوە زۆر زۆر سوپاسی جەنابی (مامۆستا محمد مەلا فائیق شارەزووری) دەكەم كە هۆكاری نووسینی كتێبەكەم لە نووسراو و كتێبەكانی جەنابیانەوە سەری هەڵداوەو سەرچاوەی سەرەكی بابەتەكەم بووە .

والسلام عليكم ورحمه الله وبركاته

ڕوسیا / ساراتۆڤ - ٢٠٢١/٣/٦

## کلیلی تێگەیشتن لەم کتێبە

**ئەم خاڵانە زۆر گرنگن پێش دەستپێکردن بە خوێندنەوە :**

١/ تۆ پێویستە بە ڕیزبەندی ئەم کتێبە بخوێنیتەوە واتە نابێ هیچ لاپەڕەیەکی لێ بپەڕێنی چونکە ڕووداوەکان یەک لەدوای یەکن و وابەستەی یەکترن

٢/ سروشتی ئەم کتێبە بەجۆرێکە کە دەستتکرد بەخوێندنەوەی (٣) لاپەڕەی یەکەم ئەوا حەزدەکەیت تا کۆتایی بەردەوام بیت

٣/ ئەم کتێبە بەشێوازێک داڕێژراوەو ڕووداوەکانی ناوی بەجۆرێک نوسراوەتەوە وەک ئەوەی تەماشای درامایەک بکەیت یان کتێبێکی ڕۆمان بخوێنیتەوە چێژ لە هەنگاوەکانی ناوی وەربگریت ، وات لێدەکات ئارەزوو بکەیت بزانیت لە قۆناغە جیاوازەکانی ئەو جیهانەدا چی ڕوودەدات !

٤/ ئەم کتێبە ڕووداوەکانی ناوی تێهەڵکێشی چەندین بواری زانستی و فیزیایی و پزیشکی تەکنەلۆژیایی سەردەمی نوێ کراوە چەندین نمونەی تیادانراوە بۆ تێگەیشتنی ئاسان لە ڕووداوەکان و هەنگاوەکان

٥/ ئەم کتێبە بە زمانێکی ئاسان نوسراوەتەوە کە هەموو ئاستێکی کۆمەڵگا دەتوانێت بەئاسانی لێی تێبگات و هەزمی رووداو بابەتەکانی ناوی بکات

٦/ ئەم کتێبە زۆر بەسودە بۆ ئەو کەسانەی کە خەم و خەفەت و ناڕەحەتی و مەئیوسی و بێزاری ئێخەی گرتوون و بێ هیوا بوون لە ژیانیان ، بۆچی ؟ چونکە بەخوێندنەوەی ئەم کتێبە تۆ واقعی خۆت لەناو ئەم جیهانە مەزنەدا دەدۆزیتەوە و بەئیزنی خوای گەورە پاش خوێندنەوە ژیانێکی نوێ دەست پێ دەکەیت بەجۆرێک گۆڕانی تەواوەتی لەهەموو ژیان و تەمەنتدا ڕوودەدات

٧/ ئەوەی من لە ئێوەم دەوێت وەک نوسەری ئەم کتێبە تەنها دوعای خێرە و داوای بەدەستهێنانی فیردەوسی اعلام بۆ بکەن لە پەروەردگار جزاكم الله خيرا والسلام عليكم .

## بزانە تۆی مرۆڤ روبەرووی چوار جیهان دەبیتەوە !

**سەرنج بدەن لەم وتانەو بیری لێبکەنەوە :**

جیهانی یەکەم : جیهانی ناو رەحمی دایک ( جیهانی ناو منداڵدان )

تۆ لەناو ڕەحمی دایکتدا بوویت بەتەنیا خواردن و خواردنەوەو هەموو پێویستیەکت لەلایەن پەروەردگارەوە بۆ دابینکرابوو بەهۆکاری دایکت بۆ ماوەی ٩ مانگ ، پاشان لەو شوێنە بچوک و تەسکەدا هاتیتە دەرەوەو تێکەڵ بوویت بە شوێنێکی ئێجگار فراوان و گەورە کە ژیانی دنیایە ، پاشان تێکەڵ بوویت بە ملیۆنەها مرۆڤی هاوشێوەی خۆت کە هەموویان پێڕی سەدەیەکن و تەمەنیان بەگشتی لەنێوان یەک ساڵ بۆ ١٠٠ ساڵە .

**تێبینی:** بۆ شارەزابوون لەم جیهانە کتێبی زانستی کۆرپەلەزانی (embriology) بخوێنەرەوە .

جیهانی دووەم : جیهانی ژیانی دونیا

لەم جیهانەدا تۆ بۆ تەمەنێکی دیاریکراو وە لەسەردەم و سەدەیەکی دیاریکراودا دەژیت ، بە سێ قۆناغی تەمەن و ژیانتدا گوزەردەکەیت :

١- تەمەنی منداڵی کە ( نە عەقڵ پێگەیشتووە ، نە لاشە پێگەیشتووە )

٢- تەمەنی لاوێتی کە ( لاشە لە تەمەنی ٣٣ساڵیدا دەگاتە پێگەیشتنی تەواو بەڵام عەقڵ هێشتا لە گەشەسەندندایە )

٣- تەمەنی پیری ( لەدوای تەمەنی ٣٣ساڵیەوە لاشە بەرەو لاوازبوون دەروات و عەقڵیش لەتەمەنی ٤٠ ساڵی دەگاتە ئەوپەڕی گەشەکردن )، پاش ئەم تەمەنە لاشەو مێشک بەرەو پوکانەوەو بچوکبوونەوە دەڕۆن و تا دەگەیتە قۆناغێک کە ئامێرەکانی لاشەت لاوازدەبن لە کارکردن و بەمەش تۆ وەفات دەکەیت واتە نەقڵ دەبیت لە جیهانی ژیانی دنیاوە بۆ جیهانی سێیەم کە پێی دەڵێن جیهانی بەرزەخ .

**تێبینی:** بۆ شارەزابوونی زیاتر لەم جیهانە (ژیانی دنیا) کتێبی نیشانەکانی رۆژیی دوای بخوێنەرەوە .

جیهانی سێیەم : جیهانی بەرزەخ

تۆ کە وەفات دەکەیت لەژیانی دنیاوە دەگوازرێیتەوە بۆ ژیانێکی ئێجگار فراوانتر و گەورەترو بەرینتر کە هەموو مرۆڤەکانی تیایە لە ئادەمەوە تا ئەو کەسەی کە لەپێش تۆوە نەقڵ بووە ، هەموویان دەبینیت و ژیانێکی جیاوازەو ئێجگار فراوانترە لە جیهانی ژیانی دنیا (کاتەکەشی زۆر درێژخایەنترە لەو کاتەی کە لەدنیادا هەیە) وە رووبەرووی چەند دیاردەو چەند رووداوێک دەبیتەوە لەو جیهانەدا ، پاشان تۆ لە جیهانی بەرزەخەوە دەگوازرێیتەوە بۆ جیهانی چوارەم واتە جیهانی قیامەت (رۆژی زیندووبوونەوە و هەستانەوە ، جیهانی دادگایی سەرجەم زیندەوەران).

**تێبینی:** لە کتێبی جیهانی بەرزەخ بەوردەکاری باسی ئەو جیهانەو ڕووداوەکانی ناوی کراوە .

جیهانی چوارەم : ژیانی ڕۆژی هەستانەوەو دادگا

ئەو ڕۆژەی کە مرۆڤەکان زیندوو دەبنەوە هەڵدەستنەوە ، زۆر زۆر درێژخایەنترەو فراوانترو گەورەترە لە سێ جیهانەکەی تری وەک ( جیهانی منداڵدانی دایک ، جیهانی دنیا ، جیهانی بەرزەخ ).

ئەو بابەتانەی هەموو ژیان و بیرکردنەوەو تێڕوانینتان دەگۆڕێت !

کورتەی باسەکان لەم چەند خاڵەدا خۆی دەبینێتەوە :-

ئایا لەسەرەتای دەستپێکردنی یەکەم ڕۆژی هەستانەوە لە گۆڕدا چی ڕوودەدات ؟

ئایا نەقڵ بوونی مرۆڤ لە جیهانی بەرزەخ بۆ جیهانی دادگای ئیلاهی چۆن دەبێت؟

ئایا ئەو گۆرانە سروشتیانە چین و چۆنن کە بەسەر ئاسمانەکان و زەوی و مانگ و خۆر و ئەستێرەو هەسارەکاندا دێت ؟

١ / جیهانی قیامەت زۆر زۆر درێژخایەنترەو وە هەموو مرۆڤەکانی تیادا دەبینیت لەیەکەم و مرۆڤەوە تا کۆتا مرۆڤ بەدرێژایی هەموو سەردەم و سەدەکان .

٢ / ئایا شێوازو جۆری ئەو بارانە چۆنە کە بەر خانەکانی ئێسکی کلێنچکە دەکەوێت؟ ئایا چۆن دیسان لەو کۆمەڵە خانەیەوە کە لەشێوەی دەنکە نیسکێکدایە هەموو شانەو خانەکانی لەشی مرۆڤەکان دەست بەدابەشبوون و دروستبوونەوە دەکەن؟

٣/ ئایا مرۆڤەکان کە لاشەیان دروست بۆوە لەو گۆڕەدا بەهۆی ئەو بارانە تایبەتیەوە چۆن ڕۆحەکان دەگەڕێنەوە بۆ ناو ئەو لاشانە ؟ ئایا چۆن پاش گەیشتنەوەی ڕۆح و لاشە بەیەکتر مرۆڤەکان هەڵدەستنەوە لەناو گۆڕەکانیاندا ؟

٤/ ئایا شێوازی ئەم لاشە نوێیە چۆنەو مرۆڤەکان قەبارەو باڵایان چۆنەو چەندە لەو ڕۆژەدا ؟ ئایا خەتەنە کراون یان نا ؟ ئایا ڕووتن و بێ جل و بەرگن یان نا ؟! چەندین زانیاری تری سەرنج ڕاکێشی تر لەم کتێبەدا ببخوێنەرەوە !!!

٥/ ئایا کاتێک کە مرۆڤەکان هەڵدەستنەوە یەکەم شت چی دەبینن چۆن دنیا دەبینن کە گۆڕاوەو خۆریش زۆر نزیک بۆتەوەو وە ئەو زەوییەی لەسەرین چۆنە ؟

٦/ ژمارەی مرۆڤەکان ملیارەها مرۆڤن لەو ڕۆژو جیهانەدا چونکە لەیەکەم مرۆڤەوە تا کۆتا مرۆڤ زیندوو بوونەتەوەو بە قەومی یەئجوج و مەئجوجەوە بە هەموو جنەکانیشەوە لەو ڕۆژەدا ئامادەی ئەو شوێنە تایبەتیەی ژیانی قیامەتن بۆ لێپرسینەوە ؟ ئایا مرۆڤەکان جنەکان دەبینن یان نا ؟

٧ / ئایا عایلەو ماڵ و خێزان لەو ڕۆژەدا حاڵیان چۆنە ؟ ئایا منالێک کە لەمنداڵیدا باوکی یان دایکی مردووە پێیان شاد دەبێتەوە لەو ڕۆژەدا ؟ ئایا هەموو دۆست و خۆشەویستان بەیەکتر دەگەنەوە ؟ ئایا لەو ڕۆژەدا هەموو تاکێکی مرۆڤ دەبنە دوژمنی یەکتر یان نا ؟ چۆن دەبێت ؟

٨/ ئایا لەو ڕۆژەدا کەسانێک لەمرۆڤەکان هەن تایبەتکراوبن و ڕێزلێگیراو بن و خواردن و خواردنەوەو پۆشاکی تایبەتیان پێ بەخشرابێت ؟

٩ / ئایا جۆرو شێواز و ژمارەی ئەو فریشتانە چەندەو چۆنە کە هەموو مەخلوقات لەو ڕۆژەدا بەڕێوە دەبەن و جیایان دەکەنەوەو ڕێکیان دەخەن و ئامادەیان

دەکەن بۆ لێپرسینەوە و دادگایی کردن ؟ ئایا تەرازووە گەورەو سەرنج ڕاکێش و ناوازەکان چۆنن و چەنێ پێشکەوتوون ؟

١٠ / ئایا هەموو زوڵمێک کە کراوە لەنێوان مرۆڤەکاندا چۆن حەق بۆ خاوەن حەق دەگێڕدرێتەوەو چۆن زاڵم و ستەمکار حەقی زوڵمەکەی لێ دەسێنرێتەوە ؟ ئایا چۆن دادگایی نێوان مرۆڤەکان بەڕێوە دەبرێت و جێبەجێ دەکرێت ؟

١١ / ئایا لەو ڕۆژەداو لەو ژیانە درێژخایەنەدا کە قەرەباڵغترین جیهانەو هەرچی مەخلوقاتە تیایدا ئامادەی حەق و حساب کراوە ئایا چ تەکنەلۆژیایەکی ئیلاهی تیایە هەر لە شاشەو پیشاندانەوەی دەنگ و ڕەنگەکان (چونکە وزە لەناو ناچێت) و ئایا ژیانی جن و ئینسەکان لەدنیادا چۆن پەخش دەکرێتەوە ؟ ئایا ئامێرە پێشکەوتووەکانی ناو ئەو جیهانە چۆنن کە بەکاردەهێنرێن بۆ جیاکردنەوەی خراپەکاران لە چاکەکاران؟

١٢/ ئایا چۆن جەهەنەم دەهێنرێت و ئامادە دەکرێت ؟ ئایا چۆن پردێکی گەورە بەسەر دۆزەخدا دروست دەکرێ بۆ پەڕینەوە بۆ ژیانە هەتا هەتاییەکەی بەهەشت؟ ئایا لە شوێنە تاریکاییەکاندا مرۆڤەکان چۆن ڕوناکیان دەست دەکەوێت بۆ ڕێگا تاریکەکان و ڕزگاربوونیان لێی ؟!

١٣/ ئایا پردی سیڕات لە دەمی شمشێر تیژترە؟ بەڵێ چۆن؟ زۆر بەزانستی و لۆژیکی!

**تێبینی:** بۆ وەڵامی ئەم پرسیارانەو چەندین پرسیارو بابەتی سەرنجراکێشی تر خوێنەری ئەم کتێبە بن .

پێش هەموو شتێک تۆ پێویستە ئەمانە بزانیت بەتەواوی و بەتێگەیشتنەوە پاش ئەوە بڕیاربدەیت کە باوەڕت پێی هەیە یان نا ، وە ئەگەر باوەڕیشت پێی نەبوو پێویستە بەدیلت هەبێ بۆ غەیری ئەم بابەتە ئیمانی وغەیبیانە .

لەدوای ئەم جیهانە تۆ دەگەیت بە جیهانی ژیانی هەتاهەتاییت (مەنزڵگەی کۆتاییت) کە یان ڕەوانەی بەهەشت و ژیانە پڕ لە نازونیعمەتەکان دەکرێی ، یاخود پەنا بە پەروەردگار بەرەو زیندانەکانی دۆزەخ و ئاگرەکەی ڕەوانە دەکرێیت .

سەرەتا : پێویستە ئەم بابەتە پزیشكیە بزانیت :

## پەیوەندی نێوان ( فیزیۆلۆجی )
## دەزگای بیستنی مرۆڤ و هەڵگیرسانی ڕۆژی قیامەت

**پرسیار/** بۆچی پەروەردگار بۆ بەرپاكردنی ڕۆژی قیامەت كار لەسەر دەزگای بیستنی زیندەوەران دەكات ؟

**پرسیار/** بۆچی خوای گەورە بۆ دەستپێكردنی ڕۆژی قیامەت و مراندنی هەموو زیندەوەران فریشتەیەكی ڕاسپاردووە كە فو بكات بە ئامێرێكدا كە پێی دەوترێ (صور) یاخود كەڕەنا ؟

كەڕەنا یاخود صور چیە؟ چ پەیوەندیەكی بە بواری ئەناتۆمی و فیزیۆلۆجی لەشی زیندەوەرانەوە هەیە؟

**وەڵام :**

**كەڕەنـــا:** ئامێرێكە لە شێوەی شاخی ئاژەڵدایە و دەنگێكی بەرزو گەورەی بەهێزی لێ دێتە دەرەوە بەهۆیەوە هەموو مرۆڤەكان و زیندەوەران دەمرن و لەناو دەچن لەسەرەتای دەستپێكی ڕۆژی قیامەتدا

١/ دەزگای بیستن تاكە ئامێرە كە لەلەشی زیندەوەراندا بەتێكڕایی تەمەن ئیش دەكات ئەویش بریتیە لە گوێیەكان واتە كاتێك تۆ دەنوویت هەموو لاشەت ئارامی وەردەگرێت بێجگە لە ئامێرەكانی بیستنت بەبەردەوامی و بەدرێژایی تەمەن كاردەكەن

٢/ دەزگای گوێی ناوەڕاست كە لە دووبەش پێكهاتووەو پێی دەڵێن (vestibular labyrinth) خاوەنی شلەیەكە كە هاوسەنگی لەش ڕادەگرێت بەهۆیەوە تۆ دەتوانی بەڕێك و پێكی بوەستیت و كۆنترۆڵی جوڵەو هاتن و چوونت بكەیت وە كۆنترۆڵی سوڕاندنی سەرت بكەیت كاتێك سەردەجوڵێنیت ئەم شلەیە لەناو دەزگاكەدا دەچێتە

لایەکەی ترو پەستان دەخاتە سەر گەیەنەرەکانی لایەکەی تری مێشک و بەهۆیەوە مێشک لەبەشی (سێریبلیەمدا) کۆنترۆڵی بەشەکەی تری لەش دەکات ، بۆیە ئەم شلەیەی گوێی ناوەڕاست کۆنترۆڵی لەشت دەکات ئەگەر بێتو گوێی ناوەڕاستت توشی ئیلتیهاب و نیکرۆس واتە مردنی خانەکان ببێتەوە ئەوا تۆ هاوسەنگی لەشت تێک دەچێت و ناتوانیت خۆت ڕابگریت .

ئێستا بۆمان دەرکەوت کە هەموو دەزگاکانی گوێ بەگشتی و بەدرێژایی تەمەن کاردەکەن و (گوێی ناوەڕاست بەتایبەتی) بەرپرسە لە جوڵەو هاوسەنگی لەشت بۆیە پەروەردگار کاتێک ڕۆژی قیامەت بەرپا دەکات بە ئامێرێک بەرپای دەکات کە فریشتەیەکی بۆ دابینکردووەو ناوی ئیسرافیلە ئەم ئامێرە کار لەسەر گوێیەکان (واتە دەزگای بیستنی زیندەوەران) دەکات چونکە گوێیەکان بەدرێژایی تەمەن کاردەکەن و بەم دەنگە لەکاریان دەخەن و هاوسەنگی لەشت تێک دەچێت و بەمەش بەشی کارەبایی مێشک بەهۆی ئەم ئامێرەوە (ئامێری کەڕەنا) لەئیش دەکەوێت و زیندەوەران ڕۆحیان لەلاشەدا دەردەچێت و کارەبایی مێشک و دڵ بەتەواوی دەکوژێتەوە .

**تێبینی** / ئێستا لە زۆرینەی وڵاتان ئامێری پۆلیسیان دروست کردووە کە لەسەر گوێی ناوەڕاست ئیش دەکات کاتێک تاوانبارێک دەیەوێ ڕابکات لەدەستی پۆلیس ئەوانیش بەو ئامێرە کۆنترۆڵی دەکەن و بەهۆیەوە ئەو کەسە لەکاریگەری دەنگەکە لەشوێنی خۆی ڕادەوەستێ یان دەبورێتەوە

ئێستا لە حیکمەتی ئامێری کەڕەنا تێگەیشتن کە کار لەسەر ئامێری بیستنی زیندەوەران دەکات بە فوکردن بەو ئامێرەدا لەلایەن ئیسرافیلەوە ڕۆژی قیامەت بەرپا دەبێت و بەهۆیەوە گشت زیندەوەران رۆحیان لە لاشەیان جیا دەبێتەوە .

## دەستپێکردنی گۆڕانکاریە سروشتیەکان

ئێستا من و تۆ و هەموو مرۆڤەکان بەردەوامین لەژیان ، وە دنیای خۆمان ئەگوزەرێنین و کاردەکەین و دەخۆین و دەخەوین نوێژو عیبادەت و خواپەرستی ئەنجام دەدەین بەڵام نیشانەیەک ڕوودەدات لە زەمەنەکانی داهاتوودا ئەویش بریتیە لەوەی کە قورئانی پیرۆز هەڵدەگیرێتەوە کاتێک مسوڵمانان کتێبەکان و ئامێرەکانیان دەکەنەوە تەماشا دەکەن لاپەڕەکانی قورئان هەمووی سپیەو یەک پیتی تیانەماوە بۆیە لەو ڕۆژەدا مسوڵمانان زۆر خەمبارو بێتاقەت دەبن بەم ڕووداوە داوا لە پەروەردگار دەکەن دوای هەڵگرتنەوەی قورئان ڕۆحی ئەوانیش بەرێتەوە بۆلای خۆی چونکە ژیان بێ قورئان ژیان نیە !

پەروەردگاریش شنەبایەک هەڵدەکات و بەهۆیەوە ڕۆحی هەرچی مرۆڤە کە زەڕەیەک ئیمانی تیابووبێ دەکێشرێ و هەموو مسوڵمانان و خواپەرستان دەباتەوە بۆلای خۆی .

لەم کاتەدا دنیا تەنها ئاژەڵان و مرۆڤە بێدین و بتپەرست و کافرەکانی تیادا دەمێنێتەوە دنیا بەتەواوی دەبێتە دنیای کافرو موشریکی بت پەرست.

لەکاتێکا کە لەناو خەڵکان دین نەماوە کەس خوا ناپەرستێت و بتپەرستی شەیتان پەرستی دەبێتە دیاردەیەکی ئاشکرا مرۆڤەکان هەموو لەتاواندا دەژین بەجۆرێک هەرچی تاوانی قێزەونە ئەنجامی دەدەن کە لە ئاژەڵ خراپترن ، لەم ڕۆژەدا جنەکان دەچنە ناو پەیکەری بتەکانەوەو بەئاشکرا بتەکان لەگەڵ مرۆڤەکان قسە دەکەن و بەم شێوەیە خەڵکی لەو کۆتا زەمانەدا بتێک دەپەرستێت کە توانای قسەکردنی هەیە .

ئیتر دنیا کە یەک مسوڵمانی تیانیەو ئەو خەڵکەی کە تیایدا دەژین هەمووی بێدین و بتپەرستن ، خوای گەورە لەم کاتەدا دنیا بۆ خەڵکی بێدین و کافر بەردەوام ناکات بۆیە فەرمان دەکات کە قیامەت بەرپا ببێت وە بۆ بەرپاکردنی قیامەتیش فەرمان بە فریشتەیەک دەکات کەناوی ئیسرافیلە ئەم فریشتەیە فو دەکات بەئامێرێکدا کە پێی

دەڵێن (سوڕ یاخود کەڕەنا) ئەم ئامێرە دەنگێکی زۆر بەهێزی هەیە کە بەهۆیەوە کار لە دەزگای بیستنی زیندەوەران دەکات بەمەش ڕۆحی هەموو زیندەوەران دەکێشرێت

هەروەها دەنگی ئەم ئامێرە لەتوانایدا هەیە کە زەمین لەرزە دروست بکات ئەم زەمین لەرزەیە دەبێتە هۆکاری ڕوخان و وردو خاشبوونی شاخەکان و چیاکان و بەردەکان و بیناو باڵەخانەکان ، یەکەم کەس کە گوێی لەم دەنگی ئامێرە دەبێت پیاوێکە حەوزی ئاوی حوشترەکەی سواغ دەدات، وە دوو پیاوی تریش کە یەکیان جل و بەرگ و پۆشاکی بڵاوکردۆتەوە بۆ کڕین و فرۆشتن بەجۆرێک کاتێک گوێیان لەم دەنگە دەبێت نە فرۆشیار فریای فرۆشتنی پۆشاکەکەی دەکەوێت نە کریار فریای کڕینی پۆشاکەکەی دەبێت .

لەو ڕۆژەدا کەسی وا هەیە کە پارووە نانەکەی بەرزکردۆتەوە بیکاتە دەمیەوە بەڵام بەهۆی دەنگەکەوە فریای کردنە ناو زاری نابێت و دەمرێت .

کەسانی تر هەن کە خەریکی دەمەقاڵێن و بەهۆی دەنگەکەوە فریای دەمەقاڵێکەیان ناکەون و دەمرن و ڕۆحیان لەلەشیان دێتە دەرەوە، کەسانێک کە خەریکی سەرگەرمی کاروباری دنیای خۆیانن فریای گەڕانەوە بۆ ناو ماڵ و منداڵیان ناکەون وهەموو لەشوێنی خۆیان دەمرن بەهۆی گەورەیی و بەرزی ئەم دەنگەوە کە کار لە دەزگای بیستنیان دەکەن.

کاریگەری لەرەلەری بەرزی دەنگی ئامێری کەرەنا لەسەر شاخەکان و ئاسمانەکان و دەریاو زەریاکان !

کارەکە هەر بەمەشەوە ناوەستێ بەڵکو کۆمەڵێک گۆڕانکاری ئێجگار گەورە ڕوودەدات لەئاسمانەکان و ئەستێرەو خۆرو ڕۆژ و زەوی و چیاکان و دەریاو زەریاکان کە بەم شێوەیەن.

١/ سەرەتا خۆر وردە وردە کز دەبێت و تا بەتەواوی دەکوژێتەوە وەک باسمان کرد خۆر ناوەندێکی وزەی ڕوناکیە ( نەک تۆپێکی ئاگراوی بێت و تەقینەوەی تیا ڕوودات !) بەڵکو خۆر وەک نمونەی گڵۆپێکی کارەبایی ماڵان وایە ، خۆر بەهۆی کاریگەری لەرەلەری ئەم ئامێرەوە دەکوژێتەوە.

٢/ مادەی ڕۆژ ورده ورده نامێنێت و بەرەو تاریک بوونی تەواوەتی دەڕوات و تا وای لێدێت دەبێتە یەک پارچە شەو.

**تێبینی** / ماددەی شەو و ڕۆژ دوو مەخلوقی (دوو دروستکراوی) جیاوازن لە خۆرو مانگ ، خۆر بەهۆی ماددەی ڕۆژەوە ڕوناکیەکەی پەرش دەبێتەوەو دەبێتە ڕوناکیەکی بینراو ( سورەتی الشمس ئایەتی ٢ ) .

٣/ئەستێرەکان کە لە شەواندا ئاسمانیان ڕازاندۆتەوە بە ڕوناکیە ڕەنگاو ڕەنگەکانیان بەڵام بەهۆی ئەو دەنگەی یەکەمی کەڕەناوە ڕوناکیەکانیان نامێنێ و دەکوژێنەوەو ون دەبن وە هەموویان دەتەقێنەوەو پارچە پارچە دەبن و لەناو دەچن.

٤/ بەهۆی ئەو دەنگە بەهێزەوە چەند بومەلەرزەیەک لەسەر هەموو زەوی دروست دەبێت کە دەبێتە هۆی هەڵکەندنی ئەو شاخە بەهێزانە کە وەک خوریەکی ڕەنگاو ڕەنگی شیکراوەو هەڵوەشاوەیان لێدێ و دەچن بە ئاسماندا پاشان وردو خاش دەبن ، وە هەڵتەکاندنی شاخەکان بەجۆرێکە ڕەگ و ڕیشاڵیان لەبنەوە هەڵدەتەکێنێت تا وایلێدێت دەتەقێنرێنەوەو ئەو بەردە گەورەو ڕەقانە دەبنە خۆڵ و لمی ڕەنگاو ڕەنگ.

٥/ هەرچی ئاوی دەریاو زەریاکانە دەچنەوە سەر پێکهاتە سەرەکیەکانی خۆیان کە لە گەردیلەیەک ئۆکسجین و دوو گەردیلە هایدرۆجین پێکهاتبوون وەک دەزانن هایدرۆجین گازێکی سوتێنەرەو وە ئۆکسجینیش یارمەتی سوتان دەدات بۆیە هەرچی ئاوی دەریاو زەریاکانە بەهۆی ئەم کارلێکە کیمیاییەوە دەبنەوە بە یەک پارچە ئاگر وە هەر ئەم ئاگرەشە بەشداری دەکات لەوەی کە بەردی ڕەقی شاخەکان ورد ببن و پاشان ببنەوە بە خۆڵ و لم.

٦/ هەرچی بینای ئاسمانەکانە یاخود تەبەقی ئاسمانەکان کەرت کەرت دەبن و ئینشیقاقی تێ دەکەوێت واتە (شەق دەبات) درزیان تێ دەکەوێت و سور هەڵدەگەڕێن و دەبنە ڕۆنی پاڵفتەی سورباو .

**تێبینی**/ ئاسمان بینایە ئاسمان وەک بینایەک (سەقفێک) بەسەر زەویدا بیناکراوە واتە ئاسمان خوڕافاتی بۆشایی نیە ئەوە تەنها لە بیردۆزی دەجال و شەیتان پەرست و ئیلحادەکانا هاتووەو نوسراوەو پاشان لە خەڵکی کراوەتە زانست

ئەگینا ئاسمان وەک لە قورئاندا باسکراوە بیناو سەقفە بەسەر زەوییەکی فراوانی گەورە کە فراوانی ئەو زەوییە هێندەی فراوانی ئاسمانە و ئاسمان وەک سەقفێک بەسەریدا بیناکراوە و کەس ناتوانێ بگاتە کۆتاییەکانیان ، ئێمەو قارەو دەریاو زەریاکان لەناو خانەیەکی بچوکی ئەم زەوییە گەورەو فراوانەدا دەژین .

دنیا وێران بووەو بومەلەرزەی زۆر گەورەو بەهێز ڕوویداوە شاخەکان لە ڕەگ و ڕیشەوە دەرهێنراون و وەک خوری شیکراوەی ڕەنگاو ڕەنگ بەئاسماندا فڕیون ئاوی دەریاو زەریاکان بوون بە پارچەیەک ئاگر ، ئاسمانەکان درزیان تێکەوتووەو شەقبوون و بوون بە ڕۆنێکی پاڵفتەکراو ، هەرچی زیندەوەران و مرۆڤەکانە ڕۆحیان لەلاشەیان جیابۆتەوەو لەناو گۆڕەکانیانا یان لەشوێنی خۆیانا کەوتوون و نوستوون و مردوون لەکاتی ئەم ڕووداوانەدا ، هەموو ئەم گۆڕانکاریانە بەهۆی فوکردنی یەکەمجار بەئامێری کەڕەنادا ڕوویداوە چونکە دەنگە بەهێزو گەورەکەی ئەم ئامێرە بە ئەمری پەروەرێن هەموو ئەم گۆڕانکاریانەی دروستکرد لە دنیاو ژیاندا .

بۆماوەی ٤٠ ساڵ سەرزەوی و ئاسمانەکان ئاوایان لێهاتووەو بەوشێوەیە دەبن دنیا بەبێ ژیان و بەبێ زیندەوەران دەبێت وە هیچ ڕۆحلەبەرێک و زیندوویەک بوونی نابێت و هەموو مردوون هەناسەیەک بوونی نیە لەماوەی ئەم ٤٠ ساڵەدا

تەنانەت مەلائیکەتەکان وەک جوبرەئیل و میکائیل و ئیسرافیل و مەلائیکەتی ڕۆحکێشانیش دەمرن لەماوەی ئەم ٤٠ ساڵەدا.

پاشان پەروەردگار زاتی گەورەیی خۆی دێتە ئاسمانی دنیا و دەفەرموێ (ئەمڕۆ موڵک هی کێیە؟) هیچ کەسێک نیە لەم ساتەدا وەڵام بداتەوە چونکە هەمووی مردوون ،

کوا تاغوتەکان کە خۆیان بەخوا دەزانی ؟

کوان ئەوانەی کە ڕازیبوون سوجدەو نوێژیان بۆ بکرێت ؟

کوان ئەوانەی دەیان وت ئێمە خوای سەر زەوین دەبێ بپەرسترێین ؟

کوان ئەوانەی دەیان وت بەرنامەو پڕۆگرامی ئێمە چاکترو باشترە لە قورئان و سونەتی پێغەمبەران ؟

کوان ئەوانەی لەبری پەروەرێن سەرکردەکانیان دەپەرست ؟

کوان ئەوانەی شێخ و گەورەو ساحیرەکانیان دەپەرست و لێیان دەپارانەوە ؟

کوان ئەوانەی هانایان بۆ قەبرو شێخ و نوشتەو دەوڵەمەندەکان دەبردو تیایانا دەپاڕانەوە بەڵام ڕوویان نەدەکردە زاتی الله جل جلاله ؟

کوا ئەو فیرعەونانەی کە خەڵکانیان توشی کوفرو شیرک و برسێتی و قات و قڕی و ناڕەحەتی دەکرد و وە ڕازیبوون کە خەڵکان لەبری خوا بیانپەرستن و شوێنی بەرنامەو دەستورە پڕوپوچە دروستکراوەکانیان بکەون ؟

کوان ئەوانەی بێدین بوون بە بەدیهێنەری گەردوون و ئاسمانەکان و زەوی و ژیان ؟

کوان ئەوانەی نوێژیان نەدەکرد و سەریان نەدەکرد بەفەرزی خوایا ؟ کوان ئەوانەی ڕۆژوویان نەدەگرت ؟

کوان ئەوانەی تا نوێژێکیان دەکرد چواریان یان نەدەکرد ؟!

هەموو ئەمانە لەم ساتەدا مردوون و هیچ دەنگێکیان لێوە نایەت هیچ دەسەڵاتێکیان نیە هەموو لاشەکانیان لەنزمترین شوێنی ئەم دنیایەدان کە پێی ئەڵێن زەوی و شیبوونەتەوە بۆ خۆڵ و گڵی زەوی وە بەڕۆحەکانیشیان لە دۆزەخدان عەزابی ئەو کوفرو لادانە دەچێژن کە بەرپایان کردبوو لە ژیانی دنیایاندا

مرۆڤە ئیماندارەکانیش بەگشتی بەرۆح لە بەهەشتدان بەلاشەش هەر لەناو سکی زەویدان وە زۆرێکیان لاشەکانیان بوونەتەوە بە خۆڵ و گڵی زەوی ، پێغەمبەران و شەهیدانیش لاشەکانیان وەک خۆی لەناو زەویدا ماوەو نەگۆڕاوە

پاشان پەروەردگار جل جلالە خۆی وەڵامی خۆی دەداتەوەو دەفەرمووێ (لله واحد القهار ) موڵک تەنها هی الله ی خاوەن و هێزو دەسەڵاتە

بۆیە بۆ ٤٠ ساڵ دوای ئەوەی ئاسمانەکان و زەوی و تێکچوون و زیندەوەران هەمووی مردوون و دنیا وێران بووەو ژیان وەستاوەو هەمووی ڕوخاوەو لێکترازاوەو یاسای کەونی تێکچووە دوای ئەوە پەروەردگار ئیسرافیل زیندوو دەکاتەوەو فەرمانی

پێ دەکات کە فووی دووەم بکاتەوە بەدەزگاو ئامێری کەڕەنادا تا کۆمەڵێ گۆڕانکاری گەورەتر ڕووبداتەوە لە جەستەی مرۆڤ و گیانەوەران و سروشت بەم فوکردنەی دووەم بەئامێرەکەدا :

گیانلەبەران لە مرۆڤەکان و گیانەوەران هەموو زیندوو دەبنەوە و ڕۆحەکانیان دەگەڕێنریتەوە بۆ لاشەکانیان وە یەکەم ئومەتیش کە زیندوو دەکرێنەوە بریتین لە ئومەتی محمد علیه صلاة والسلام .

زیندوو بوونەوەی فیزیۆلۆجیانەی لاشەکان لەو رۆژەدا :

بارانێک دەبارێ و بەر خۆڵی لاشەت دەکەوێ و پاشان جەستەت دروست دەبێتەوە دواتر ڕۆح دەگەڕێتەوە بۆناو لاشەت

**تێبینی** / ئەو بارانە لەشێوەی مەنی پیاودایە بەڵام مەنی نیە پەروەردگار تەنها خۆی دەزانێ چیەو لە چی دروستی کردووە ئەم باران و ئاوە بەر ئێسکێک دەکەوێ کە پێی دەڵێن ئێسکی کلێنچکە ( coccygeal ) .

ئەگەر زیندەوەران هەموو لاشەشیان بووبێت بە خۆڵ ئەوا بەشێکی بچوک لەناو ئەم ئێسکە کە کۆتا بڕبڕەی پشتی لەشی زیندەوەرانە بەتایبەتی مرۆڤەکان کۆمەڵێک خانەی تیایە هەتا هەتایە دەمێننەوە و هیچیان لێ نایەت بۆیە ئەم خانانە کاتێک ئەم بارانەیان بەردەکەوێت ئەوا لاشەکە دیسان لەوێوە دەست بە دابەشبوون و دروستبوونەوە دەکات و دەڕوێتەوەو بەشێوەیەک کە لە تەمەنی ٣٣ ساڵیدایە بەجۆرێک کە خەتەنەش نەکراون .

پاشان تۆ ئەگەر بەهەشتی بووبیت ئەوا دوای وەفاتکردنت ڕۆحەکەت پێش ڕوودانی ئەم ڕووداوانە لەناو لاشەی باڵندەیەکایە لە دەوروبەری بەهەشت و لەبەروبوومەکانی دەخوات بەڵام بەهەڵگیرسانی ڕۆژی قیامەت و دوای فوکردنی دووەم جار بە کەڕەناداو پاش بارینی بارانەکەو دروستبوونەوەی لاشەکانیان ئەم ڕۆحە بەهەشتیەی تۆ لەلاشەی ئەو باڵندەیە دەردەچێت و دەگەڕێتەوە بۆ ناو لاشەکەی خۆت کە لە ناو زەویدا بووە وە ڕۆحی کافرانیش کە لەناو دۆزەخدا بووە بەهەمان شێوە دەگەڕێنەوە بۆ لاشەکانیان .

وه پاش گەڕانەوەی ڕۆح بۆناو لاشەكان زەوی درزو كەلێنی گەورەی لێ دەكەوێتەوەو لەیەک جیادەبێتەوەو فەرمانی پێ دەكرێت ئەوەی لەناوسكیدایە لەلاشەی زیندەوەران فرێی بداتە دەرەوە بیانهێنێتەوە سەر ڕووی خۆی وە پاشان ڕۆحەكان دێنەوە ناو لاشەكان و مرۆڤەكان هەڵدەسنەوە بەهەستانەوەیان هەموو پرسیار لەیەک دەكەن ئەوە چی ڕوویداوە؟ بۆ لێرەین؟ دنیا بۆ وایلێهاتووە ...هتد!؟

بە دروستبوونەوەی لاشەو ئەندامەكان و گەڕانەوەی ڕۆح بۆناوی ئامێرەكانی لاشەت دەست دەكەنەوە بە ئیش و بەمەش تۆ لە گۆڕەكەت هەڵدەستیتەوەو دێیتەوە دەرەوە.

كە هەستایت تەماشا دەكەیت ملیارەها مرۆڤ هاوشێوەی تۆن و هەستاونەتەوەو جل و بەرگ و پۆشاكتان لەبەرانیە هەموو ڕووتن بە نێرو مێوە بە مناڵ و گەنج و پیرەوە بەجۆرێک هەموو بەشەكانی لەشتان بۆ دروست بۆتەوەو خەتەنەش نەكراون.

لە گۆڕەپانە گەورەیەی مەحشەردا بە ملیارەها مرۆڤی لێیە بە ملیارەها جنی لێیە بە ملیارەها یەئجوج و مەئجوجی لێیە قەرەباڵغیەكە هەر مەپرسن هەموویشی لەیەكتر دەپرسن ئەوە چی ڕوویداوە و ئێمە بۆ لێرەین ! هەموو هاواردەكەن و بەتایبەتی كافرەكان دەڵێن هاوار بۆ ئێمە ئەوە كێ ئێمەی زیندووكردەوە لەگۆڕەكانمان.

یەكەم كەسیش لە ئومەتی ئیسلام كە زیندوو دەبێتەوەو لە گۆڕەكەی دێتە دەرەوە پێغەمبەری خوایە علیە صلاة والسلام.

هەموو تاكێكیش كە زیندوو دەكرێتەوە لەسەر بیروباوەڕی خۆی زیندوو دەكرێتەوە ئەگەر ئیمانداربوبێت یاخود دووڕوو یان كافربووبێت .

مرۆڤی واهەیە لە حەجدا بە (لبیک اللهم لبیک) وەفاتی كردووەو بەهەمان حاڵەوە زیندوو دەكرێتەوە و هەمان شیعار دووبارە دەكاتەوە لەوێش ، مرۆڤی وا هەیە لە سوجدەیا وەفاتی كردووە بەهەمان شێوە و حاڵ زیندوو دەكرێتەوە ، مرۆڤیش هەیە بە سەرخۆشی و بێدینی مردووەو بەهەمان شێوە زیندوو دەبێتەوە لەوێ و كوێرە چونكە لەدنیادا خۆی كوێركردبوو لەبەرامبەر پەیامی دینی خوای گەورە ...هتد

ئەوەی سو خۆر بووبێت وەک شێت زیندوو دەبێتەوە واتە کەسێک شەیتان دەستی لێ وەشاندبێ یاخود فێی لێ هاتبێ

کەسانی پلەبەرزی ئیمان و باوەڕدارو لەخوا ترس و موەحید لەم کاتەدا هەمان ئەو دوو فریشتەیەی لەگەڵی بوون (دوو فریشتەکەی سەرشانی کە کردەوەکانیان دەنوسیەوەو تۆماریان دەکرد لە دنیادا ) ، لەو ساحەی مەحشەرەدا بەتایبەت دێن بۆلای و مژدەی دەدەنێ و دڵخۆشی دەکەن و ترسی دەڕەوێننەوە

من و تۆو هەموو مرۆڤەکان کە زیندوو دەکرێینەوە هەموومان تەمەنمان ۳۳ ساڵەو تەنانەت خەتەنەکراویش نین

هەموو ئاژەڵەکان و باڵندەکانیش زیندوو دەکرێنەوە بەهەمان شێوەی مرۆڤەکان و جنەکان

وە بەهەمان شێوە هەموو ڕۆژەکانی هەفتەش زیندوو دەکرێنەوە لەسەر شێوەی خۆیان

لەو ڕۆژەدا بەهەمان شێوە خۆر دەهێنرێتەوە سەریان ئەمجارەیان یەک میل یان دوو میل لەسەر سەریانەوە بەرزەو وە ئەمەش دەبێتە هۆی عارەق بوونەوەیەکی زۆر بۆیان ئەویش بەگوێرەی کارو کردەوەکانی خۆیان دەبێت تەنانەت وایان لێ دەکات کە هەندێ بەشی جەستەیان بتوێتەوە وە دیسان بۆی دروست بکرێتەوە چونکە لەو رۆژەدا مردنی یەکجارەکی و جیابوونەوەی ڕۆح لەلاشە نەماوە نامرن بەم گەرمی و ئازارە

ئەو ڕۆژە هێندە ترسناکە کە کاتێک مرۆڤەکان و باقی دروستکراوەکان زیندوو دەکرێنەوە زۆرینەی خەڵکان لەترساندا چاوییان ئەبلەق دەبێت و سەرشۆڕ دەبن؟ بۆچی ؟

چونکە وەک چۆن ئێستا من بۆتانی باس دەکەم و زۆرێک هەیە گاڵتەی بەم بابەتانە دێت هەرلەبەرئەوە لەو ڕۆژەدا هەموو ئەو بێدین و دووڕووانە کە ئەم واقع و حەقیقەتە دەبینین بەچاوی خۆیان ، ئینجا بیریان دەکەوێتەوە کە ئەمە راستیەو پشێتر لەلایەن مسوڵمانان و بانگخوازان و پێغەمبەرانەوە ئاگادارکرابوونەوەو

پێیان وترابوو بەڵام ئەمان گاڵتەیان پێ دەهات ! بەڵام بەم بیرکەوتنەوەیەیان و بینینی ڕووداوەکان بەچاوی خۆیان چاوییان ئەبڵەق دەبێت و سەرشۆڕ دەبن

ئەو ڕۆژە هێندە سەختە کەس ئاگای لەکەس نابێت تەنانەت بەجۆرێکە دایک رۆڵەکەی خۆی لەبیر دەکات و بەس لەخەمی ئەوەدا دەبێت خۆی ڕزگاری بێت لەو نارەحەتیە هەروەها ژن و مێرد لەیەک ڕادەکەن ، دایک لە ڕۆڵەکەی ڕادەکات، باوک لەمناڵ و ژنەکەی ڕادەکات بەس بۆئەوەی خۆی ڕزگاری بێت

نارەحەتی ئەو ڕۆژە بەشێوەیەکە بۆ بێدین و دوو ڕووەکان دڵ و چاوەکانیان دەکەوێتە لەرزە لەرز وە تەمەننا دەکەن زیندوو نەکرانایەوەو لاشەکانیشیان هەر لە گۆڕەکانیانا بمانایەنەوە .

ترسناکی ئەو ڕۆژە بەشێوەیەکە کە مناڵ لەترسانا موی سەرو لەشی سپی دەبێت ، ئەو ڕۆژە هێندە سەختە خەڵکان لەترسی حساب و کتاب و سزایی مەحکەمەی خوایی وەک سەرخۆش وان و هۆشیان بەخۆیانەوە نیە

لەو ڕۆژەدا تاوانباران خۆزگە دەخوازن کە یەکێک هەبوایە تکای بۆ بکردنایە تا بگەڕانایەتەوە بۆ دنیاو کاری چاکەی تیابکەن بەڵام گەڕانەوە نیە بەهیچ شێوەیەک بۆ دنیا ، بۆچی ؟ چونکە تۆ خوا تەمەنێکی دوورو درێژی پێدابوویت بەلایەنی کەمەوە ٧٠ ساڵ ئیتر بە ٧٠ ساڵ نەتەوێ گوێبگریت بۆ پەیامی خواو شوێن بەرنامەی خالقەکەت نەکەوی دیارە زۆر نەزانیت و موستەحەقی ئەو ڕۆژە سەختەیت !

لەو ڕۆژەدا کە تاوانباران و بێدینان و کافران و مولحیدەکان دەبینن مسوڵمانانی سەرجەم ئومەتەکانی پێغەمبەران (علیهم سلام) چ ڕێزێکیان لێ دەگیرێ ئاوات دەخوازن و خۆزگە دەخوازن کە ئەمانیش وەک مسوڵمانان شوێنی پێغەمبەران و پەیامی پەروەردگار بکەوتنایەو موەحید بوونایە

لەو ڕۆژەدا ئەوانەی شوێن بێدینەکان کەوتبوون و شوێن بەرنامەو پرۆگرامی غەیری (ئاینی ئیسلامی پێغەمبەران کەوتبوون) ئاوات دەخوازن کە شوێن هاوەڵانی خۆیان لە کوفرو بێدینی و عەلمانیەت و ...هتد نەکەوتبوونایە

لەو ڕۆژەدا هەموو دۆست و برادەرانی ناو کافران و بێدینان دەبنە دوژمنی یەکتر و بەگژی یەکدا دەچن و پێیان دەڵێن ئێمە لەدنیادا خزمەتکاری ئێوە بووین و شوێنتان کەوتبووین و پیاومان بۆ کوشتبوون و دەمانپاراستن ئەگەر دەتوانن شتێک لەسزای خوا لەم ڕۆژەیا لێمان دووربخەنەوە ؟ بەڵام بەدڵنیاییەوە ناتوانن و سەرەنجامیش هەمووی خۆی لەوی تر بەری دەکات واتە جوندی فیرعەون خۆی لە فیرعەون بەری دەکات بەهەمان شێوە فیرعەونیش خۆی لە جوندیەکانی خۆی بەری دەکات .

بەڵام خوا هەموو دۆست و احبابەکانی دنیا بەیەکەوە حەشرو حساب دەکات واتە کێت خۆش بوێت لەگەڵ ئەو دەبیت لەو ڕۆژەداو لەگەڵیدا ریز دەکرێیت .

لەو ڕۆژەدا ئا ئەو بێدین و کافرو موشریکانە ئاوات دەخوازن کە بگەڕێنەوە بۆ دنیا تا خۆیان لە گەورەو سەرکردەکانیان بەری بکەن لەتاوی ناڕەحەتی و ترس و عەزابی ئەو ڕۆژە سەختە .

لەو ڕۆژەدا ستەمکاران و زاڵمان ئاوات دەخوازن بگەڕێنەوە دنیاو کوڕو مناڵ و ژن و سەروەت و سامان و خزمانیان هەمووی ببەخشن تاکو ڕزگاریان بێت لەناڕەحەتی ئەو ڕۆژە بەڵام گەڕانەوە نیە بەهیچ شێوەیەک .

لەو ڕۆژەدا مرۆڤ لە خزم و کەس و هاوەڵ و هاوڕێ و ژن و منالی هەڵدێت نەوەکو مافێکی لابێت و داوای لێ بکاتەوە وە هەموو تاکێک لەو ڕۆژەدا سەرقاڵە بە چارەنوسی خۆیەوە .

## ڕۆیشتن لە زەوی دنیاوە بۆ
## خاکی سپی پاک و بێگەردی قیامەت پاش زیندووبوونەوە

پاشان پەروەردگار فەرمان دەکات لە ڕێی بانگکارێکەوە کە هەموو مەخلوقات دەبێ ئەو زەوییەی کە لێی ( ژیاون و لێی مردوون و پاشان زیندووکراونەتەوەو دروستکراون لێی ) بەجێی بێڵن و بڕۆن بۆ زەوی مەحشەر .

**زەوی مەحشەر** / خاکێکی سپی تەختە بەرزو نزمی نیەو سنورو نیشانەی هیچ کەسێکی لەسەر نیە ( واتە وەک زەوی دنیا کەسێک سنوری بۆ نەکێشاوەو داگیری کردبێت ) وە ئەم زەوییە هیچ خواری و نارێکیەکی تیانیە ، ئەم زەوییە زۆر پاک و بێگەردو بێ خەوشەو هیچ زوڵم و تاوانێکی لەسەر ئەنجام نەدراوەو خوێنی لەسەر نەڕژێنراوە ، چونکە پەروەردگار عادلەو زوڵم ناکات و وە حسابی دروستکراوەکانی لەسەر زەوییەک ناکات کە خوێنی تیاڕژابێت یان زوڵم و تاوانی تیا ئەنجام درابێت.

هەروەها پێیان دەوترێت ئەی خەڵکینە وەرن بۆلای خوای خۆتان و ئەوانە ڕابگرن چونکە بەدڵنیاییەوە هەموو ئەوانە بەرپرسیارن (واتە لێپرسینەوەیان لەگەڵ دەکرێت)

پاشان مرۆڤەکان و مەخلوقات بەدەم بانگکارەکەوە دەڕۆن و بەرەو خاکە سپیە نوێیەکە بۆ حسابات و یەکلایی بوونەوەی چارەنوسیان شێوازی ڕۆیشتنیشیان لەکەسێکەوە بۆ کەسێکی تر دەگۆڕێت ، هەیە بە پێ دەڕۆن و هەیە لەسەر دەم و چاوییان دەڕۆن و قاچیان بۆ سەرەوەیە (ئەمە بۆ تاوانبارو بێدینەکانە ) پرسیارکرا لە پێغەمبەری خوا چۆن دەتوانن لەسەر دەم و چاویان بڕۆن پێغەمبەری خواش فەرمووی ئایا ئەوەی وایلێکرد لەسەر قاچەکانی بڕوات ناتوانێ وایلێبکات لەسەر دەم و چاوی بڕوات ؟!

لەو ڕۆژەدا مرۆڤە بە فیزو خۆزلزانەکان هێندە بچوک دەکرێنەوە تا قەبارەیان وەک مێرووە ڕەشە وردەکانی لێدێت و حەشر دەکرێن بەشێوەیەک کە دەکەونە

ژێرپێی خەڵکانەوە بەهۆی بێ نرخیان لای خوای گەورە (ئامان خۆتان لە کیبرو تەکەبور بپارێزن ) وە توشی سەرشۆڕی و ڕسوایی دەبن لەناو ملیارەها مرۆڤ و مەخلوقاتدا

هەموو دروستکراوانی خوا لە مرۆڤ و ئاژەڵەکان و باڵندەکان و زیندەوەرەکان لەسەر خاکە نوێیە سپیەکە کۆدەکرێنەوە چونکە هەموویان پەروەردگار بە ئومەت دروستی کردوون و وە باشترین ئومەتیش لەناو هەموو مرۆڤەکان و مەخلوقاتدا بریتیە لە ئومەتی محمد (ﷺ) .

تێکڕایی ژمارەی ئومەتەکانیش لە قیامەتدا لەناو هەموو مەخلوقاتدا بەشێوەی ٧٠ ئومەت کۆدەکرێنەوە .

لەو ڕۆژەدا کە مرۆڤەکان زەوی دنیا جێدێڵن بۆ زەوییە سپیە نوێیەکە هەر ئومەتەو شوێنی پێغەمبەری خۆی دەکەوێ بەشێوەیەک پێغەمبەری وا هەیە تەنها خۆی و دە کەسن، پێغەمبەری وا هەیە کەسی لەگەڵدا نیە ، پێغەمبەری وا هەیە خۆی دوو کەس یان سێ کەسن ، پێغەمبەر موسا (علیە سلام) خۆی و شوێنکەوتووانی لە بەنی ئیسرائیل تێدەپەڕن، پێغەمبەری خۆشمان (ﷺ) شوێنەکەوتەکانی هێندە زۆرن لەشێوەی زنجیرە چیاکانی شاری مەککەدایە بەلای ڕاست و چەپیدا وە لەگەڵیشیا ٧٠ هەزاری تریان لەگەڵدایە ، هۆکاری زۆری شوێنکەوتەی پێغەمبەر محمد بریتیە لە هەدیەی قورئانی پیرۆز ( دەست بەقورئانەوە بگرن و خۆتان فێری بکەنو لێی تێبگەن ) .

ئومەتی مسوڵمانان لەو ڕۆژەدا ڕوخساریان وەک ڕوناکی مانگ دەدرەوشێتەوە هۆکاری ئەو درەوشانەوەیەش بۆئەوە دەگەڕێتەوە کە ڕۆژانە پێنج جار دەست نوێژیان گرتووە ئەم دەستنوێژگرتنە دەبێتە نورو ڕوناکی بەڕوخساریانەوەو بەوەش لەهەموو ئومەتەکانی تر جیاواز دەبن

هاوار بۆئەوەی تا ئێستا نوێژی نەکردووەو دەستنوێژی نەگرتووە سبەینێ هەرگیز لەو ئومەتە نابێت !

ئومەتەکانی تر کاتێک ئومەتی ئیسلام دەبینن ڕوخساریان وەک خۆرو مانگ دەدرەوشێتەوە لەناو خۆیاندا پرسیار دەکەن و هەست ڕادەگرن تابزانن

ئەوانە ئومەتی کێن پاشان پێیان دەوترێت ئەوانە ئومەتی ئەو پێغەمبەرەیە کە نەخوێنەواربووەو نوسین و خوێندنەوەی نەزانیوە ، ئەوانە هێندە ڕوخساریان نورانی و بریقەدارە وەک هەسارەکانی ئاسمانن

لەو ڕۆژەدا کە خەڵکان ئەمریان پێدەکرێت بۆ جێهێشتنی زەوی بۆ خاکە نوێیە سپییەکە هەندێک لە مرۆڤەکان پارچە زەوی گەورە گەورە بەسەرشان و کۆڵیاندا دەدرێت و لەگەڵ خۆیان دەبێ بیبەن بۆ خاکی مەحشەر وەک سزایەک و پاشان بۆ حساب و کتاب واتە بۆسەر خاکە سپییەکە هۆکاری ئەمەش بۆئەوە دەگەڕێتەوە چونکە چەندین زەوییان بەناحەق داگیرکردبوو لە ژیانی دنیایاندا ، ئەوەی یەک بست زەوی داگیرکردبێت بەناحەق ئەبێ سبەینێ بدرێت بەکۆڵیاو بیبات لەگەڵ خۆی .

هەرکەسێک لەوڕۆژەدا لەپێناوی گەیاندن و پاراستنی دینی خوای گەورەدا بریندار کرابێت خوێنی لێ هاتبێتە دەرەوە ئەوا لەڕۆژی قیامەتدا بەهەمان شێوە خوێنی لێدەچۆڕێت و بۆنیشی وەک بۆنی میسک وایە شێوەی خوێنەکەش وەک زەعفەرانە تەنانەت مۆری شەهیدیشی پێوە دەبێت کاتێک دەڕوات بەرەو خاکی سپی مەحشەر .

لەو ڕۆژەدا سێ چین زۆر بەڕێزەوە بەتایبەت دەبرێن بۆلای خوای گەورە لەشێوەی وەفددا ئەوانیش چینی ( موجاهیدان و حەجکاران و عومرەکارانن ) .

ڕۆیشتنی خەڵکان بەرەو خاکی نوێی مەحشەر بێ جل و بەرگ و پۆشاکن واتە هەموو ڕووتن (بێجگە لە هەندێ باوەرداری زۆر تایبەت کە پۆشتە دەکرێن !)

بەڵام ڕۆژەکە هێندە ترسناک و سەختە هیچ کەسێکی جورئەتی ئەوەی نیە کە سەیری بەرامبەری بکات هەمووی لەتاوی ناڕەحەتی ئەو ڕۆژە وەک سەرخۆش وان و بێ هۆشن و لەهەوڵی ڕزگاربوون و بەشوێن چارەنوسی خۆیانەوەن .

لەو ڕۆژەدا کە خەڵکان کۆدەکرێنەوە هەرگیز بەوجۆرە ڕووت و قوت نەبوون و هەرگیز بەوجۆرە برسی و تینوو نەبوون هەرگیز بەو جۆرە ماندوو نەبوون لە تێکڕایی تەمەنیاندا .

وە لەو ڕۆژەدا یەکەم کەس جل و پۆشاکی بەبەردا دەکرێت بریتیە لە پێغەمبەر ئیبراهیم (علیە سلام) کە دوو پۆشاکی سپین (قبطین) پاشان پێغەمبەر محمد

(ﷺ) پۆشتە دەکرێت و پۆشاکێکی سەوزی بەبەردا دەکرێت لەگێڕانەوەیەکی تردا پۆشاکێکی خەت خەتی بەبەردا دەکرێت ).

زاڵم و ستەمکاران کە عەزێت و ئازاری مسوڵمانانیان دەدا لەدنیادا کاتێک ئەو ڕۆژە بەچاوی خۆیان دەبینن ئەبڵەق دەبن و سەریان شۆڕ دەکەن چونکە دەزانن دەبێ باجی زوڵم و ستەمەکانیان بدەن ( ئاگاتان لە زوڵم بێت ) وە ڕێگەیان پێنادرێت بێنە قسەو ڕێگەشیان پێنادرێت کە پاساو بێننەوە بۆ کردەوە چەپەڵەکانیان و زوڵم و ستەمەکانیان .

وە چەنێ عوزریش بێننەوە لێیان قبوڵ ناکرێت و وەرناگیرێت چونکە هەموو شتێکیان تۆمارەو نیشانیان دەدرێتەوە بەدەنگ و ڕەنگ (وزە لەناوناچێت) خواش ئاگاداری ناو دڵەکانیانە کە بەچ مەبەستێک زوڵم و ستەم و تاوانیان کردووە لە مسوڵمانان .

لەو ڕۆژەداو لەو گۆڕەپانەدا بێ باوەڕو بێدین غەرق دەبێ لە عارەقی خۆیدا هەتا وای لێدێت عارەق تا لغاوی دەمی دێت و زۆر زۆر ناڕەحەت دەبێ و دەڵێ خودایە پشوم بدەو ڕزگارم بکە هەرچەندە بۆ دۆزەخیش بێت.

( هۆکاری زۆری عارەقکردنەوەکەی بەهۆی بێدینیەکەی و زوڵم و ستەمەکەیەوە بووە کە لەخۆی و لە خەڵکانی تری کردبوو لە دنیادا کە خەڵکێکی زۆری وەک خۆی بێدین و گومڕا کردبوو ) .

لەپاش ئەوەی مرۆڤەکان و بونەوەران وەک باسمان کرد دێنە سەر خاکە نوێیەکە زۆر زۆر چاوەڕێ دەکەن بۆ یەکلایی بوونەوەی چارەنوسیان کە نزیکی ٤٠ ساڵ بەپێوە دەبن و چاویان ئەبڵەق بووەو بەئاسماندا دەڕوانن چاوەڕێی یەکلایی بوونەوەی چارەنوسیان دەکەن .

خەڵکان لە مەحشەردا دەوەستێنرێن لە قەرەباڵغیەکی ئێجگار گەورەدا بەجۆرێک زەوی لەو ڕۆژەدا درێژدەکرێتەوە و ڕادەکێشرێت ئەنجا هیچ ئادەمییەک جێگای وای دەست ناکەوێت تەنها جێگەی هەردوو پێی نەبێت ، وە گۆڕەپانی مەحشەر ئەوەندەیە کە چاو ئەمسەرو ئەوسەری دەبینێ وە جاڕچیەکەش دەنگی جاڕەکەی لەمسەر بۆ ئەوسەری دەگات بەجۆرێک دەگاتە گوێی هەموو کەسانی مەحشەر وە

چاو ئەمسەرو ئەوسەری دەبینێت ، وە وەستانی هەموو خەڵکان لەو جێگە تەسک و تەنگەدا زۆر نارەحەتە چونکە بونەوەران هەموو لەوێدا کۆدەکرێنەوە .

پاشان ئەو ڕۆژە لەو خاکە سپیە نوێیەی مەحشەردا بۆ بێباوەڕان تا چاوەڕوانی ٥٠ هەزار ساڵ درێژ دەکرێتەوە تا وای لێدێت پیاو لەناو عارەقی خۆیدا نوقم دەبێت تا دەگاتە هەردوو گوێی ، وە هەر لەبەر ئەوەیە پێغەمبەری خوا هەموو جارێ لە دوعاکانیا پەنای گرتووە بە خوا لە نارەحەتی و قەرەباڵغی و شوێنی وەستانەکەی لەساحەی مەحشەردا .

ئەم شێوازی عارەق کردنەوەیە لەسەر باوەڕداران وەک هەڵامەت وایەو ئاسانە بەڵام بۆ کافرو بێدینان وەک مردن و ڕۆحکێشان توشی دەبێت لەکاتێکا مردنی یەکجارەکی بوونی نیە .

چاوەڕوانیەکەی ڕۆژی مەحشەرو نارەحەتیەکانی لەسەر باوەڕداران و مسوڵمانان وەک نیو ڕۆژی دنیا وایە لە ڕیوایەتێکی تردا وەک سەعاتێک وایە و خوای گەورە نارەحەتی چاوەڕوانی لەسەریان کورت دەکاتەوە (ئاسانی دەکات)

**ڕەئی نوسەر :** لەوانەیە درێژبوونەوەی ئەو ڕۆژە پەیوەندی بەهەست و ئارامگریەوە هەبێت کە پەروەردگار وا لەهەست و سەبرو ئارامی باوەڕداران بکات بە کورتی نارەحەتیەکان ببینن و بەئاسانی بە سەریاندا تێپەڕبێت ، بەڵام بۆ بێ باوەڕان سەختترو درێژخایەنتر بێت ( بەنمونە دوو کەس توشی یەک نەخۆشی دەبن بەڵام یەکیان تەحەمولی کەمترەو لەسەری قورس و نارەحەتە بۆئەوەی تریان بەپێچەوانەوەیە والله اعلم ) .

لە ساحەی مەحشەردا پێغەمبەری خوا (ﷺ) و ئومەتەکەی لەسەر تەپۆڵکە یان گردێک دەبن کە تایبەتە بەوان لەو ساحەیەدا وە پەروەردگار پۆشاکێکی سەوز بەبەری پێغەمبەردا (ﷺ) دەکات لەڕێی فریشتەکانەوە .

دوای هاتنی سەرجەم بونەوەران بۆ ساحەی مەحشەرو دروستبوونی قەرەباڵغیەکی ئێجگار گەورەو زۆر و نارەحەتیەکی زۆرو وەستانی خەڵکان لەشوینی خۆیاندا بۆ ماوەی ٤٠ ساڵ و درێژبوونەوەی ئەو وەستانە لەسەر کافران بۆ ٥٠ هەزار ساڵ وە تێڕوانینیان بۆ ئاسمان و پاشان ئا لەو کاتەدا ڕاوەستاوانی

(خەڵکانی گۆڕەپانی مەحشەر بەخەم و خەفەتێک دەگەن کە لە تواناو وزەیاندا نیەو ئیتر ناتوانن و بەخۆیان دەڵێن بۆ تکاکار نەبین لای پەروەردگاری خۆمان تا ڕزگارمان بکات ، هەندێکیان بەهەندێکی تریان دەڵێن ئەرێ نابینن ئێوە لەچیدان ؟ ئەرێ نابینن ئەو حاڵەی پێی گەیشتوون ؟ ئەوە بۆ تەماشا ناکەن تا یەکێک بدۆزنەوە بچێت تکاتان بۆ بکات لای پەروەردگاری خۆتان ؟ وە بەپەرۆشەوە دەگەڕێن بەدوای یەکێکدا کە تکایان بۆ بکات و لەو ناڕەحەتیانە ڕزگاریان بکات ئینجا خەڵکان هەندێکیان بە هەندێکیان دەڵێن بچن بۆلای پێغەمبەر ئادەم (عليه السلام) .

## خەڵکان لە گۆڕەپانی مەحشەردا
## بەدوای پێغەمبەراندا دەگەڕێن !

خەڵکان سەرەتا پێغەمبەر ئادەم (عليه السلام) دەدۆزنەوەو دەچن بۆلای :

پێی دەڵێن ئەی ئادەم تۆ باوکی ئادەمیزادی خوای گەورە دروستی کردووی بەدەستی خۆی و ڕۆحی بەبەردا کردوویت وە فەرمانی کرد بە فریشتەکان کە سوجدەت بۆ بەرن وە نیشتەجێی بەهەشتی کردیت وەناوی هەموو شتێکی فێرکردیت ئەریَ بۆ تکامان بۆ ناکەیت لای پەروەردگاری خۆت ؟ ئایا نابینیت لە چیداین و گەیشتووین بەچی ؟ تکامان بۆ بکە لای پەروەردگاری خۆت تا بمانحەوێنێتەوە و ڕزگارمان بکات لەم جێگەیەی کە تیایداین ، پاشان پێغەمبەر ئادەم (عليه السلام) دەفەرمووێت: ئەوەی کە پێتان گەیشتووە بەمنیش گەیشتووە پەروەردگارم ئەمڕۆ توڕەبوونێک توڕە بووە لەمەوپێش بەم شێوەیە توڕە نەبووە ، وە لەمەودواش بەوشێوەیە توڕە نابێت ، وە ئەو درەختەی لێی قەدەغەکردبووم و سەرپێچیم کرد دەترسم فڕێم بداتە ناو ئاگر ( پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) دەفەرمووێت بەهۆی ئەوەوە شەرم دەکات کە داوا لەپەروەردگاری خۆی بکات ) پاشان ئادەم (عليه السلام) پێیان دەڵێت بڕۆن بۆلای یەکێکی تر ، بچن بۆلای نوح (عليه السلام) بڕۆن بۆلای باوکی دووەمتان دوای باوکی یەکەمتان ئەو یەکەم نێردراوە کە خوای گەورە ناردوویەتی بۆلای خەڵکانی سەر زەوی ، ئینجا دەچن بۆلای پێغەمبەر نوح (عليه السلام) .

ئیتر بەدوای پێغەمبەر نوحدا (عليه السلام) دەگەڕێن و دەیدۆزنەوە ئینجا پێی دەڵێن ئەی نوح تۆ یەکەم نێردراوی بۆلای خەڵکانی سەرزەوی وە خوای گەورە ناوی لێناویت بەندەی سوپاسگوزار و ( دوعاکەی لێ وەرگرتیت) ئایا نابینیت ئێمە لەچیداین ؟ ئایا نابینیت ئێمە چیمان پێ گەیشتووە ؟ ئایا بۆ تکامان بۆ ناکەی لای پەروەردگارت ، پێغەمبەر نوحیش (عليه السلام) دەڵێت ئەوەی ئێوە دەتانەوێت لای من نیە ، پەروەردگارم ئەمڕۆ توڕەبوونێک توڕەبووە لەمەوپێش بەوشێوەیە

توڕەنەبووە و لەمەودواش بەوشێوەیە توڕەنابێت ، وە من تاکە دوعایەکم بۆ هەبوو دژ بەقەومەکەم کردم (پێغەمبەری خوا دەفەرمێت (ﷺ) : وە یادی داواکردنەکەی لە پەروەردگاری دەکاتەوە سەبارەت بەوەی کە زانستی نەبوو لەبارەیەوە واتە داواکردنەکەی بۆ کوڕەکەی کە بی پارێزێت لە تۆفانەکە وە بەهۆی ئەوەوە شەرم دەکات) و نوح (عليه السلام) دەفەرمویێت : تەنها نەفسی خۆم دەترسم فڕێم بداتە ناو ئاگرەوە ، بڕۆن بۆلای کەسێکی تر جگە لەمن بچن بۆلای خۆشەویستی خوا ( ئیبراهیم ) ( عليه السلام) .

دەچن بۆلای پێغەمبەر ئیبراهیم (عليه السلام) پێی دەڵێن تۆ پێغەمبەری خۆشەویستی خوای لەناو خەڵکانی سەر زەویدا ، تکامان بۆ بکە لای پەروەردگارت ئایا نابینیت ئەوەی ئێمە تیایداین ؟ ئایا نابینیت چ نارەحەتیەکمان پێ گەیشتووە ؟ پێغەمبەر ئیبراهیم (عليه السلام ) پێیان دەڵێت : ئەوەی ئێوە دەتانەوێت لای من نیە پەروەردگارم ئەمڕۆ توڕەبوونێک توڕەبووە لەمەوپێش بەوشێوەیە توڕەنەبووە و لەمەودواش بەوشێوەیە توڕەنابێت ، وە من سێ درۆم کردووە و بۆیان باس دەکات ( پێغەمبەری خوا (ﷺ) باسی ئەو سێ درۆیەی کردووەو دەفەرموێت : ئیبراهیم (عليه السلام) هەرگیز درۆی نەکردووە لە هیچ شتێکا تەنها سێ جار نەبێت : وتەکەی کە وتی : من نەخۆشم وە نەخۆشیش نەبوو ، وە وتەکەی بۆ سارا کە وتی : ئەوە خوشکمە ، وە وتەکەی : بەڵکو بتە گەورەکە وایلێکردوون) پاشان پێغەمبەر ئیبراهیم (عليه السلام) دەفەرموێت دەترسم فڕێم بداتە ناو ئاگرەوە تەنها نەفسی خۆم تەنها نەفسی خۆم بڕۆن بۆلای یەکێکی تر جگە لەمن بڕۆن بۆلای موسا (عليه السلام) ئەو بەندەیە خوای گەورە گفتوگۆی لەگەڵدا کردووە و تەوراتی پێ بەخشیوە

**تێبینی/** ڕوونکردنەوەی سێ درۆکەی پێغەمبەر ئیبراهیم (عليه السلام)

**درۆی یەکەمی :** (کە وتی نەخۆشم) بۆئەوە کردی کە نەچێت لەگەڵ قەومەکەی بەشداری لە جەژنی شیرک و ئاگرپەرستی و بتەکانیان بکات

**درۆی دووەم :** (کە وتی خوشکمە) بۆئەوە کردی کە نەیکوژن ئەگەر بیوتایە خێزانمە دەیانکوشت چونکە فیرعەونەکەی میسر دەیویست سارا داگیر بکات بیبات بۆخۆی ئەگەر بیزانیایە ئیبراهیم (عليه السلام) هاوسەریەتی دەست بەجێ دەیکوشت لەکاتێکا

وتی سارا خوشکمە ( هەرچەندە ئەو وتەیەش درۆنیە چونکە سارا خوشکیەتی لەدیندا)

**درۆی سێیەم :** (وتی ئەو بتە گەورەیە هەموو بتەکانی تری شکاندووە) بۆئەوە کردی تا لۆژیکی خەڵکە بتپەرستەکان بجولێنێ و پێیان بڵێت ئەی قەومەکەم ئەم بەردەی ئێوە داتانتاشیوەو لەبری خوا دەیپەرستن ئەوەتا هیچ توانایەکی نیە هەروەها حیکمەتێکی تریش بۆئەوەبوو کە پێیان بڵێ بەناڕاستەوخۆ وەک چۆن ئەو بتە گەورەیە قبوڵی ناکات شەریکی هەبێت لە بتە بچوکەکان ئیتر چۆن خوای بەدیهێنەری ئاسمانەکان و زەوی قبوڵی ئەکات بەردێکی تاشراو بکەنە شەریکی !

پاشان هەندێک لە خەڵکان دەچن بۆلای پێغەمبەر موسا (عليه السلام) و پێی دەڵێن ئەی موسا تۆ نێردراوی خوایت ڕێزو سەروەری پێ بەخشیت بەهۆی پەیامەکانیەوە وە بەهۆی گفتوگۆکردنەکەی لەگەڵتا تۆی بەرزکردەوە بەسەر ئادەمیزاددا تکامان بۆ بکە لای پەروەردگارت ئایا نابینی ئێمە لەچیداین ؟ ئایا نابینی چیمان پێگەیشتووە ؟ پێغەمبەر موسا (عليه السلام) پێیان دەڵێت ئەوەی ئێوە دەتانەوێ لای من نیە پەروەردگارم ئەمڕۆ توڕەبوونێک توڕەبووە لەمەوپێش بەوشێوەیە توڕەنەبووە و لەمەودواش بەوشێوەیە توڕەنابێت ، وە من نەفسێکم کوشت کە فەرمانم بەکوشتنی پێ نەکرابوو ، تەنها نەفسی خۆم تەنها نەفسی خۆم دەترسم فڕێم بداتە ناو ئاگرەوە ، بڕۆن بۆلای یەکێکی تر جگە لەمن بڕۆن بۆلای عیسا (عليه السلام)

**تێبینی** / پێغەمبەر موسا (عليه السلام) تەنها پاڵی بەجوندیەکی فیرعەونەوە نا کە دووری بخاتەوە ئیتر بەو پاڵنانە کەوت و مرد ( دروست نیە بۆ هیچ پێغەمبەرێک نەفسێک بکوژێت ئیلا بە ئەمرو وەحی پەروەردگار نەبێت ) بۆیە موسا (عليه السلام) پاڵنانەکەی بەئەنقەست نەبوو و داوای لێبوردنی لە پەروەردگاری کرد خوای گەورەش لێی بوری وە خوای گەورە خۆی زانایەو زانی بەوەی کە موسا نیەتی تەنها پاڵنان بووەو کوشتن نەبووە

وە پێغەمبەر موسا ( عليه السلام) لە قیامەتا لەترسی ئەم تاوانە دەڵێ تەنها خۆم تەنها خۆم دەترسم فڕێم بداتە ناو ئاگرەوە بچن بۆلای یەکێکی تر جگە لەمن بچن بۆلای عیسا ( عليه السلام) .

کاتێک خەڵکان دەڕۆن بۆلای پێغەمبەر عیسا (عليه السلام) و پێی دەڵێن : ئەی عیسا تۆ نێردراو و (وشەی) خوایت وە لەسەر بێشکە قسەت لەگەڵ خەڵکاندا کردووە ئەویش دەڵێت : پەروەردگارم ئەمڕۆ توڕەبوونێک توڕەبووە لەمەوپێش بەوشێوەیە توڕەنەبووە و لەمەودواش بەوشێوەیە توڕەنابێت وە دەترسم فرێم بداتە ناو ئاگرەوە تەنها نەفسی خۆم تەنها نەفسی خۆم ، بڕۆن بۆلای کەسێکی تر جگە لەمن بچن بۆلای محمد (صلى الله عليه وسلم) ( ئەو بەندەیە کە خوای گەورە لەهەموو گوناحەکانی پێش و پاشی خۆش بووە ) .

**تێبینی** / لە فەرموودەیەکا پێغەمبەر عیسا (عليه السلام) دەفەرموێ من و دایکم لەبری خوا پەرستراین و کراینە شەریکی پەروەردگار ئیتر لەترسی ئەو پەرستنەی خەڵکان بۆیان شەرم دەکات و دەترسێت بچێتە بەردەم پەروەردگار تکا بکات ( چونکە هەر لە کۆنەوە تا ئەمڕۆ زۆرینەی خەڵکانی وڵاتانی جیهان پێغەمبەر عیسا علیه سلامیان کردووەتە کوڕی خواو شەریکی خواو وەک خوا دەیپەرستن ) .

پێغەمبەری خوا علیه (صلى الله عليه وسلم) دەفەرمێ دێن بۆلای من و دەڵێن: ئەی موحەمەد تۆ نێردراوی خوایت و کۆتاهەمینی پێغەمبەرانیت ، خوای گەورە لەهەموو گوناهەکانی سەرەتاو کۆتایت خۆش بووەو ( لەم ڕۆژەشدا تۆ بێ ترس هاتوویت) تکامان بۆ بکە لای پەروەردگارت ئایا نابینیت ئێمە لەچیداین ؟ ئایا نابینیت چ ناڕەحەتیەکمان پێگەیشتووە ؟

لە ڕیوایەتێکی تردا : [من وەستاوم و چاوەڕێی ئومەتەکەم دەکەم و عیسا (عليه السلام) دێت بۆلام پێم دەڵێت : موحەمەد ئەوا هەموو پێغەمبەران دێن بۆلات و لەگەڵتدا کۆدەبینەوە تا بچیت داوا بکەیت لە خوای گەورە تا هەموو ئومەتەکان لەیەک جیابکاتەوە بۆ ئەو جێگەیەی کە خۆی ویستی لێیەتی : ئەوەش لەبەر گەورەیی و ناڕەحەتی ئەو ڕۆژەیە کە تیایداین ، پێغەمبەریش (صلى الله عليه وسلم) دەفەرموێت : منیش دەڵێم عیسا چاوەڕێ بکە تا دەگەڕێمەوە بۆلات وە دەڕۆم تا لەژێر عەرشدا دەوەستم و ڕێزو پلەی یەکەمم پێ دەدرێت کە نەدراوە بەهیچ فریشتەیەکی هەڵبژێردراو وە بەهیچ پێغەمبەرێکی نێردراو ] منیش دەچم هەتا دەڕۆمە ژێر عەرش و ئیزن وەردەگرم لە پەروەردگار و ڕێگەم پێ دەدات وە من کە دەیبینم دەچم بە سوجدەدا بۆ پەروەردگارم ئینجا دەرووم لێ دەکاتەوە و دەوەستم

لەبەردەمیدا سوپاسی دەکەم بەچەند سوپاس و ستایش کە بەهیچ کەسێک نەدراوە پێش من ( ئێستا توانام نیە بەسەریدا و نایزانم ) ئینجا دەوترێت : ئەی محمد سەرت بەرزبکەرەوە داوا بکە تا پێت ببەخشرێت تکا بکە تا لێت وەربگیرێت ، ئینجا سەرم بەرزدەکەمەوە ئینجا ڕێگەم پێ دەدرێت کە تکا بکەم و دەڵێم ئەی پەروەردگارم بەندەکانت بەندایەتی تۆیان کردووە لەهەموو جێگەیەکی سەر زەویدا ، پاشان پێغەمبەری خوا سەربەرزدەکاتەوەو ئومەتەکەی خۆی دەبینێت بە شوێنەواری دەستنوێژەکانیانا دەیانناسێتەوە کە سپیەو دەدرەوشێنەوە،، پاش وەڵامی داواو تکاکەی پێغەمبەر لە پەروەردگار ئینجا هەموو خەڵکانی مەحشەر هەموو بەیەکجار سوپاسی دەکەن و ئەم سوپاسکردنەش پێی دەڵێن ( مقام محمود ).

**تێبینی** / ئەوەیە جێگەی سوپاسکراو(مقام المحمود) کە لە قورئاندا باسکراوە لە سورەتی الاسراء ئایەتی ٧٩ .

ئیتر پاش ئەم تکاکردنەی پێغەمبەر محمد (ﷺ) و قبوڵبوونی داواکەی لەلایەن پەروەردگارەوە بۆ یەکلاییکردنەوەی چارەنوسی خەڵکانی گۆڕەپانی مەحشەر هەموو خەڵکان بەجارێک لەو ساحەی مەحشەرەدا سوپاسی دەکەن ئەم سوپاسکردنەش بە ( مقام المحمود) ناسراوە .

**تێبینی** / پێغەمبەران (علیهم سلام) هەر بە زیندووبوونەوەیان و هەستانەوەیان لە گۆڕەکانیان فریشتەکان دێن بۆلایان و پۆشتەیان دەکەن و پۆشاکی بەهەشتیان پێ دەبەخشن .

وە ئیمانداران و شەهیدانی ڕێگەی بەرنامەی پەروەردگاریش بەهەمان شێوە پۆشتەدەکرێن وە ئەوانەی کە هەموو قورئانیان لەبەرەو ... هتد چەند چینێکی تریش دواتر باسیان لیوە دەکەین کە هەر بەهەستانەوەیان لەگۆڕەکانیان و زیندوو بوونەوەیان فریشتەکان دێن بۆلایان و پۆشتەیان دەکەن و ئاوی سازگاریان بۆ دەهێنن وە تاجیان بۆ دێنن .

پۆلێنکردن و ریزکردن و رێکخستنی سەرجەم دروستکراوەکان لە گۆرەپانەکەدا و ئامادەکاریەکان بۆ دابەزینی مەلائیکەتەکانی ئاسمان و پاشان دابەزینی الله جل جلاله :

دوای قبوڵبوونی داوا دوعاکەی پێغەمبەر محمد (ﷺ) لە خوا جل جلاله :

لەو ڕۆژەدا ( لەیەکەمین دروستکراوەوە تا کۆتاهەمین دروستکراو بۆ کات و ڕۆژێکی دیاریکراو (کە قیامەتە) کۆدەکرێنەوە کە ٤٠ ساڵ بەپێوە بوون و چاوییان ئەبڵەق بووە و دەڕوانن بەرەو ئاسمان چاوەڕێی یەکلایی بوونەوەی چارەنوسیان کردووە ) .

هەموو مرۆڤەکان و پەرییەکان لەیەک جێگەدا کۆدەکرێنەوە و هیچ لایەکیان تێکەڵ بەوەی تریان نابن و وە هەموو بێدەنگ دەبن لەو ڕۆژەدا بەشێوەیەک کە هیچیان باسی یەکتر ناکەن واتە قسە لەگەڵ یەکتر ناکەن ، پاشان هەموو بە ١٠ پۆل و بەش ڕیز دەکرێن کە جنەکان (پەریەکان) هەموویان ٩ بەشن و مرۆڤەکانیش تێکڕا یەک بەشن .

دوای ئەم ڕێکخستن و ڕیزکردنەی مرۆڤەکان و جنەکان ، پاشان ئاسمانی دنیا لەت دەبێت و دەکرێتەوە و فریشتەکان پۆل پۆل دادەبەزن و هەموو پۆلێک سەرکردەی خۆی هەیە و خەڵکان و نیشتەجێیانی دونیا بانگیان لێ دەکەن و پێیان دەڵێن : ئایا خودای شکۆدارمان لەنێوتاندایە ؟ ئەوانیش دەڵێن نەخێر لەنێوماندا نیە و بەم نزیکانە دێت .

بەهاتنی ئەو پۆلە فریشتەیەی یەکەم ژمارەی فریشتەکان هێندە زۆرە هەموو (مرۆڤەکان و جنەکان کە ١٠ بەش بوون) هەموو دەبنە یەک بەش لەچاو پۆلی یەکەمی فریشتەکان کە ٩ بەشن .

پاشان ئاسمانی دووەم لەت دەبێت و فریشتەکانی ئاسمانی دووەم پۆل پۆل بەڕیز دادەبەزن و هەموو ڕیزێک سەرکردەی خۆی هەیە و نیشتەجێیانی زەوی پێیان دەڵێن ئایا خودای شکۆدارمان لەنێوتاندایە ! ئەوانیش دەڵێن نەخێر لەنێوماندانیە و بەم نزیکانە دێت .

لەوێشدا نیشتەجێیانی دونیا دەبنە ١٠ بەش کە یەک بەشیان (فریشتەکانی ئاسمانی یەکەم و مرۆڤەکان و جنەکانە ) و ٩ بەشیشیان بریتین لە فریشتەکانی ئاسمانی دووەم

پاشان ئاسمانی سێیەم لەت دەبێت و فریشتەکانی ئاسمانی سێیەمیش پۆل پۆل دادەبەزن و هەموو پۆلێک سەرکردەی خۆی هەیە نیشتەجێیانی سەر زەوی پێیان دەڵێن ئایا خودای شکۆدارتان لەنێودایە ! ئەوانیش دەڵێن نەخێر لەنێوماندانیە و بەم نزیکانە دێت ، لەوێشدا نیشتەجێیانی ئاسمانی سێیەم و دووەم و یەکەم و پەریەکان مرۆڤەکان هەموو١٠ بەش دەبن ، بەجۆرێک نیشتەجێیانی ئاسمانی سێیەم ٩ بەش دەبن و نیشتەجێیانی (ئاسمانی یەکەم و دووەم و پەریەکان و مرۆڤەکان ) تەنها یەک بەش دەبن .

پاشان هەموو نیشتەجێیانی ئاسمانەکانی تر ژمارەیان بەوجۆرە دەبێت هەتا ئاسمانی حەوتەم .

**تێبینی/** لەتبوونی ئاسمانەکان پێشتر لەکاتی فوکردنی یەکەمی کەڕەنادا ڕوویدابوو بەڵام لێرەدا من ویستم فەرموودەکە وەک خۆی دابنێمەوە بەبێ دەستکاری ئەوەی گرنگە لێی تێبگەین ئەم ڕووداوانە بەیەکەوەو یەک لەدوای یەک ڕوودەدات واتە ڕووداوەکان بەپێی ئەو سونەتە کەونیە ڕوودەدات کە پەروەردگار بڕیاری لێداوە.

پاشان خودای گەورە لەسێبەرەکانی هەوردا دێت و فریشتەکان پۆل پۆل ڕیزبوون و بێدەنگن ) لە شکۆ و مەقامی الله تعالی .

لەکاتی هاتنە خوارەوەی خوای گەورە بەخۆنیشاندانی خۆی هەموو زەوی مەحشەر ڕووناک دەبێتەوەو سەرجەم خەڵکان و هەموو بوونەوەران لەهۆشی خۆیان دەچن و دەبورێنەوە ( چاوەکان و هەستەکان بەرگەی نوری پەروەردگار ناگرن) وە یەکەم کەسیش کە بەئاگا دێتەوە پێغەمبەری خوایە (ﷺ) کە خۆی دەفەرمێ سەرم بەرزدەکەمەوە دەبینم موسا (عليه السلام) دەستی گرتووە بە پێچکەیەکی عەرشەوە نازانم پێش من بەئاگا هاتۆتەوە یاخود خوا ئەوی توش نەهێناوە و (خستوویەتیە بری ڕۆژی بورانەوەکەی لە کێوی طوردا ) .

**تێبینی/** بینینی زاتی الله بەچاوەکانی سەر تەنها لەناو بەهەشتدا دەبێت چونکە لاشەی مرۆڤەکان لەپێش دەرگای بەهەشت و لەسەر حەوزی ئاوەکان دیسان

گۆڕانیان بەسەردا دێتەوە بەجۆرێک بەهێزو پتەو دەکرێن کە ئامادەی ناو خۆشیەکانی بەهەشت بکرێن و ئەو لاشانە بەجۆرێکیان لیَ دەکریَ کە هەرگیز توشی نەخۆشی نەبن و بۆنی ناخۆش و سەرماو گەرماو ئازار و بەڵغەم و میزو پیساییان نەمێنیَ وە زۆری گۆڕانکاری تریش ....هتد

مرۆڤەکان تەنها بەو لاشە نمونەییەوە دەتوانن بەچاوی سەر لەناو بەهەشتدا پەروەردگاریان ببینن لەسەر شێوەی زاتی ئەسڵی جلالی خۆی .

وە هەرچەنە لاشەکان لە گۆڕەپانی مەحشەردا کاتێک زیندوو کراونەتەوەو ڕۆحیان بۆ گەڕێندراوەتەوەو تەمەنیان ٣٣ ساڵە بەڵام بەرگەی بینینی نوری زاتی الله جل جلاله ناگرن هەر لەبەرئەوە پەروەرێن لەپشت پەردەوە یاخود لە وێنەیەکی تردا کە وێنەی ڕاستی زاتی ئەسڵی جەلالی خۆی نیە گفتوگۆ لەگەڵ زیندەوەرانی مەحشەرد دەکات والله اعلم .

وە هەر لە دنیاشدا بەنی ئیسرائیل داوایان لە پێغەمبەر موسا کرد (عليه السلام) کە خوا ببینن تا باوەڕی پیَ بێنن بۆیە خوای گەورەش مەوعیدی بۆ دانان لە کێوی طور پاشان لەویَ خوای گەورە خۆی نیشانی کێوەکە دا کێوەکە ڕەش بوو و بەرگەی نەگرت ، پاشان خۆی نیشانی موساو (ئەو ١٠ کەسەی لەگەڵی بوون ) دا ئەوانیش هەموو بیَ هۆش بوون یاخود مردن دواتر خوای گەورە زیندووی کردنەوە هەر لەبەرئەوەیە کە پەروەردگار لە ساحەی مەحشەردا لەپشت پەردە قسەو گفتوگۆ لەگەڵ مرۆڤەکان دەکات نەک بەبینینی چاوەکان .

وە دوای بەهۆش هاتنەوەی خەڵکان لە گۆرەپانی مەحشەردا خوای گەورە فەرمان دەکات کە دۆزەخ بهێنرێت و نزیک بکرێتەوە لە خەڵکان بۆئەو کەسانەی کە دەتوانن ببینن لەو ڕۆژەداو کوێر نین ، وە ئەو بینینی دۆزەخە بۆ بیَ باوەڕان زۆر زۆر سەخت دەبیَ ، دۆزەخیش هێندە گەورەیە هێنانی بە ٤ ملیارو ٩٠٠ ملیۆن مەلائیکە دەبێت و دەهێنرێت و ڕادەکێشرێت کە ٧٠ هەزار جڵەوی هەیە هەر جڵەوێکی ٧٠ هەزار مەلائیکە ڕای دەکێشن .

هەر بەگەیشتنی دۆزەخ و بینینی خەڵکان ناڵەو گرمەیەکی ئێجگار گەورەی لێدێت بەجۆرێکە هیچ مەلائیکەتێکی نزیک و هیچ پێغەمبەرێکی نێردراو نیە کە

لەترسا بەسەر ئەژنۆ نەکەویت هەتا پێغەمبەر ئیبراهیمی خەلیل (عليه السلام) دەفەرمویت خوایە تەنها نەفسی خۆم خوایە تەنها نەفسی خۆم ، هەر لەدوورەوە دۆزەخ بریسکەو ئاگری وەک کۆشک (ئاگرەکەی هێندەی باڵەخانەی گەورە) هەڵدەدات بەئاسماندا، لەو ڕۆژەدا دۆزەخ هێندە گەرمە لەو ساحەیەی مەحشەردا بەجۆرێک کافر وادەزانێت کەوتۆتە ناوییەوە نازانێت کە هێشتا ٤٠ساڵ لێی دوورە.

ستەمکاران و زاڵمان هەر بەبینینی تەنها ئاگرەکەی جەهەنەم (نەک ناو خودی جەهەنەم ) پەشیمان دەبنەوە لە کردەوەکانیان و هیوا دەکەن بیان گەڕێننەوە بۆ دونیا بەڵام هەرگیز ئەو ئاواتەیان نایەتەدی ، زۆر زەلیل و ڕیسوا دەبن و ناوێرن تەماشای دۆزەخ بکەن تەنها بەتیلەی چاو نەبێت واتە سەریان دادەخەن و لەژێر چاوەوە تەنها چاوییان دەجوڵێنن بەولادا بۆ تەماشاکردنی دۆزەخ .

**تێبینی** / جەهەنەم تەنها ئاگر نیە بەڵکو بەندینخانەو شوێنی تەعزیب دانە واتە ژووری سزادانی جۆراوجۆری تیایە ( لەباسەکانی داهاتووا باسی بەندینخانەکان دەکەم ) .

یەکەم کەس کە بانگ دەکرێت ئادەمە (عليه السلام) و هەموو نەوەکانی خۆی لەپێش چاوەوە دەبینێت وە ئەوانیش ئەو دەبینن و بە خەڵکان دەوترێت ئەوە ئادەمی باوکتانە ئادەمیش دەڵێت ( لبیك وسعدیك ) ( والخیر بیدیك ) ، پەروەردگار دەفەرمویت کۆمەڵی دۆزەخ لە نەوەکەت دەربکە ، ئادەم دەفەرمویت چەندێ دەربکەم ؟ ( مەبەست لەوەیە کە بزانێ کامانەن ) بۆیە لە فەرموودەیەکی تردا ئادەم دەپرسێ کۆمەڵی دۆزەخ کامانەن ؟ ).

**تێبینی** / خەڵکان بەبێ ئەوەی خۆیان بزانن لەو ساحەیەدا پێش دەستپێکردنی حساب و کتاب پۆل پۆل ڕیزکراون لەگەڵ خواوەندەکانیان و بتەکانیان کەلە دنیادا پەرستبوونیان و شوێنیان کەوتبوون و هەروەها ئەوانەش کە بەرنامەکانیان لە بەرنامەی خوا بەباشتر دەزانی و بەرنامەی الله تعالی یان وەلانابوو بۆ بەرنامەو ڕێبازە گومڕاو پڕ لە کوفرو فەسادەتەکانی خۆیان بۆیە بەپێی چوونە بەهەشت و جەهەنەمیان پۆل پۆل ڕیزکراون و جیاکراونەتەوە و وە هەر لەوێدا هەموو پۆلەکانیان پیشانی ئادەم (عليه السلام) دەدرێت و پێشی دەوترێت کە چەنێکیان دۆزەخین و چەنێکیشیان بەهەشتین.

پاشان خوای گەورە بە ئادەم (عليه السلام) دەفەرمووێت لەهەموو هەزارێك ٩٩٩ كەس :

ئومەتی محمد لەو ڕۆژەدا ژمارەیان لەچاو مەخلوقاتی مەحشەردا بە هەموو مرۆڤەکان و جنەکان و یەئجوج و مەئجوجەوە وەک مویەکی سپی وایە بەمانگایەکی ڕەشەوە واتە هێندە کەمە ، بەلۆژیکیش ژمارەی مسوڵمانی ڕاست و دروست لەچاو هەموو مرۆڤی غەیرە مسوڵمان و یەئجوج و مەئجوج و جنەکان زۆر زۆر کەمە

لێرەدا پرسیارێک دێتە پێشەوە ، بۆچی دەبێ ئەو هەموو زیندەوەرە بکرێنە جەهەنەمەوە ؟ ئایا خوای گەورە زوڵم دەکات ؟

**وەڵام** / پەروەردگار بەهیچ شێوەیەک هێندەی گەردێک زوڵم ناکات و هەمووی بەحەقی خۆی دەکرێتە ناو جەهەنەمەوە چونکە بەنمونە ئێستا لەم سەردەمەی تیایداین کێ خوا بەتاک و تەنها دەپەرستێ و بەوشێوەیە کە خۆی لە قورئان و سونەتەدا فەرمانی پێکردووە ؟ ئایا ئەزانی چەند ملیار کەس حاڵی حازر خوا بەتەنها ناپەرستن !

لەواقعی ئەمڕۆماندا ملیۆنەها خەڵک لەیابان مشکیان کردۆتە شکۆو پێگەی الله تعالی و دەیپەرستن یاخود بێدینن.

بەملیۆنەها مرۆڤ لە هیندستان بت و چەندین بەردی داتاشراو و فیل و گایان کردۆتە پێگەو شکۆی پەروەردگارێک دەیپەرستن لەکاتێکا الله جل جلالە (بەدیهێنەری هەموو ئەم ئاسمانانەو جیهانەیە) و نایپەرستن .

بەملیارەها مرۆڤ لەو وڵاتانە مرۆڤێکی گۆشت و خوێنی وەک عیسایان (علیە سلام) کردۆتە خواو دەیپەرستن کە عیسا بەریە لەوان .

بەملیۆنەها مرۆڤ بتێکی وەک بوزایان کردۆتە خواو لەبری خوا دەیپەرستن !

بەملیۆنەها مرۆڤ جن و شەیتانەکان دەپەرستن وەک ڕێکخراوی نورانیەکان و ماسۆنیەکان و ساتانەکان و ...هتد .

ڕێژەیەکی زۆر کەمیش (مولحیدن) چاوییان کوێربووەو ئەو هەموو نیزامە گەورەو ڕێک و پێک و ئاڵۆزانەی دنیاو ئاسمانەکان و دروستکراوەکان نابینن

و دەڵێن خوا بوونی نیەو بەرێکەوت ئەمانە دروسبوون وە لەکاتێکدا تەنانەت لە لەشی خۆشیاندا کە پەروەردگار ئەو هەموو سیستەمە گەورەیەی بەدیهێناوە هێشتا دەڵێن بەدیهێنەرێک بوونی نیە.

وە زۆر زۆری تریش ، ئێستا من لە ئێوە دەپرسم ئایا خوای گەورە مافی خۆی نیە هەموو ئەمانە بەبێ لێپرسینەوەو حساب و کتاب بکاتە جەهەنەمەوە ؟

تۆی مرۆڤ ئەگەر مشکێک بێنن و پێت بڵێن ئەمە ڕێزو قەدرو شکۆی لە تۆ زیاترە چی دەکەیت ؟ ئێدە بزانە کە ملیۆنەها یابانی مشکێکیان خستۆتە پێگەو شکۆی الله تعالی و لەبری ئەو دەیپەرستن .

ئیتر کاتێک پەروەردگار بەئادەم دەفەرمووێت لەهەموو ١٠٠٠ کەسێک ٩٩٩ ی بۆ ئاگرە لەوکاتەدا منداڵی ساوا سەری سپی دەبێت و دووگیان گیانەکەی دادەنێت و خەڵکان هەموو سەرخۆش دەبن بەڵام بەهۆی سەختی سزای خواوە سەرخۆش دەبن .

وە لەو ڕۆژەدا دوو جۆر دروستکراوی تریش لەگەڵ مرۆڤەکان پۆل پۆل ڕیزکراون و جیاکراونەتەوە بۆ دۆزەخ بەهۆی کافربوونیان بە الله تعالی ئەوانیش یەئجوج و مەئجوجن و هەوەها ئەوانەش کە تیاچوون لە بێ باوەڕانی (جنۆکە و مرۆڤەکان) ، ئەم دوو جۆرە دروستکراوە لەگەڵ هەر شتێکا ڕیزبکرێن ژمارەیان زۆر زۆر دەکەن بەجۆرێک ئەگەر زەوی مەحشەر ٧ بەش بێت ئەوا یەئجوج و مەئجوج شەش بەشیان دەبێت و سەرجەم دروستکراوانی تر لە ئینس و جن و هتد یەک بەشەکەی تری دەبن .

بۆیە ئەگەر لە ١٠٠٠ کەس ٩٩٩ ی بچنە جەهەنەمەوە ئەوا تەنها یەک کەس لە ئێوە (بەگوێرەی فەرموودەکە) دەچێتە جەهەنەمەوە واتە تا کەسێک (لەمسوڵمانان) دەکرێتە جەهەنەمەوە ٩٩٩ ی (( یەئجوج و مەئجوج و (بێ باوەرانی جنۆکەو مرۆڤ) دەکرێنە جەهەنەمەوە یەئجوج و مەئجوجیش بەهۆی کافربوونیان بە خوای گەورە فرێدەدرێنە جەهەنەمەوە .

**تێبینی** / ژمارەی زۆری یەئجوج و مەئجوج لەساحەی مەحشەردا بەجۆرێکە کە ئەگەر دروستکراوانی مەحشەر ٧ بەش بن و یەئجوج و مەئجوج ٦ بەشیان دەبن

ئەمەش دەرخەری ئەو حەقیقەتەیە کە زەوی دنیا زۆر گەورەو فراوان و تەختەو خۆرو مانگیش بچوکن و بەسەر ئەم زەوییە جێگیرو تەختە گەورەیەدا دەسوڕێنەوە ( تەخت بەمانای ئەوە نایەت کە وەک سینی بێت ) هەروەها زەوی لەناو بۆشایی ئاسماندا نیە بەڵکو ئاسمان وەک بیناو سەقفێک بەسەر ئەم زەوییە گەورەو فراوانەدا بیناکراوە وەک چۆن ئاسمان فراوانەو کۆتاییەکەی نازانین لەکوێیە بەهەمان شێوەش زەوی هێندەی ئاسمان فراوانەو کۆتاییەکەی کەس ناتوانێ بزانێ لەکوێیە !

ئێمەی مرۆڤ و گیانەوەران و ڕووەکەکان لەناو خانەیەکی بچوکی ئەم زەوییە گەورەو فراوانەدا دەژین کە بریتین لە ٧ قارەکەو دەریاو زەریاکان و دەوروبەری ئەم خانەیەش کە ئێمەی تێداین بەشاخەکان و دیوارە بەستەڵەکیەکانی ئەنتارکتیکا دەورەدراوەو لەپشتی ئەو شاخە سەهۆڵینانەوە چەندین قارەو دەریاو زەریای تر هەن والله اعلم (لەوانەیە) یەئجوج و مەئجوج بەو ژمارە زۆرەیان لەدەرەوەی خانەکەی ئێمە بژین و (والله اعلم) دواڕۆژیش لە سەردەمی پێغەمبەر عیسا (علیه سلام) دەتوانن ( ئەو سەدە ) کون بکەن و بێنە ناو خانەکەی ئێمەوە ... هتد .

بۆ زانیاری زیاتر سەردانی گروپی زەوی تەخت بکەن تا زۆر بە زانستیانەو هەروەها لە ڕووی دینیشیەوە شارەزای زەوی گەورەی تەخت و جێگیرو بینای ئاسمان بن .

لەو ڕۆژەدا پەروەردگار هێندە دادپەروەرە پێش دەستکردن بە حەق و حسابی مرۆڤەکان یەکەم جار فەرمان دەکات کە زوڵمی نێوان ئاژەڵ و دڕندەکان و باڵندەکانیش بکرێت و بەجۆرێک حەقی بزنی بێ شاخ وەردەگرێتەوە لە بزنی شاخدار ( ئەگەر دوو قۆچی لێدابێت ئەوا شاخ بۆ بێ شاخەکە دروست دەکرێت لەوێدا دوو قۆچەکەی لێ دەداتەوە ) تا ئەوکاتەی حەقی هیچیان بەسەر ئەوی تریانەوە نامێنێ .

پاش ئەم حەق و حساباتەی نێوان ئاژەڵەکان و باڵندەکان پەروەردگار فەرمان دەکات کە هەموویان ببنەوە بە خۆڵ .

لەو کاتەدا کە کافران و بێ باوەڕان بەچاوی خۆیان دەبینن ئاژەڵ و باڵندەکان دەبنەوە بەخۆڵ ئا لەوێدا ئاوات دەخوازن کە ئەوانیش ببونایەتەوە بە خۆڵ .

**تێبینی** / ئەم حساباتەی نێو گیانەوەران تەنها بۆئەوەیە کە خەڵکان ببینن چۆن خوا حەقی کەس بەسەر کەسەوە ناهێڵێ تەنانەت لەنێو ئاژەڵانیشدا .

هێشتا حەق و حساب و ڕووداوەکانی تایبەت مرۆڤەکان دەستی پێ نەکردووە.

## دەرچوونی یەکەم بڕیار لە ساحەی مەحشەردا

پاشان یەکەم بڕیارێک کە دەدرێ لە ساحەی مەحشەردا ئەوەیە کە بەبێ حساب و کتاب و بێ لێ پرسینەوە و بەبێ تەرازوو زۆرینەی ئەهلی مەحشەر یەکسەر ڕەوانەی دۆزەخ بکرێن بەم شێوەیە :

بانگکارێک بانگ دەکات بەفەرمانی پەروەردگار دەڵێت ئەی خەڵکینە ئایا ئێوە ڕازی نابن بە فەرمانی پەروەردگارتان کە دروستی کردوون و فەرمانی پێکردبوون کە بیپەرستن و بەهیچ جۆرێک شەریکی بۆ بڕیار نەدەن ؟

ئەوانیش دەڵێن بەڵێ

جارچیەکەش دەڵێ پەروەردگار فەرمانی کردووە کە هەموو یەکێک بەدوای شوێن کەوتووان و ئەوانەی پەرستوویانن لە ئاین لەدنیادا ، با ئەمڕۆ شوێنیان بکەون، ئایا ئەم بڕیارە دادپەروەری نیە لەلایەن پەروەردگارەوە بۆ ئێوە ؟ ئەوانیش دەڵێن بەڵێ .

خوای گەورە دەفەرمووێت با هەموو قەوم و ئومەتێک شوێن ئەوانە بکەون کە لە دونیادا پەرستویانن ( بەو جۆرە هەموو ئومەتێک بەناوی بت وپەرستراوەکانیان بانگیان لێ دەکرێت ) :

١/ ئومەتی بتپەرستان و خۆرپەرستان و مانگ پەرستان و ئاگرپەرستان و تاغوت پەرستەکان شوێن پەرستراوەکانیان دەکەون و دەکرێنە ناو دۆزەخەوە .

٢/ خاچ پەرستەکان کە پێغەمبەر عیسایان (عليه السلام) پەرستووە شوێن شەیتانەکەی عیسا دەکەون و دەکرێنە ناو دۆزەخەوە ، ئەوانەی پێغەمبەر عوزەیریان (عليه السلام) پەرستووە وەک جولەکەکان شوێن شەیتانەکەی عوزەیر دەکەون و دەکرێنە ناو دۆزەخەوە .

بە جولەکەکان دەوترێت کێتان پەرستووە ئەوانیش دەڵێن عوزێری کوڕی خوامان پەرستووە پێیان دەوترێت درۆتان کرد خوای گەورە نە ژنی هەیەو نە منداڵ ، چیتان

دەوێت ؟ ئەوانیش دەڵێن تینومانە پەروەردگار تێر ئاومان بکە ، لەوێدا دۆزەخیان نیشان دەدرێت وەک دەریایەکی شەپۆلدار و پێیان دەوترێت ئایا ناچن ئاو بخۆن ؟ بڕۆن ئاو بخۆنەوە ئینجا کۆدەکرێنەوە و فڕێ دەدرێنە ناو ئاگر کە وەک سەڕاب وایە لەدوورەوە وێنەی دەریایەکیان دێتە بەرچاو کە شەپۆلەکانی بەسەر یەکدا دەکەوێت پاشان هەموو بەدوای یەکدا دەکەون و فڕێ دەدرێنە ناو ئاگرەوە

بەگاورەکان دەوترێت کێتان دەپەرست ؟ ئەوانیش دەڵێن مەسیحی کوڕی خوامان پەرستووە ( بەهەمان شێوە پێیان دەوترێت درۆتان کرد خوا نە ژنی هەیەو نە مناڵ ... بەهەمان شێوەی جولەکەکان ئەوانیش دەخرێنە ناو دۆزەخەوە )

٣/ئەوانەی شەیتانەکانیان پەرستووە وەک ماسۆنیەکان و نورانیەکان و ساتانەکان شوێن شەیتان و ئیبلیس دەکەون و دەکرێنە ناو دۆزەخەوە

**تێبینی** / ( هەموو مرۆڤێک شەیتانێکی لەگەڵایە بەردەوام شەپۆل ئاڕاستەی مێشکی دەکات بۆ ئەنجامدانی کوفرو تاوان بەڵام تەقواو تەوەکول و دڵسۆزی و بەهێزی ئیمانی ناو دڵ و عیلمەکەی ، شەیتانەکە لاواز دەکەن کە نەتوانێ کوفرو تاوانی پێ ئەنجام بدات )

**تـــاغــوت** : بەکەسێک دەوترێت کە خەڵکان بیپەرستن و سوجدەی بۆ بەرن لەبری خوا ، ئەو کەسەش زیندوو بێت لەدنیادا وە پێشی بزانێت کە لەبری خوا دەیپەرستن و پێشی ڕازی بێت بەڵام ئەم بێدەنگ بێت لەم کارە ئیتر ئەگەر پێی خۆش بێت یان پێی ناخۆش بێت ، وە بەرنامەو بیرکردنەوەو دەستورەکەی خۆی لە پەیامەکەی خوای گەورە بەچاکترو باشتر بزانێت و بیسەپێنێ بەسەر خەڵکان و زیندەوەراندا کە خوا خۆی دروستی کردوون بە خودی کەسە تاغوتەکەشەوە

٤/ئەوانەی دوژمنێکی خوایان خۆشویستووە و شەڕی دینەکەی خواو پێغەمبەرانیان (علیهم سلام) کردووە یان بەهەر هۆکارێک یارمەتیدەری کوفرو بێدینی بوون سبەینێ لەگەڵ ئەو دوژمنەی خوایا ڕیزو پۆلێن دەکرێن و لەگەڵیشیا حەشردەکرێن و فەرمان دەکرێت هەموو بەیەکەوە بکرێنە ناو دۆزەخەوە . بۆیە هەر لەئێستاوە بزانە کێت خۆشەوێ و بزانە ئایا سەرخەری دینی خوای گەورەیت ؟!

٥/ ئەوانەی ستالین و لینین و ماسۆلینی و هیتلەرو نازی و فیرعەون و هامان و نەمرود و تاغوتەکانی درێژایی مێژووی بەشەریەتیان پەرستووە و عەلمانیەت و بەرنامە پڕوپوچەکانی تری دەستکردی مرۆڤەکانیان پەرستووەو شوێنیان کەوتوون و سەرخەریان بوون ئەوانەش لەگەڵ ئەم تاغوتانەیا حەشردەکرێن و ( حشر : واتە کۆدەکرێنەوە) و دەخرێنە دۆزەخەوە بەبێ حساب و لێپرسینەوە.

## دیمەنێکی تری قیامەت
## ( پرسیارو لێپرسینەوە لە پێغەمبەران ((علیهم سلام)) )

دوای ئەوەی کە دۆزەخ هێنرایە مەحشەر و پیشانی ئەهلەی درا ( وەک باسمانکرد ) ئینجا ئەوانەی خوایان نەپەرستبوو بەڵکو بت و داروبەردو مرۆڤ و شەیتانەکان و مشک و فیل ...هتد دواییان پەرستبوو هەموو دەکرێنە دۆزەخەوە

لەو ڕۆژەدا خوای گەورە پرسیارو لێپرسینەوە لە پێغەمبەران و نێردراوان دەکات سەبارەت بەئەنجامدانی ئەرکەکانیان، وە پرسیاریش لە ئومەتەکانیان دەکات بەم شێوەیە :

پێغەمبەری وا هەیە کە دێت دوو یان سێ کەسی لەگەڵدایە کە باوەڕی پێکردووە و قەومەکەی باوەڕی پێ نەکردووە واتە باوەڕیان بە خوای گەورە نەهێناوە، پێغەمبەری وا هەیە دێت کەسی لەگەڵدا نیە و بەس خۆیەتی بۆیە پرسیار لە پێغەمبەران دەکرێت سەبارەت بەگەیاندنی پەیامەکانیان و دەبێ شاهیدیشیان هەبێت

پێغەمبەر نوح (عليه السلام) و ئومەتەکەی دێن خوای گەورە پرسیار لە نوح دەکات و دەفەرمێ ئایا پەیامی منت پێ گەیاندن ؟ پێغەمبەر نوحیش(عليه السلام) دەڵێت بەڵێ ئەی پەروەردگار ، خوای گەورە لە قەومە کافرەکەی نوح دەپرسێ و دەفەرمووێ ئایا نوح پەیامەکەی منی پێ گەیاندن ؟ ئەوانیش دەڵێن : نەخێر پێغەمبەرمان بۆ لانەهاتووە ، خوای گەورە بەنوح دەفەرمێ کێ شاهیدیت بۆ دەدات ؟ ئەویش دەڵێ محمد و ئومەتەکەی ، لەوێدا پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) و ئومەتەکەی شاهیدی دەدەن کە پێغەمبەر نوح (عليه السلام) پەیامی خوای گەیاندووە وە ئینجا ئومەتی محمد (صلى الله عليه وسلم) بانگ دەکرێت و پێیان دەوترێت ئایا ئەم پێغەمبەرە پەیامەکەی خوای گەیاندووە ؟ ئەوانیش دەڵێن بەڵێ ، خوای گەورەش دەفەرمێ بەئومەتی محمد ئێوە چ زانیاریەکتان هەیە لەو بارەیەوە ؟

ئومەتی محمدیش (صلى الله عليه وسلم) دەڵێن پێغەمبەرەکەمان واتە (محمد) ئەوەی پێ گەیاندین کە پێغەمبەران (علیهم سلام) پەیامەکانیان گەیاندووە ئێمەش بەڕاستمان زانیوە ،

بەهۆی ئەمەشەوە کە خوای گەورە لە قورئاندا ئەفەرمویت { وكذلك جعلنكم أمة وسطا لتكونوا شهداء على الناس ....}

تێبینی / خوای گەورە هیچ قەومێک سزا نادات تا پەیامی خۆی نەنێرێ بۆیان لەڕێی پێغەمبەرانیەوە ، ئەم شایەتیدانەی ئومەتی محمدیش بۆ بەڵگە نەهێشتنی قەومە کافرەکانە کە شوێن پەیامی پێغەمبەران نەکەوتن و خوای گەورەش بەهۆی ئەم شایەتیدانەی مسوڵمانانەوە بیانوویان پێ ناهێڵێت چونکە ئەو قەومە کافرانە هێندە چاو قایمن لەوێشدا درۆ دەکەن کە دەڵێن نەخێر ئێمە پێغەمبەرمان بۆ نەهاتووە

لەدوای ئەوەی هەموو ئەمانە کرانە دۆزەخەوە ئەوکات تەنها ئەوانە دەمێننەوە کە خوایان پەرستووە لە چاک و خراپ لەگەڵ محمد (ﷺ) و ئومەتەکەی (مونافیقین لەنێوانیاندا) هەروەها پێغەمبەرانی تر (علیهم سلام) و شوێنکەوتووەکانیان لەباوەڕداران دەمێننەوە

ئیتر لەو ساحەیەدا چەند جۆرێک لە خەڵکان دەمێننەوە ئەوانیش پێغەمبەران و باوەڕداران و ( لەنێوانیشیاندا مونافیقەکان ) و خواپەرستان

## چوار جۆر لە خەڵکانی جیاواز لە ساحەی مەحشەردا

چوار جۆر لەخەڵکان لەگەڵ باوەرداران دەمێننەوە کە ئەمانەن (ئەوانەی دینیان پێ نەگەیشتووە (ئەهلی فەترە) ، خەڵکانی نابیستا (کەڕ) کە گوێی لەهیچ نەبووە ، پیاوێکی پیر ، پیاوێکی بێ عەقڵی شێت )

ئەوانیش بەم جۆرە حساب و کتابیان دەکرێت پێش هێنانی تەرازوو و حساب و کتابی خواپەرستان :

کەڕەکە دەڵێت / پەروەردگار ئیسلام هات و گوێم لەهیچ شتێک نەبوو تا پێی ببیستم

شێتەکە دەڵێت / پەروەردگار ئیسلام هات و منداڵەکان تەپاڵەیان تێ دەگرتم و کۆڵانەو کۆڵان بەدوامەوە بوون و گاڵتەیان پێ دەکردم.

پیرەکە دەڵێت / پەروەردگار کاتێک ئیسلام هات و گەیشت بەمن عەقڵم بەهیچ نەدەشکا ( واتە لەبەر پیریەتی و پەکەوتەیی ).

ئەوانەی دینیان پێنەگەیشتبوو (ئەهلی فەترە) / دەڵێن پەروەردگار هیچ نێردراوێکت نەهاتووە بۆلامان تا پەیامی تۆمان پێ بگەیەنێت واتە دینیان پێ نەگەیشتووە .

**تێبینی** / کە ئەڵێین ئیسلام واتە دینی هەموو پێغەمبەران چونکە هەموویان مسوڵمان بوون و موەحید بوون و هەموو هاتوون قەومەکانیان ئاگاداربکەنەوە کە خوا بەتەنها بپەرستن و شەریکی بۆ پەیدا نەکەن و خۆیان نەکەنە عەبدی دارو بەردو بت و مرۆڤێکی هاوشێوەی خۆیان ،

هەروەها دینی هەموو پێغەمبەران (علیهم سلام) تەواوکەری یەکترن

ئینجا پەروەدگار هەر لەو ڕۆژەدا واتە ڕۆژی قیامەت پەیمان لەم چوار جۆرە کەسە وەردەگرێت کە گوێرایەڵی خوا بکەن ... پاشان پەروەردگار فەرمان بە

شاڵاوێکی ئاگر دەکات و دەفەرموێت وەرە ئەو شوێنە خۆتیان بۆ ئاشکرابکە ( واتە ئەو شوێنەی کە کەڕو شێت وپیرو ئەهلی فەترەکە ) ی لێیە ئینجا پەروەردگار بەم کەسانە دەڵێ من لە دنیادا نێردراوێکم بۆلای بەندەکانم دەنارد لەخۆیان ، ئەمڕۆ ئەم شاڵاوە ئاگرە نێردراوی منە بۆلای ئێوە فەرمانتان پێ دەکەم هەمووتان بچنە ناوییەوە

ئینجا ئەوانەی (کە لەئەهلی دۆزەخ بوون) دەڵێن پەروەردگار ئێمە بۆچی بچینە ناوییەوە ؟ ئێمە لەو ئاگرە ڕامان دەکرد ، ئەوانەش کە بەختەوەریان بۆ نوسراوە دەڕۆن بەپەلەو خێرا خۆیان دەخەنە ناوییەوە (واتە دەستبەجێ فەرمانەکەی خوای گەورە جێبەجێ دەکەن)

خوای پەروەردگاریش دەفەرموێت بەرامبەر ئەوانەی کە خۆیان فڕێ نەداوەتە ناو ئاگرەکەوە : ئێوە نێردراوانی منتان توندتر بەدرۆ دەخستەوەو سەرپێچیتان دەکردن

( واتە بە شکاندنی ئەم ئەمرەی خوای گەورە ڕاستەوخۆ لەو ڕۆژەدا دەرخەری ئەو ڕاستیەیە کە ئەگەر لەدنیاشدا پەروەردگار پێغەمبەری بۆ بناردنایە توندتر بەدرۆیان دەخستەوە)

**تێبینی** / ئەمانە کە خۆیان فڕێ نەداوەتە ئاگرەکەوە موستەحەقی دۆزەخ بوون چونکە زیندوو بوونەتەوەو بەچاوی خۆیان قیامەتیان بینیوە و ڕاستەوخۆ قسەیان لەگەڵ خوا کردووەو بەچاوی سەر ئەبینن کە قیامەتەو هەموو مەخلوقات ئامادەی حەق و حساب کراون سەرەڕای هەموو ئەمانە فەرمانی خوای گەورەیان ڕاستەوخۆ شکاند و شوێنی نەکەوتن بەوەی کە خۆیان فڕێ نەدایە ئاگرەکەوە

پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەفەرموێ سوێند بەوەی نەفسی منی بەدەستە ئەگەر بچوونایەتە ناوییەوە ئاگرەکە سارد دەبۆوە لەسەریان و سەلامەت دەبوون ، ئینجا ئەوانەی کە یەکسەر خۆیان هەڵدایە ناوییەوەو فەرمانەکەیان جێبەجێ کرد دەچنە بەهەشتەوەو ئەوانەی تریش دەچنە دۆزەخ

**تێبینی**/ لەمەوە تێگەیشتین نە لەدنیا نە لە قیامەت بەدەستهێنانی بەهەشت بە خۆرایی و بەلاش نیە یان لەدنیا تاقیدەکرێیتەوەو دەبێ فەرمانی پەروەردگار

جێبەجێ بکەیت یان لە قیامەتدا دەبێ شوێن فەرمانی خوای گەورە بکەویت (ئەگەر هاتوو ئیسلامت پێ نەگەیشتبوو) ئینجا دەتوانی بەهەشت بەدەست بێنی هەموو ئەمر شکاندنێکیش سەرەنجامەکەی بۆ دۆزەخە چونکە تۆ دەبێ بزانی فەرمانی کێت شکاندووە

فەرمانی الله تعالی ت شکاندووە کە هەموو ئەم ئاسمانانەو زەوی و ئەستێرەکان و هەسارەکان و مەخلوقاتی دروستکردووەو بەهەشت و جەهەنەم و فریشتەکانی بەدیهێناوە ئەم لەشە ئاڵۆزەو ڕێک و پێکەو ڕووەکەکان و چیاکان و دەریاو زەریاکانی دروستکردووە ، تۆش ناپەرستیت و ئەمری دەشکێنی بۆیە موستەحەقی دۆزەخ دەبیت و ئەگەر ئەمرەکانی و فەرمانەکانی جێبەجێ بکەیت ئەوا بەهەشتانێکت بەنسیب دەکات کە خۆشترینی خۆشیەکانە بەجۆریکە نە چاوەکان بینیویانە نە گوێیەکان بیستوویانە نە دڵەکانیش توانای بیرکردنەوەو وێناکردنیان هەیە لەخۆشی ئەو بەهەشتانە

لێرەدا هەموو ئەوانەی کە بێ دین و بێ باوەڕبوون بە خوای تاک و تەنها و هەموو ئەوانە شوێن پەرستراوەکانیان کەوتن وفڕێدرانە دۆزەخەوە ئەوانەش کە دینیان پێ نەگەیشتبوو وەک ( کەڕو شێت و پیر و ئەهلی فەترە) و دەرفەتی ئەوەیان نەبوو لەدنیادا پەیامی پەروەردگاریان پێ بگات یەکلایی بوونەوەو هەر لە ساحەی مەحشەردا تاقیکردنەوەیان کراو پاداشتی خۆیان وەرگرت بەپێی جێبەجێکردن یان شکاندنی فەرمانەکەی خوای گەورە

ئێستا دوای هەموو ئەمانە لە ساحەی مەحشەردا تەنها مسوڵمانان و پێغەمبەران و ئومەتەکانیان و ئومەتی محمد و ( مونافیقەکان لەنێوانیاندا ) ماوە .

حاڵ و گوزەرانی مسوڵمانان لە گۆڕەپانی مەحشەردا پێش دەست پێکردن بە حەق و حساب بە دوو جۆرە :

**یەکەم** : هەندێ مسوڵمانی تاوانباری تاوان زۆر گەورە بەپێ جۆرو جیاوازی تاوانەکانیان پێش دەست پێکردنی حەق و حساب و تەرازوو و لێپرسینەوە لە ساحەی مەحشەردا هەندێ سزای جیاواز و جۆراوجۆر دەدرێن بۆئەوەی تا دەگەنە سەر تەرازوو حسابەکانیان کەم بێتەوە وپاک ببنەوە ( ئەمە بۆ ئەو مسوڵمانە خواپەرستە زۆر تاوانبارانەیە کە هێندە تاوانی گەورە و زۆرە هێشتا بە نارەحەتی دنیاو عەزابی قەبرو ژیانی بەرزەخ ...هتد لە تاوانەکانی پاک نەبۆتەوە ) بۆیە بۆئەوەی تا ئەگاتە (سەر تەرازوو حەق و حساب) لەو ساحەی مەحشەرەدا سزا دەدرێت تا پێوانەی کردەوە خراپەکانی کەم بێتەوە

**دووەم** : یاخود هەندێ تاوان هەن کە بەندەکان ئەنجامیان داوەو گوێیان نەداوە بە حەرامی و حەلاڵی تاوانەکە کە بەهۆی ئەو تاوانانەوە سزادەدرێن و سزاکەشیان تایبەتە بەگۆڕەپانی مەحشەر واتە هەندێ سزا هەن کە عەبدە تاوانبارەکان تەنها لەگۆڕەپانی مەحشەردا سزا دەدرێن بەپێی جۆری تاوانەکانیان کە تەوبەیان لێ نەکردووەو بەردەوام بوون لەسەری

**تێبینی** / مسوڵمانی وا هەیە هێندە تاوانی زۆرە هێشتا تا کۆتایی پردەکەش سزا دەدرێت مسوڵمانی واش هەیە هێندە تاوانی زۆرە پێویستی بە ماوەیەک سزادان هەیە لەناو بەندینخانەکانی بەشی سەرەوەی جەهەنەمدا ( قاتی یەکەمی جەهەنەم ) تا بەتەواوی پاک دەبێتەوەو تاوانی پێوە نامێنێت و تا ئەوکاتەی موستەحەقی ئەوە دەبێت بکرێتە بەهەشتەوە

لەو ڕۆژەدا کە تەنها مسوڵمانان لەهەموو ئومەتە خواپەرستەکان ماونەتەوە لە ساحەی مەحشەردا هەموو ڕیزکراون و وەستێنراون بەپێی پلەی تەقواو لەخوا ترسانیان و بەگوێرەی کەمی تاوان و زۆری و جۆراو جۆری تاوانەکانیان واتە خوای گەورە هەموو خەڵکێک لەگەڵ هاوشێوەی خۆیدا ڕیزدەکات و حەشری دەکات و کۆی دەکاتەوە بەم شێوەیە

. پیاوە ڕاستگۆو موخلیسەکان لەگەڵ هاوشێوەی خۆیان ڕیز دەکرێن

. شەهیدان و موجاهیدانی بەرزکەرەوەو سەرخەرانی دینی پەروەردگار لەگەڵ هاوشێوەی خۆیاندا ڕیز دەکرێن

. موتەقیەکان و خواپەرستەکان لەگەڵ هاوشێوەی خۆیان دەبن

. زاناو عالمەکان لەگەڵ هاوشیوەی خۆیان ڕیز دەکرێن و بەجۆرێک موعازی کوڕی جەبەل (رضي الله عنه) بەهاوشێوەی هاویشتنی بەردێک لەپێش هەموویانەوە دەبێت

. بانگخوازەکان لەگەڵ بانگخوازانی هاوشێوەی خۆیان دەبن

. سوخۆرەکان لەگەڵ سوخۆرەکانی هاوشێوەی خۆیان دەبن

. زیناکارەکان لەگەڵ زیناکارانی هاوشێوەی خۆیان دەبن

. عارەق خۆرەکان لەگەڵ هاوشیوەی خۆیان لە عارەق خۆرەکان دەبن

. دۆزەخیەکانیش لەگەڵ دۆزەخیەکانی هاوشێوەی خۆیان دەبن

ئیتر بەگوێرەی هەموو کارو کردەوەکانیان کە مرۆڤەکان ژیانی دنیایان زۆرتر لە چیدا سەرف کردووە بەوشێوەیە بەپێی زۆرترین کردەوە ( خراپ یان چاک ) ڕیز دەکرێن ...هتد

یاڕەب لە ڕیزی موتەقیەکان و زانا دڵسۆزەکانا ڕیزمان بکەیت

**پێش دەستپێکردنی حساب و کتاب و لێپرسینەوە تاوانباران بەپێی جۆری تاوانەکانیان تا هاتنی کاتی حساب و کتاب بەم شێوەیە سزا دەدرێن لەگۆڕەپانی مەحشەردا :**

**١/ زەکات نەدەرەکان :** ئەوانەی خاوەنی ئاڵتوون و زیو بوون و زەکاتیان لێ دەرنەکردووە ئەوا بۆیان دەکرێت بەچەند پارچە پلێتێک و ئینجا سوردەکرێتەوە لەسەر ئاگری دۆزەخ و پاشان لای ڕاست و چەپ و ناوچەوان وچەناگەو پشتی پێ داخ دەکرێت هەر کاتێک سارد ببێتەوە دیسان بۆی گەرم دەکرێتەوەو لە ڕۆژێکدا کە ماوەکەی ٥٠ هەزار ساڵە تا خوای گەورە کاری بەندەکانی یەکلایی دەکاتەوە ئینجا ڕێگەی خۆی نیشان دەدات یان بەرەو بەهەشت یان بەرەو دۆزەخ

هەر کەسێک زەکاتی وشتر یان حەیوانەکانی نەدات و مردبێت مافی هەژارانی لێ نەدات حەیوانەکە قەڵەو دەکرێت و لە ڕۆژی قیامەتدا خاوەنەکەی دەکاتە ژێر

سمەکەیەوەو بە دەمی گازی لێدەگرێت بەپێی ژمارەی وشترەکانی سزاکەی زۆرتر دەبێت و هەموو وشترەکانی بۆ زیندوو دەکرێتەوەو سزای دەدەن لەسەر نەدانی زەکاتەکانیان بەهەژاران

بۆ مانگاو گا و حەیوانە شاخدارو بێ شاخەکانیش بەهەمان شێوە ئەگەر زەکاتەکانیان نەدات ئەوا لە ڕۆژی قیامەتدا بەرشاخیان دەدەن کە ئەو ڕۆژە درێژی پەنجا هەزار ساڵە تا خوای گەورە کاری بەندەکە یەکلایی دەکاتەوە بەرەو بەهەشت یان بەرەو دۆزەخ

هەر خاوەن گەنجینەیەک زەکاتی گەنجینەکەی نەدات ئەوا گەنجینەکەی لەڕۆژی قیامەتدا دێت لەشێوەی مارێکی دوو شاخدا دەمی بۆ کردۆتەوە کە نزیک دەبێتەوە خاوەنەکەی لێی ڕادەکات ئینجا بانگی لێ دەکات و هەردوو لا شەویلگەی دەگرێت وپێی دەڵێت بگرە ئەو گەنجینەیەت کە شاردبووتەوە ئا ئەوە سامانەکەتە کە چروک و بەخیل و ڕەزیل بوویت تیایا ، من پێویستم پێی نیە کاتێک زەکاتنەدەرەکە دەبینێ هیچ چارێکی نیە دەست دەخاتە دەمی مارەکەوەو ئینجا مارەکە دەیخرمێنێ و هەموو لاشەی بەدوایدا دەخوات هەتا خۆی دەئاڵێنێ لەگەردنیەوە

سزای ئەم زەکات نەدانە بەهەمان شێوە ئایەتی لەسەرە کە خوای گەورە دەفەرمووێت : [وَلَا يَحْسَبَنَّ الَّذِينَ يَبْخَلُونَ بِمَا آتَاهُمُ اللَّهُ مِنْ فَضْلِهِ هُوَ خَيْرًا لَهُمْ]

پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەفەرمێت: هەرکەسێک خوای گەورە ماڵ و پارەیەکی پێ ببەخشێت و زەکاتەکەی نەدات ئەوە لە رۆژی قیامەت ئەو ماڵ و پارەیەی دەبێتە مارێکی کەچەڵ لەبەر زۆری ژەهرەکەی، وە دوو خاڵی رەش لە ناوچەوانێتی پێوەی دەئالێ و هەردوو شەویلگەی دەگرێت و پێی دەڵێت من ماڵ و پارەکەتم، پاشان پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئەم ئایەتەی خوێندەوە: وە ئەو کەسانەی کە ڕەزیلی و چروکی دەکەن لەو ماڵەی کە خوای گەورە لە فەزڵ و چاکەی خۆی پێی بەخشیون و لە پێناو خوای گەورەدا نایبەخشن با وا نەزانن کە ئەو ڕەزیلیە بۆ ئەوان باشترەو ماڵەکەیان بەوە زیاد دەکات [بَلْ هُوَ شَرٌّ لَهُمْ] بەڵکو ئەوە بۆیان خراپەو تاوانبار ئەبن لەسەری و تووشی سزای خوای گەورە دەبن و ماڵەکەشیان لەناو دەچێ [سَيُطَوَّقُونَ مَا بَخِلُوا بِهِ يَوْمَ الْقِيَامَةِ] ئەو ماڵەی کە ڕەزیلیان لێی کردووەو نەیانبەخشیوە لە ڕۆژی قیامەتدا دەبێتە تەوقێک لە ئاگرو مارو دەچێتە

گەردەنیان [وَلِلَّهِ مِيرَاثُ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ] وە هەرچی لە ئاسمانەکان و زەوی هەیە هەمووی موڵکی خوای گەورەیە خوای گەورە پێتان دەبەخشێ ئیتر ئێوە بۆچی ڕەزیلی دەکەن [وَاللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ خَبِيرٌ (١٨٠)] وە خوای گەورە زۆر زانایە بەو کردەوانەی کە ئێوە ئەنجامی دەدەن.

**تێبینی** / ئەم سزادانە بۆ ئەوانەیە کە باوەڕیان بەزەکات هەیە بەڵام جێبەجێیان نەکردووە ئەگینا ئەوانەی باوەڕیان پێ نەبووە ئەوا بەبێ حساب و کتاب هەرزوو ڕاستەوخۆ بەکافری خراونەتە ناو ئاگرو بەندینخانە قوڵەکانی خوارەوەی جەهەنەمەوە

**٢/ دزی بەگشتی و بەتایبەت لە دەستکەوتی جەنگ :** هەرکەسێک هەر شتێک بدزێت لە ڕۆژی کۆتاییدا بەسەرشانیەوە دەبێت و دەیهێنێت و لەگەڵ خۆی هەڵیدەگرێت بە (کەسە دزەکە ) دێت لە ڕۆژی قیامەتدا لەناو ملیارەها مرۆڤدا وە گەورەترین جۆری دزیش لای پەروەردگار بریتیە لە دزینی زەوی ئەو کەسەی بستێک زەوی دزیوە و داگیری کردووە هەروەها ئەو کەسەش کە بەرتیلی وەرگرتووە

لەو ڕۆژەدا هەر کەسێک هەر شتێکی دزی بێت و ئەوا ئەو شتە دزراوانە لە ڕۆژی قیامەتدا بەسەر شانیانەوە هەڵی دەگرن ، ئەوەی وشترێکی دزی بێت وشترەکە بەسەر شانیەوە بۆڕە بۆڕی دەبێت ، ئەوەی مەڕێکی دزی بێت مەڕەکە بەسەر شانیەوە ئەباڕێنێت و یان ئاڵتون و پارەو هەر شت و مەکێکی تری دزی بێت ، پێغەمبەری خواش ﷺ لەو ڕۆژەدا هیچی پێناکرێت بۆت ئەگەرچی هاواری لێ بکەیت ڕزگارت بکات لێی چونکە ئەو لەدنیادا پێی ڕاگەیاندوویت لەوێ لە قیامەت هیچی پێناکرێت بۆت

تەنانەت پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەفەرمێ دەرزی و دەزووش بگەڕێننەوە بۆ خاوەنەکانیان چونکە لەڕۆژی قیامەتدا دەبێتە زەلیلی و ڕسوایی و سەرشۆڕی بۆتان

تەنها ئەوانە ڕزگاربوون لەو سزاو ناڕەحەتیانەی قیامەت لەمسوڵمانان کە بەتەقوان و خۆیان دەپارێزن لە دەرزی و دەزوویەکیش چونکە پێغەمبەری خوا (ﷺ) لەڕۆژی قیامەتدا کە دزەکان دەبینی شت و مەک و زەوی و ... هتد بەسەرشانیانەوەیە ڕوویان لێ وەردەگێڕێ بەلای ڕاست و چەپدا

**٣ / خراپترین کەسانی ناو مسوڵمانان:** لەو ساحەی مەحشەرەدا ئەوانەن کە خۆشەویستانیان لەیەک کردووە و لەیەکیان دوورخستوونەتەوە و نێوانیانیان تێک داوە وە هەرکەسێک ناکۆکی خستبێتە نێوان دایکێک و جگەرگۆشەکەی یان باوکێک و جگەرگۆشەکەی ئەوانەش کە نێوانی هاوسەرەکانیان تێکداوە و نێوانی خزمەکانیان تێکداوە و ئاڵۆزیان خستۆتە ناو هەموو ئەم چینانەوە کە ئیشارەتی پێدرا، سزای ئەو کەسانە کە ئەم کارە ناشرینەیان کردووە لە ڕۆژی قیامەتدا خوای گەورە ناکۆکی دەخاتە نێوان خۆی و خۆشەویستەکانی و لەیەکیان دوور دەخاتەوە و خراپترین کەسانی ناو مسوڵمانانن لەو ڕۆژەدا

**تێبینی** / هەموو ئەمانەی باسمان کرد لەم بەشەدا هەموویان مسوڵمانن و خواپەرستن واتە موشریک و کافر نین چونکە بێدین و موشریکەکان هەر زوو نێردران بۆ دۆزەخ و مەنزڵەگەی هەتا هەتایی خۆیان

تێبینی / خوای گەورە زۆر زۆر بەڕەحمە ئەگەر تۆ ئەم کارانەت کردووە ئەوا لە ئێستاوە تەوبەی لێبکەو نێوانی هەموو ئەو کەسانە چاک بکەرەوە کە تێکت داوە یان ئەگەر شتی کەسێکت بردووە بۆی بگێڕەوەو تەوبە بکە بۆلای پەروەردگار چونکە تەوبەکارانی ڕاستەقینە ئەوانەن کە خوای گەورە خۆی فەرموویەتی خۆشم دەوێن و ئەو کەسانەن کە لە ڕۆژی قیامەتدا پێغەمبەران ئاواتیان پێ دەخوازن لە زۆری کردارە چاکەکانیان خوای گەورە کردەوە خراپەکانیانی کردووە بە چاکە لەسەر تەوبە ڕاستەقینەکەیان .

٤/ ئەوانەی لە خێزانێک زیاتریان هەبووە و دادپەروەرنەبوون و لایەنگیری یەکێکیانی کردووە لەسەر ئەوی تریان و واتە ئەوی تری پشتگوێ خستووە لەو ڕۆژەدا کە زیندوو دەکرێتەوە لایەکی جەستەی بەلادا کەوتووە واتە دەکرێت بە دوو لەتەوەو لایەکیان بەلادا دەکەوێت .

٥/ئەوانەی زانیاری ناگەیەنن کاتێک پرسیاریان لێ دەکرێت زانیاریەکە دەشارنەوە، ئەمانە لغاوێکی ئاگرین دەکرێتە دەمیان لەو ڕۆژەدا .

٦/ ئەوانەی جاسوسیان کردووە بەسەر خەڵکانەوەو گوێیان بۆ گفتوگۆی خەڵکی قوڵاغ کردووە ئەوانە لەو ڕۆژەدا قورقوشمی تواوە دەڕژێنرێتە ناو گوێیەکانیانەوە.

٧/ ئەوانەی خەو بە درۆ دەگێڕنەوە (لەو رۆژەدا) دوو دەنکە جۆ دەدرێتە دەستیان و ئەمریان پێ دەکرێت کە گرێیان بدەن بەیەکەوە ئەگەر گرێیان نەدەن سزادەدرێن لەسەری وە بەدڵنیاییەوە ناتوانن بۆیە سزا دەدرێن لەسەر بەدرۆ گێڕانەوەی خەوەکانیان .

**تێبینی** / چونکە ئەمانە بەم کارەیان (درۆکردن بەخەوەوە) خەڵکی فریو دەدەن و وە خەویش بریتیە لە بەشێک لە ٧٠ بەشی وەحی

ئەوانەی وێنەی ڕۆح لەبەر دەکێشن لەڕۆژی قیامەتدا ئەمریان پێ دەکرێت کە زیندوویان بکەنەوە لەوانەی کە دروستان کردووە بۆیە ناتوانن لەسەری سزا دەدرێن

٨/ لەو ڕۆژەدا شالاوێک لە ئاگر لە جەهەنەمەوە دەردەچێت ( هەروەک ئامێرێکی چاودێری وایە ) کە لەشێوەی سەروملدایە (رۆبۆتێکی ئاگرین) و بەرزدەبێتەوە بەسەر هەموو بونەوەرانی ڕاوەستاوی گۆڕەپانی مەحشەر و لەوێدا دوو چاوی (دوو کامێرا)ی هەیە چاودێری پێ دەکات و زمانێکی (سپیکەرێک) پاراوی هەیە قسەی پێ دەکات (نمونەی ڕۆبۆتێک) و دەڵێت من فەرمانم پێکراوە بەڕاپێچکردنی سێ کۆمەڵ بۆناو دۆزەخ ، ئەو شالاوە ئاگرە ( ئەو ئامێرە ئاگرینە ) دەڵێت فەرمانم پێکراوە بە ڕاپێچکردنی هەموو زۆردارێکی کەللە ڕەق

(دەزگای بینینی ئەو شالاوە ئاگرە زۆر لە کامێرا چاودێریەکانی ئەمڕۆ هەستیارترە یاخود زۆر لە چاوی باڵندەی هەڵۆش وردبینترو چالاکتر و کاریگەرترە کە لەدووری چەند کیلۆمەترەوە نێچیری خۆی دەدۆزێتەوە)

بەجۆرێک دەتوانێ هەموو یەکێکی ئەو کۆمەڵانە بدۆزێتەوە پاشان دەیانگرێ و نوقمی ناو دۆزەخیان دەکات ، پاشان جاری دووەم شالاوە ئاگرەکە (ڕۆبۆتە لەئاگر دروستکراوەکە) دێتە دەرەوەو دەڵێت فەرمانم پێکراوە بەڕاپێچکردنی هەموو ئەوانەی کە ئازاری خواو پێغەمبەرانیان ئەدا ( واتە بە وشەی بێڕێزی و نەگونجاو و گاڵتەجاری ) ( ئەمە کافرانیش دەگرێتەوە هەر لە ساتی یەکەمی زیندووبوونەوەیان لە گۆڕدا ) پاشان دەیانگرێ و نوقمی ناو دۆزەخیان دەکات ، پاشان بۆ جاری سێیەم دیسان دێتە دەرەوەو هەموو ئەوانە دەگرێت کە وێنەکێشی ڕۆح لەبەر بوون و پەیکەرتاش بوون و نوقمی دۆزەخیان دەکات

**تێبینی** / پێغەمبەری خوا (ﷺ) هەمیشە بۆ تێگەیاندنی هاوەڵان نمونەی ئاسان و سادەی بەکار هێناوە بەنمونە فەرموودەمان هەیە کە خۆی بەهاوەڵان دەفەرمێت لە کۆتا زەماندا مسوڵمانان بە (زینە) دێن بۆماڵەکانی خوا بۆ نوێژی جەماعەت کەچی ژن و کچەکانیان ڕووتن (سفورن) ! هاوەڵان پرسیان زینە چیە ئەی پێغەمبەری خوا ؟ ئەویش فەرمووی وەک خانو ماڵ وایە بەڵام ئەڕوات ( بەزمانی ئەمڕۆمان بریتیە لە سەیارە و ئۆتۆمبێل ) کە وەک خانوو ماڵ وایە ئەتوانی تیایا دابنیشیت و سەرما یان گەرمات نەبێ

بۆیە بۆ ئامێرەکانی سزادانی ڕۆژی قیامەت پێغەمبەری خوا (ﷺ) چۆنێتی وردەکاری ئامێرەکەی نەداوە تەنها بە هەندێ وشەی ئاسان پێی ڕاگەیاندوون و تێی گەیاندوون وە ئەوانیش پێویستیان بە وردەکاری چۆنێتی ئامێرەکان نەبووە

یان فەرموودەیەکی ترمان هەیە پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەفەرموێ ڕۆژێک دێت کە پیاو ڕانی خۆی پێی دەڵێت کە دوای خۆی ژنەکەی چی کردووە لە ماڵەوە !

بەنمونەی ئەمڕۆ بریتیە لە ئامێری مۆبایل کە زۆرینەی هەرزۆرمان دەیخەینە ناو ئەو گیفانەمانەوە کە لەسەر ڕانمانەو ئێستا ئامێری چاودێری زۆر پێشکەوتوو هەیە کە لەماڵەکاندا دادەنرێت و هەرکەسێک دەرگای ماڵەکە بکاتەوە یان بچێتە ژوورەوە و (بەنمونە هەڵواسینی کامێرا و میکرۆفۆن لەماڵەکاندا ) پاشان تۆماری دەکات و یەکسەر بە نۆتیفیکەیشن (هەزەلیدان) دێت بۆ مۆبایلەکەی و نیشانی دەدات کە چی ڕوودەدات لەماڵەکەیدا

(بۆ زانینی نمونەی زۆرتر لەم جۆرە کتێبی نیشانەکانی ڕۆژی قیامەت بخوێننەوە)

کە هەموو ئەمانە لەگەورەیی و ڕاستی وتەی ئەو پەیامبەرە دڵسۆزو خۆشەویستەیە

بۆیە تێبینی بکەن کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) چەند بەئاسانی و ڕستەی ئاسان هاوەڵانی تێ گەیاندووە بەنمونە دیقەتی ئەم دێرە بدەن کە دەفەرموێ (ڕانیان پێیان دەڵێت کە هاوسەرەکانیان چیانکردووە دوای خۆیان ) بەوشێوەیە هاوەڵانی تێگەیاند لەکاتێکا ئەوان لەو سەردەمەیە لەڕووی تەکنەلۆژیاوە پێشکەوتوو نەبوون بۆیە پێویست بووە لەسەر پێغەمبەری خوا بە سادەیی تێیان بگەیەنێت نەک بەزمانێکی تەکنەلۆژی ئەمڕۆ

بۆیە بۆ ئامێرەکانی سزادانی ڕۆژی قیامەتیش کە بۆ تێگەیشتنی ئێمەش هێشتا زۆر لەوە پێشکەوتووترە کە من ناوم لە شالاوە ئاگرەکە ناوە (ڕۆبۆتێکی چاودێری ئاگراوی )

**٩/** ئەوانەی لە دنیادا زۆر تێروپڕ بوون و پۆشتەبوون ئەوانە لە ڕۆژی قیامەتدا زۆر برسین و ڕووت و بێ پۆشاکن (ئەمە بۆ ئەو کەسانەیە کە زۆر دەوڵەمەند بووەو ڕەزیل بووە پارەی نەبەخشیوە و هەر کۆیکردۆتەوە تەنها لەخۆیدا سەرفی کردووە وە کەسێکی موسرِیف بووەو لای بەهەژاراندا نەکردۆتەوە )

وە ئەگەر دەوڵەمەند بیت لە دنیایا ئەوا فەقیر دەبیت لە قیامەتدا وە بە پێچەوانەشەوە ، بەڵام ئەو دەوڵەمەندەی بەهەر چوارلادا دەبەخشێت بەبێ ڕیایی و تەنها لە پێناوی خوای گەورەدا لەڕۆژی قیامەتدا پۆشتەیەو تێروپڕە

**تێبینی** / زۆری و بۆری و دەوڵەمەندی مرۆڤ سەرقاڵ دەکات بەمەش دوور دەکەوێتەوە لە زیکرو یادی خوای گەورە هێندە سەرقاڵ دەبێت بە ماڵ و سەروەت و سامان کۆکردنەوەو ئیش و کار بۆیە ئەو دەوڵەمەندانە بەهۆی کەمی زیکرکردن و هەروەها نەبەخشینیان لە قیامەتدا هەژارن و بێ پۆشتەو برسی و تینون

**١٠** / دووڕووەکان (دوو زمانەکان) لە ڕۆژی قیامەتدا دوو زمانی ئاگرینی (دوو ئامێری شێوە زمانی ئاگراوی ) دەبێت لە ڕۆژی دواییدا

**١١/** ئەوانەی بستێک زەوییان بەستەم داگیرکردبێت لە ڕۆژی قیامەتدا خوای گەورە داوای لێ دەکات هەڵی بکەنێت تا زەوی حەوتەم و پاشان (ڕۆئەچێنرێت تیایدا)، ئینجا دەکرێتە تەوقی گەردنیەوە هەتا خەڵکان لەیەک جیادەکاتەوە ، هەندێکی تریش ئەو زەوییەیان هەڵگرتووە هەتا خواری خوارەوەی زەوی

**تێبینی/** لە قۆناغێکداین هێشتا تەرازوو نەهێنراوەو حەق و حسابی مسوڵمانان دەستی پێ نەکردووە مسوڵمانە زۆر تاوانبارەکان بەپێی جۆرو جیاوازی تاوانەکەیان تا دەگەنە بەردەم تەرازوو وە هەتا سەرەی حساب و کتابیان دێت بەردەوام سزا دەدرێن تا حسابەکەیان سوک بێت لەلای تەرازوو

١٢ / ئەوانەی ئەو هەموو کاتە جوانەیان بەسەردا تێ دەپەڕێ و زیکرو یادی خوایان تیادا نەکردووە لەڕۆژی قیامەتدا دەبێتە خەم و خەفەت و داخ بۆیان چونکە ئەو ڕۆژە موحتاجی یەک زیکرە بەنمونە یەک ( سبحان الله ) بەڵام ناتوانێت

١٣ / ئەوانەی خۆیان لە منالەکانیان بەری دەکەن بۆئەوەی ئابڕوویان بەرن خوای گەورە لە ڕۆژی قیامەتدا ئابڕوویان دەبات لە پێش چاوی ملیۆنەها مرۆڤی ئامادەبووی مەحشەر

١٤/ هەر کەسێک لە شوێنێکدا بوەستێت بۆ ڕیاو فیز ئەو کەسە بەوکارەی خوای گەورە ئابڕوی دەبات لە پێش دروستکراوانی مەحشەردا ، وە هەر کەسێک کارێک بکات بۆئەوەی خەڵکان بیبستنەوە خوای گەورە ئەو کارە ڕیپایەی ئاشکرا دەکات و دەیدات بەگوێی دروستکراوانی خۆیدا لەڕۆژی کۆتاییدا و سوکی دەکات

هەر کەسێک مسوڵمانێک ڕابگرێت لەشوێنێکدا بۆ ڕیاو فیز خوای گەورە ئەو کەسە لە جێگەو پلەیەکی ڕیابازی و فیزدا بۆ ئابڕوو چوون دەوەستێنێت لە ڕۆژی کۆتاییدا ( ئەمە ئەوانە دەگرێتەوە کە حەز بە حیمایەو بوونی خەڵکان دەکەن بەدەوروبەریاندا )

هەر کەسێک خواردنێک بەناحەق بخوات لەسەر حسابی مسوڵمانێک ئەوا خوای گەورە لەو ڕۆژەدا خواردنێکی لەئاگر پێدەدات ، هەر کەسێک پۆشاکێک لەبەر بکات لەسەر حسابی مسوڵمانێک بەناحەق ئەوا لەو ڕۆژەدا پۆشاکێکی لەئاگر بەبەردا دەکرێت

هەر کەسێک کارێک بکات بۆ ڕیابازی بۆئەوەی چاکەی کارەکەی خۆی بدات بەگوێی خەڵکاندا خوای گەورە لە ڕۆژی قیامەتدا خراپەی کارەکەی دەدات بەگوێی بونەوەراندا ، هەر کەسێک زیادە ڕەوی بکات و دەربچێت لەفەرمانی خوا و پێغەمبەری خوا (ﷺ) ، ئەو کەسە خوای گەورە باری لەسەر گران دەکات لەڕۆژی قیامەتدا

١٥/ ئەو سواڵکەرانەی کە پێویستیان بەسواڵ نیە لەڕۆژی قیامەتدا سواڵکردنەکەیان دەبێتە برین و ڕنینەوە بەدەم و چاوییاندا تا دەگەن بە خوای گەورە هیچ پارچە گۆشتێک بە دەم و چاوییانەوە نەماوە

١٦ / بازرگانە درۆزن و خیانەتکارەکان لەڕۆژی قیامەتدا لەهەرە تاوانبارەکانن ئەوانە نەبێت کە زۆر لە خواترس بوون و ڕاستگۆو چاکەکار بوون ، بەنمونە بازرگان هەیە لە دنیادا شیرو ئاوی تێکەڵ کردووە بۆ قازانجی زیاتر لە ڕۆژی قیامەتدا داوای لێدەکرێت شیرو ئاوەکە لەیەک جیابکاتەوە بەڵام لەئەنجامدا ناتوانێت جیایان بکاتەوە بۆیە لەسەر ئەم خیانەتەی سزا دەدرێت

ئەبێ حاڵی بازرگانە خیانەتکارەکانی تر چۆن بێت کە ڕۆژانە سەدان نمونەی سەیرو سەمەرەیان لێ دەبیستینەوە !

١٧ / ئەوانەی جل و بەرگی گرانبەها بۆ فیز لەبەردەکەن لە دنیادا ئەوا خوای گەورە لە ڕۆژی قیامەتدا جل و بەرگی زەلیلی بەبەریاندا دەکات و پاشان ئاگری تێبەردەدرێت

١٨ / ئەوانەی غەدرکار بوون لە ڕۆژی قیامەتدا ئاڵای غەدر بەرزدەکرێتەوە بە پشتیانا بەئەندازەی غەدرەکەیان ، وە پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەفەرمێ ئاگاداربن هیچ غەدرێک گەورەتر نیە لە غەدری سەرۆکێکی گشتی ، گەورەترین جۆری غەدریش ئەوەیە کە پیاوێک متمانە بە پیاوێکی تر بکات واتە لێی ئەمین بێت ئینجا بیکوژێت دوای ئەوەی کە متمانەی پێ کردووە و لێی ئەمین بووە ئا ئەو کەسە لە ڕۆژی قیامەتدا ئاڵایەکی غەدر بە پشتیا دەچەقێنرێت و بەئەندازەی غەدرەکەی بۆی بەرزدەکرێتەوە

١٩/ ئەو کەسانەی لە کاتی نوێژدا تف بکەنە ڕووەو قیبلە ئەوا لە ڕۆژی قیامەتدا تفەکەی بە نێوانی هەردوو چاوییەوەیەتی ( بۆیە ئەگەر زۆر زۆرت بۆهات تەنها بۆت هەیە تف بکەیت بەلای چەپدا لەکاتی نوێژدا )

٢٠/ ئەو ئافرەتانەی کە لەخۆیان ئەداو شین و شەپۆڕیان ئەکرد بۆ مردووەکانیان دەیان لاواندەوە تا خەڵکان بخەنە گریان بەمردنی کەسانی تر ئا ئەوانە لە ڕۆژی قیامەتدا دەوەستێنرێن و شەڕواڵێکی قەتران ( قیری سوتاوی ئاگری دۆزەخ ) و کراسێکی زبری ئاگرینیان بەبەردا دەکرێت ، ئافرەتان ئەگەر ئەم سیفەتەتان تیایە تەوبەی لێ بکەن و دووبارەی مەکەنەوە

**٢١** / ئەو کەسانەی هەوڵ دەدەن بۆ خۆشکردنی ئاگری فیتنەو ئاژاوە و جۆش دانی فیتنە ئا ئەمانە لە ڕۆژی قیامەتدا هاوار و وەیل بۆیان ئەبێ چ سزایەکیان بۆ دابینکرابێت و حاڵیان چۆن بێت لەو ڕۆژەدا !!!

**٢٢/** ئەو کەسانەی کە دەچنە ئەو ماڵانەی پیاوەکانیان لەماڵ نین و بەمەبەستی داوێن پیسی لەگەڵ ژنەکانیان لە ڕۆژی قیامەتدا مارەکانی تایبەت بەساحەی مەحشەر بەردەوام دەیانگەزن .

حاڵی کەسە زۆر چاکەکارەکان کە هەر بە زیندووبوونەوەیان لە گۆڕەکانیان و هەستانەوەیان ئایا چ ڕێزێکیان لێ دەگیرێت و چیان پێشکەش دەکرێت ؟ وە لە کوێدا نیشتەجێ دەکرێن لەو ساحەی مەحشەرەدا ؟ ئایا ئەو کردەوانە چین کە ئەوان ئەنجامیان داوە و بەهۆیەوە ئەو ڕێزو پایەگەورەیەیان پێ دەبەخشرێت لە گۆرەپانی مەحشەردا ؟

بەخشـینەکان ئەمانەن :

وتەو مژدە دڵخۆشکارەکان لە ساتی هەڵسانەوە لە نزیکی گۆڕەکاندا !

**یەکەم:** هەر کە لە گۆڕەکانیان هەڵدەستنەوە فریشتەکان دێن بۆلایان و مژدەیان ئەدەنی لەلایەن پەروەردگارەوە پێیان دەڵێن غەمبار مەبن و مەترسن ئێمە ئەمڕۆ لەگەڵتانین پشتیوانتانین بەمەش ئەو باوەڕدارانە ڕووخۆش و شادومان دەبن

ئەوانە کێن ؟

١/ئەوانیش پیاوچاکان و ساڵحانن : ئەو کەسانە ئەوانەن کە پێغەمبەران و شەهیدان ئاواتیان پێ دەخوازن لەو ڕۆژەدا ( بەهۆی نزیکبوونیان لە خوای گەورە ) ئەم پیاوانە ناترسن و غەمبار نابن کاتێک خەڵکان غەمبار و دڵگرانن

( ئەم پیاوانە خەڵکانێکی دوور لەیەک بوون و هەریەکەیان لەهۆزی جیا جیابوون هاوڕێیەتیان تەنها لەپێناوی خوای گەورەدابووە وە هەر لە پێناوی خوای گەورەدا یەکتریان خۆش ویستووە و سەردانی یەکتریان کردووە ، ئەم پیاوانە (یاخود ئافرەتانە) کەسانێکی بڕوادارو چاکەکار بوون و چاکەیان ئەنجام داوە تەنها بۆخوا

٢/ ئەو پیاو (ئافرەتە) چاکانەی کە زۆر لە سەختی و سزاو نارەحەتی ڕۆژی قیامەت دەترسن و هەمیشە ئەو ڕۆژەیان لەبیرە ئەو کەسانە لە ڕۆژی قیامەتدا خوای گەورە ڕووگەشی و شادمانی و پاراستنی پێداون ( ئەوەی لە دنیادا هەموو خەمێکی تەنها قیامەتی بێت خوای گەورە خەم و ترسی ئەو ڕۆژەی قیامەتی لەسەر لادەبات و دنیاش بەزەلیلی دەهێنێتە بەردەستی واتە لەژیانی دنیایدا دنیای پێ دەبەخشێ ئەگەرچی خۆیشی نەیەوێت )

٣/ ئەو پیاو چاک و ساڵح و چاکەکارانە ئەوانەن کە هەمیشە سوپاسگوزاران و شەونوێژ زۆر ئەنجام دەدەن مامەڵکارانی بێ غەش و خیانەتی ناو بازاڕەکانن و وە تیجارەت و بازاڕەکان لە زیکرو یادی خوا دایاننابڕێت و لەبیریان ناباتەوە

٤/ لەو ڕۆژەدا خوای مەزن و شکۆدار کەخۆی نیشان دەدات (وەک لەبەشەکانی پێشو باسمان کرد ) دەفەرمووێت : ئێستا هەموو ئامادەبووانی ئێرە دەزانن ڕێزی تەواو ئەمڕۆ بۆ کێیە (ئەو وتەیە سێ جار دووبارەی دەکاتەوە ) پاشان دەفەرموێت: با ئەوانە هەستن کە لەدنیادا لەجێگەی نوستنەکانیان هەڵدەستان و شەونوێژیان ئەنجام ئەداو دەپاڕانەوە لە خوای خۆیان بە ترس و هیواوە ، ئەو ڕۆزیەی پێیان درابوو دەیانبەخشی ئەوانیش هەڵدەستن و فەرمانیان پێ دەکرێت بۆ بەهەشت

پاشان جاری دووەم دەفەرموێت ئێستا هەموو ئامادەبووانی ئێرە دەزانن ڕێزی تەواو ئەمڕۆ بۆ کێیە (ئەو وتەیە سێ جار دووبارەی دەکاتەوە) پاشان دەفەرموێت : با هەستن ئەوانەی بازرگانی و مامەڵەو کڕین و فرۆشتن یادی خوای لەبیرنەدەبردنەوە و نوێژەکانیان ئەنجام دەدا و زەکاتیان دەبەخشیە هەژاران و لەو ڕۆژە دەترسان کە دڵەکان تیایدا دەتۆقین و چاوان بەهەموو لایەکدا دەنواڕن لەترساندا ئەوانیش هەڵدەستن و فەرمانیان پێ دەکرێت بۆ ناو بەهەشت

پاشان سێیەم جار دەفەرمووێت : ئێستا هەموو ئامادەبووانی ئێرە دەزانن ڕێزی تەواو ئەمڕۆ بۆ کێیە (ئەو وتەیە سێ جار دووبارەی دەکاتەوە ) پاشان دەفەرموێت : باهەستن ئەو سوپاسگوزارانەی کە لە هەموو دۆخێکدا ( لەهەموو دۆخی نارەحەتی و دژواری و ناخۆشی و خۆشیدا ) سوپاسی خوایان دەکرد، (واتە ڕازی بوون بە هەموو ئەوانەی کە خوای گەورە هێناویەتیە ڕێیان و هەمیشە سوپاسگوزاربوون نەک بۆڵەبۆڵکەرو ناشوکرو ناڕازی بووبێتن )

ئەوانیش هەڵدەستن و فەرمانیان پێدەکرێت بۆناو بەهەشت

**تێبینی** / وشەی پیاو چاک هەر پیاو ناگرێتەوە بەڵکو ئافرەتیش دەگرێتەوە

پۆشاکە جوان و پڕ بەهاکان لە پێشانگاکانی گۆڕەپانی مەحشەردا !

**دووەم:** هەموو ئەوانەی خاڵەکانی پێشتریان تیایە و وە زۆرێک لە خەڵکان کە چەند جۆرێک کردەوەی ئاسان هەیە ئەنجامیان داوە بەهۆی ئەو کردەوانەوە پۆشاکی باوەڕو ڕێزو سوندوسیان لەبەردەکرێت هەر بە هەستانەوەیان لەگۆڕەکانیان

ئەوانە کێن ؟

١/ هەر باوەڕدارێک دڵنەوایی برایەکی بداتەوە کە توشی موسیبەتێک بووە ئەو کەسە خوای گەورە لە پۆشاکەکانی ڕێزی بەبەردا دەکات هەر بەزیندووبوونەوەی لە ڕۆژی قیامەتدا

٢/ئەو کەسانەی وازیان لە جل و پۆشاکی گرانبەها هێناوە لەکاتێکدا زۆر ئارەزوویان لێ بووەو توانای کڕینیشیان هەبووە ئەویش لەبەر خۆ بەکەم زانینیان بۆخوا نەیانپۆشیوە ئەو کەسانە خوای گەورە لە ڕۆژی قیامەتدا لە پێش چاوی هەموو زیندەوەران بانگ دەکرێت تا بەویستی خۆی هەڵبژێرێت لە بەرگ و پۆشاکەکانی باوەڕ ئەوەی کە خۆی بیەوێت تا بەبەری خۆیدا بکات

( بەزمانی ئەمڕۆمان ئەو کەسانە ناوییان تۆمارکراوە بەو مەرجانە کە باسکرا و لەوێ لەو گۆڕەپانەی مەحشەرەدا پێشانگایەک لە پۆشاکی باوەڕ ئامادەکراوە و بانگ دەکرێت و بەویستی خۆی پۆشاکێک هەڵدەبژێرێ و لەبەری دەکات )

٣/ ئەو کەسانەی کفنیان بۆ کەسێکی مسوڵمان کردووە تەنها لەپێناوی ڕەزامەندی پەروەردگاردا ئەوانە لە ڕۆژی قیامەتدا لە سوندوس و ئاوریشم (حەریر)ی بەهەشتی بەبەردا دەکرێت

٤/باوەردار لە ڕۆژی قیامەتدا کاتێک گۆڕەکەی درزئەبات بەسەریەوە و لە گۆڕەکەی دێتە دەرەوە قورئان وەک پیاوێکی ماندوو پێی دەگات و دەڵێت من دەناسی ؟ بڕوادارەکەش دەڵێت : نەخێر ناتناسم ، دەڵێت : من قورئانی هاوڕێی تۆم کە لە ڕۆژە

گەرمەکاندا تینوم کردیت و هەموو بازرگانێک بەدوای بازرگانیەکەی خۆیەتی ئەمڕۆش تۆ دەگەیت بەهەموو بازرگانیەکەت ، پاشان موڵک دەدرێتە دەستی ڕاستی و مانەوەی هەتاهەتایی دەدرێتە دەستی چەپی و تاجی بەهاو هاوسەنگی دەکرێتە سەری ، باوک و دایکی ئەو کەسەش دوو پۆشاکیان دەدرێتێ کە هەموو پۆشاکەکانی خەڵکانی دنیا ناگاتە بەهای ئەو دوو پۆشاکە ، وە ئەو دایک و باوکە دەڵێن : ئەم پۆشاکەمان لەبەرچی دەست کەوت ؟ پێیان دەوترێ لەبەرئەوەی کە منداڵەکەتان فێری قورئان کرد .

**تێبینی** / ئەم کەسە کە قورئان لەشێوەی مرۆڤێکا دێتە لای ، قورئان چاوەڕێ دەکات تا لە گۆڕەکەی دێتەدەرەوە و هەڵدەستێت و دەست بەجێ دوای تەعاروفەکەیان ئەو دوو شەهادەیەی دەدرێتێ کە باسکرا و دایک و باوکیشیان خەڵات دەکرێن

سێبەرە تایبەتیەکان لە گۆڕەپانی مەحشەردا

**سێیەم** : هەندێک لەوانە لەو گەرما توندەی ڕۆژی قیامەتدا کە تیایدا تاوانباران و کافران دەتوێنەوە لە عارەقی خۆیاندا (بەهۆی نزیکی خۆر لەسەر سەریانەوە) لەبەرامبەردا ئەو باوەڕدارە چاکەکارانە سێبەری تایبەتیان پێ دەبەخشرێ و لەژێر سێبەری عەرشدا دەبن و گەرمایان نابێت کە لەو ڕۆژەدا هیچ سێبەرێک نیە سێبەری عەرش و ( سێبەرە تایبەتیەکان ) نەبێت ، ئەوانەش :

**١/** کاتێک ئەبینی مرۆڤێک زیندوو دەکرێتەوەو لە گۆڕەکەی دێتە دەرەوە ئەم مرۆڤە ڕێزێکی زۆر تایبەتی لێ دەگیرێت و بانگ دەکرێت بۆ ئەوەی ببرێتە شوێن و پلەیەکی گەورەو گەرمای خۆر کاری لێ نەکات دەبرێتە ژێر سێبەری عەرش ئەو مرۆڤە کێیە ؟ ئەو مرۆڤە بریتیە لە سەرکردەیەک یان سەرۆکێک کە لە دنیادا زۆر دادپەروەر بووە و خەڵکانی ژێردەستی بەبەرنامەی خوای گەورە بەڕێوە بردووە و بەوپەڕی دادپەروەری سەرپەرشتی کردوون و ژیانی بۆ دابینکردوون بەرنامەی پەروەردگاری بەسەردا جێبەجێ کردوون ، نمونەی ئەم مرۆڤە دادپەروەرانە کە لە دنیادا سەرکردە بوون لەو ڕۆژە بەوشێوەیە ڕێزیان لێدەگیرێت

**٢/** لەو ڕۆژەدا کە مرۆڤێک زیندوو دەکرێتەوە ئەو پلەیەی پێ دەبەخشرێت کە ببرێتە ژێر سێبەری عەرشەوە تا لە توندی گەرماکەی ڕۆژی قیامەت دوور بێت

ئەویش بریتیە لە گەنجێک کە زۆر بەدڵسۆزی و تەنها لە پێناوی خوادا هەموو تەمەنی گەنجێتی خۆی لە فێربوون و گەیاندن و پەرستنی پەروەردگاردا تەرخان کردبێت نوێژەکانی زۆر خۆشویستووە و بەردەوام چاودێری کاتەکانی کردووە بۆ ئەنجامدانی نوێژەکان هەروەها ئەم گەنجە نوێژەکانی بەجەماعەت لە مزگەوت ئەنجام داوەو ئەهلی مزگەوت و جومعەو جەماعەتەکان بووە و( بەتایبەتی نوێژی عیشاو بەیانی ) نمونەی ئەم مرۆڤانە لە ڕۆژی قیامەتدا بانگیان لێدەکرێت و ڕێزێکی گەورەیان لێدەگیرێت دەبرێنە مەقامێکی گەورەوە ئەویش ژێر عەرشی پەروەرێنە ، بیهێنە پێش چاوی خۆت لەو ڕۆژەدا ملیارەها مرۆڤ لەژێر توندی گەرمای خۆردا ئازار دەچێژن و دەتوێنەوەو سەرلەنوێ لاشەیان بۆ دروست دەبێتەوە بەڵام تۆ کە ئەهلی ئیسلام و دین و مزگەوت بوویت هەنگاوت نا بۆ فێربوونی دینەکەت ئەوا ئەو ڕێزە گەورەیەت لێ دەگیرێ و لەو هەموو ناڕەحەتیە بەدوور دەبیت

( کارەکەش زۆر ئاسانە ببە بە ئەهلی مزگەوت و نوێژەکانت بەدڵسۆزی و بۆ خوا بەجەماعەت ئەنجام بدە ئەو ڕێزو پێگە گەورەیەت پێ دەبەخشرێت )

٣/ مرۆڤێک دەبینی لە گۆڕەکەی زیندوو دەبێتەوەو هەڵدەستێتەوە ئەم مرۆڤە بانگی لێدەکرێت بۆ سێبەری ژێر عەرش وە کارێکی زۆر ئاسانی ئەنجام داوە ئەویش تەنها ئەوەبووە زۆر دڵسۆز بووەو یەقین و ئیمانی تەواوەتی بەخوای گەورە بووە بەجۆرێک ئەم مرۆڤە کاتێک بەتەنها بووە یان لە چۆڵەوانیەکدا بووە الله تعالی ی لەبیر بووە کە زیکرو یادی کردووەو بیری لەگەورەیی خوای گەورەو دروستکراوەکانی کردۆتەوە فرمێسک بەچاوەکانی هاتۆتە خوارەوە ( ئا ئەمەیە دڵسۆزی بۆ ئەو خوایەی کە دروستی کردیت و ڕێزی لێنایت و ئەو هەموو جوانی و نیعمەتانەی پێ بەخشیت فێری زۆرترین زانست و زانیاریەکانی کردیت ) بۆیە ئەو مرۆڤانەی کە لە چۆڵەوانیشدا گەورەیی و شکۆی خوایان لەبیرەو چاوەکانیان لە ئاستی شکۆی پەروەردگاریان خۆیان ناگرن و ڕووباری فرمێسک دەڕژێنن لەو ڕۆژەدا بەتایبەت بانگیان لێدەکرێت بۆ مەقام و پێگەیەکی زۆر گەورە کە ئەویش سێبەری ژێر عەرشی الله تعالی یە

٤/ لەو ڕۆژەدا باوەڕدارانێک کاتێک زیندوو دەکرێنەوە بانگیان لێدەکرێت بۆ بەخشینی هەمان پێگەو مەقام و دووربوون لە گەرماو ناڕەحەتی ئەو ڕۆژە

سەختە ئەوانیش ئەو کەسانەن کە خۆشەویستی موحیبەتی ماڵەکانی پەروەردگار ( مزگەوتەکان) لەدڵەکانیانا جێگیربووە بەجۆرێک بوون بۆ هەموو نوێژێک حەزیان کردووە بگەنە ماڵەکانی خواو تا سوجدەو ڕکوع بۆ ئەو زاتە شکۆدارە بەرن کە ئەم هەموو گەردوون و ئاسمانانەی لە نەبوونەوە هێنایە بوون ، ئەم کەسانە دڵیان وابەستەیە بە مزگەوتەوە ، وە خۆشەویسترین شوێن لای پەروەردگار بریتیە لە مزگەوتەکان واتە ماڵەکانی خۆی

ئەی ئەبێ پاداشتی تۆی مرۆڤ چۆن بێت کە خۆشەویسترین شوێن لەلات ماڵەکانی خوای گەورە بێت و سەری سوجدەو ڕێز نەوی بکەیت تیایدا بۆ خالق و بەدیهێنەر !!!

٥ / دوو پیاو (یان دوو ئافرەت) کە یەکیان خۆش ویستووە تەنها لە پێناوی خوای گەورەدا ئەم دوو پیاوچاکە ڕێزیان لێدەگیرێ و دەبرێنە ژێر سێبەری عەرشەوە

( لەبەشی پێشودا بەوردەکاریەوە ئەم خاڵە باسکرا )

٦/ لەو ڕۆژەدا پیاوانێک هەن کاتێک زیندوودەکرێنەوە دەبرێنە ژێر سێبەری عەرشەوە ئەم کەسانە ئەوەنە موتەقی بوون کاتێک لە ژیانی دنیایاندا ئافرەتانێکی خاوەن پلەو پایەو جوانی بانگیان لێکردوون بۆ ئەنجامدانی کاری (داوێن پیسی) ڕەتیان کردۆتەوەو بە ئافرەتەکانیان وتووە من کاری وا ئەنجام نادەم من دەترسم لە پەروەردگاری هەموو جیهانیان ، ئەم پیاوانە پەروەردگار ڕێزێکی بێ پایانیان لێ دەگرێت و دەبرێنە ژێر سێبەری عەرشەوە

٧/ لەو ڕۆژەدا مرۆڤانێک هەر بەهەستانەوەیان لە گۆڕەکانیان بانگیان لێدەکرێت بۆ ژێر سێبەری عەرش بەهۆی ئەوەی هێندە بەخشندەبوون ئامادەبوون لە پێناوی پەروەردگاردا دڵی خەڵکان خۆش بکەن بە بەخشینەکانیان (لێرەدا مەرجێک هەیە بۆ ئەم جۆری بەخشینە) ئەم مرۆڤە بەخشندانە سیفەتێکیان هەیە کاتێک بەخشیویانە تەنها لەپێناوی خوای گەورەدا بەخشیویانەو کاتێک بەدەستی ڕاست بەخشیویانە نەیانهێشتووە دەستی چەپیان پێی بزانێت ( مەبەست لەوەیە بەخشندەی نهێنی بوون تەنها خۆیان و خوایان ئاگاداری بەخشینەکە بوون )

٨/ لەو ڕۆژەدا کەسانێک زیندوو دەبنەوەو دەبرێنە ژێر سێبەری عەرشی پەروەردگارەوە بەهۆی ئەوەی لە دنیادا یارمەتی دەستکورتەکانیان داوەو چاوپۆشیان

لە چەند بەشێکی قەرزەکانیان کردووەو بەسەریانەوە لایانبردووە ، نمونەی ئەم مرۆڤە چاکەکارانە دەبرێنە ژێر ئەو مەقام و پێگە بڵندەوە کە ژێر عەرشی پەروەردگارەو لەژێر سێبەرەکەیدا دەحەوێنەوە لەکاتێکا خەڵکان لە ناڕەحەتی و ئازاردان

٩/ لەو ڕۆژەدا پیاوانێک و ئافرەتانێک زیندوو دەکرێنەوەو دەبرێنە ژێر سێبەری عەرشی خوای گەورە چونکە ژیانیان بەوپەڕی (پڕ لە ڕێزو ئەدەب و پڕ لە زانایی و لەسەرخۆیی و بێدەنگی و پڕ لە حیکمەتەوە) بەسەر بردووە بێ بەڵگەی زانستی قسەیان نەکردووە وە ئەمانە کاتێک دواون و هاتوونەتە قسە کە قسەکانیان پڕ لە بەڵگەو زانست و پڕ لە حیکمەت بووە

**تێبینی**/ ئەمانەی سەرەوە کە باسکران لەژێر سێبەری عەرشدا دەبن

پاشان لەو ڕۆژەدا هەندێک سێبەری تایبەتی هەیە بۆ هەندێک لە باوەڕداران کە بەهۆی هەندێ کردەوەی تایبەتەوە ئەو سێبەرانەیان پێ دەبەخشرێت و لەژێریاندا دەبن تا ئەوکاتەی دادگایی خەڵکان یەکلایی دەبێتەوە ئەویش بریتیە لە سێبەری چاکەکانیان لەشێوەی هەورێکدا یاخود پۆلێک باڵندەی زۆردا بۆیان دابیندەکرێت و بەپێی گەورەیی کردەوەکەیان سێبەرەکانیان گەورە دەبێت ، ئەوانەش :

١/ ئەو کەسانەن کە خێرخواز و بەخشندە بوون ئەگەر هاتوو شمولی ژێر سێبەری عەرشی پەروەردگار نەبوون

(بەهۆی ئیشکالێک لەنیەتیان یاخود بەهۆی کەمێک ڕەزیلی لە خێرەکانیان شمولی سێبەری عەرش نەکەن لەکاتێکا توانای زۆریان هەبووە والله اعلم )

ئەوانە بەپێی ئەندازەی خێرو چاکەکانیان هەورێکیان بۆ دابین دەکرێت و سێبەریان بۆ دەکات لەو ڕۆژە گەرمەدا

**تێبینی** / نیەت و یەقینی خێرکردن گرنگترە لە زۆری و بۆری خێرکردن واتە تۆ هەوڵدە کە بەمێشکتا هات شتێک ببەخشیت ئەوا یەکسەر بەخۆت بڵێ من تەنها لەپێناوی خوای گەورەدا دەیبەخشم ئەگەرچی توانای داراییت کەمیش بێت

**تێبینی** / هەموو کەسێک بەئەندازەی نیەتەکەی و بەگوێرەی توانای دارایی خۆی پاداشتی دەکرێت و لەو ڕۆژەدا سێبەری عەرش یان سێبەری هەوری پێ

دەبەخشرێت واتە ئەوەی گرنگە نیەتەکەو تەوەکول و یەقینەکەیە بەخوای گەورە لەکاتی بەخشینەکەدا بەنمونە لەوانەیە دەوڵەمەندێک هەبێت زۆر ببەخشێت بەڵام سێبەری عەرشی پێ نەبەخشرێت و فەقیر هەیە کەمێکی بەخشیوە بەڵام دەبرێتە ژێر سێبەری عەرشی خوای گەورە ، کەواتە دەوڵەمەندی پلە بەرزناکات بەڵکو کردەوەی پڕ لە ئیخلاس و تەنها بۆ خوا و دوور لە ڕیاو ناو و ناوبانگ ئەو پلەو پێگەیانەت لەسەری پێ دەبەخشرێت

٢/ کەسانێک لەو ڕۆژەدا سێبەر بەسەریانەوە دروست دەکرێت بەهۆی ئەوەی لە دنیادا بوون بە سێبەر بۆ ئەو کەسانەی کە موجاهید بوون ( واتە تێکۆشەر بوون لەپێناوی گەیاندنی دینی خوای گەورەدا ) و بەرنامەی خوای گەورەیان دەگەیاند بەخەڵکی لەهەموو ڕوویەکەوە ، ئەم کەسانە ئەو سێبەرەیان پێ دەبەخشرێت چونکە نەیانهێشتووە بانگخوازو زاناکان و تێکۆشەرانی ئەم دینە مەشغوڵ بن بە دنیاوەو لە خەمی بەدەستهێنانی دنیادا بن تەنها لەپێناوی ئەوەی کە بانگەوازەکانیان بەردەوام بێت بۆ خەڵکان

ئەم جۆرە کەسانە کە بوون بە سێبەر بۆ تێکۆشەران و زانایان و بانگخوازانی ئەم دینە ئەو پلەو مەقامەیان پێ دەبەخشرێت ( وە بەپێی نیەتەکانیشیان لەوانەیە بکرێنە ژێر سێبەری عەرشی خوای گەورەوە )

ئەم کەسانە لەو ڕۆژەدا هەمان ئەجری بانگخوازان و زانایانیان بۆ دەنوسرێ و تۆمار دەکرێت

٣/ لەو ڕۆژەدا هەندێک پیاوان و ئافرەتان هەن کە زیندوو دەبنەوە چەند پەڵە هەورێک دەبن بە سێبەر بەسەر سەریانەوەو لە ناڕەحەتی و توندی گەرمای ئەو ڕۆژە سەختە بەدووریان دەکەن و دەیانپارێزن ئەوانیش ئەو کەسانەن کە سورەتەکانی ( البقرەو ال العمران ) یان لەبەرکردووەو جێبەجێیان کردووەو کردەوەکانیان پێ ئەنجام داوە ، ئەم دوو سورەتە لەشێوەی دوو پەڵە هەوری گەورەدا دێن و دەبنە سێبەر بەسەر خاوەنەکانیانەوە

بۆ کەسانێکی تر لەشێوەی پۆلە باڵندەیەکی زۆر دێن و سێبەر دروست دەکەن بەسەر خاوەنەکانیانەوە

کورسیە ئاڵتوونیەکان و مینبەرە مرواریەکانی لای ڕاستی عەرش !

**چوارەم:** هەندێک لەوانە کە زیندوو دەبنەوە فریشتەکان دێن بۆلایان و هێندە پلەیان گەورەیە کورسی ئاڵتوون و مینبەری مرواریان پێ دەبەخشرێ و لەلای ڕاستی عەرشەوە دانیشتوون لەسەری ، ئەوانەش :

١/ هەندێک پێشەوا و سەرکردە دادپەروەرەکان و قازی و حاکمە دادپەروەرەکان لەو ڕۆژی قیامەتەدا کە زیندوو دەکرێنەوە فریشتە بەتایبەت دێن بۆلایان و پێشوازیان لێ دەکەن بۆ ڕۆیشتن بەرەو لای عەرش و لەوێ کورسی و مینبەری نورینیان بۆ ئامادەکراوە بەڕێزەوە بەڕێیان دەکەن بۆ دانیشتن لەسەریان . بۆچی؟

چونکە ئەم سەرکردەو پێشەواو قازی و حاکمانە بە کتابی پەروەردگار (قورئان) حوکمیان داوە بەسەر خەڵکان و ژێردەستەکانیان وە بەوپەڕی دادپەروەریەوە حەقیان داوە بە ژێردەستەکان و مافیان بۆ گەڕاندوونەتەوە بەبێ خیانەت بۆیە بەهۆی ئەو دڵسۆزی و حوکم کردنە بە کتاب و بەرنامەی پەروەردگار بەیەکسانی و دادپەروەری بەسەر خەڵکاندا هێندە ڕێزیان لێدەگیرێت کە لەلای عەرشەوە لەسەری کورسی و مینبەری ئاڵتوون دائەنیشێنرێن لەکاتێکا ڕاوەستاوانی گۆڕەپانی مەحشەر لەوپەری ناڕەحەتی و گەرماو سزادان

٢/ لەو ڕۆژەدا باوەڕداری وا هەیە هێندە پلەی بەرزە واتە ئیمان و باوەڕەکەی لە دنیادا هێندە پتەو بەهێز بووە بە الله جل جلالە وە زۆر موتەقی بووە خوای گەورە ڕێزی گەورەی لێ دەنێت لەسەر کورسی ئاڵتونی دائەنیشێنرێ و هەوریش سێبەر دەکات بەسەریەوە لەکاتێکا کافران لە مەحشەردا عارەق تا لوت و قورگی گرتۆتەوە

٣/ کەسانێک کە زیندوو دەکرێنەوە ڕوخساریان پڕ لە نورەو هێندە ڕێزلێگیراون بەرەو کورسی و مینبەرە نورینەکانی لای عەرش بەڕێدەکرێن و پێشوازیان لێدەکرێت بۆ دانیشتن لەسەریان ئەم جۆرە کەسانە ئەوانەن کە لەبەر خوا یەکتریان خۆش ویستووەو لە قەوم و هۆزی جیاجیابوون و سەردانی یەکیان کردووە تەنها لەپێناوی خوای گەورەدا و ئەوەی ئەمانەی کۆکردۆتەوە تەنها خۆشەویستیان بۆ ئیسلام و دینی خوای گەورە بووە . لەو ڕۆژەدا ئەمانە پێغەمبەران و شەهیدان خۆزگەیان پێ دەخوازن کە دەیانبینن ئەو ڕێزە گەورەیەیان لێ دەگیرێ و لەسەر ئەو مینبەرە ئاڵتون

و نورینانەی لای عەرشەوە دادەنیشێنرێن چونکە ئەمانە ساڵحان و پیاوچاکانی خوای گەورەن لە ئومەتاندا ، سیفەتی ئەمانە ئەوەیە خەڵکان لەدنیادا هەر بەبینینیان یەکسەر خواو دینی خوایان بەبیردێتەوە ، ئەو پیاوچاکانە لەوڕۆژەدا ناترسن لەکاتێکا خەڵکان و زیندەوەران هەموو لەترسی ئەو ڕۆژە چاوەکانیان ئەبڵەق بووە

یاڕەبی لەوانەبین کە خەڵکان بەبینینمان خواو دینی خوایان بەبیربێتەوە

٤/ لەو ڕۆژەدا باوەڕدارانێک زیندوو دەکرێنەوە کە تەنها لەپێناوی دینی خوای گەورەدا کۆچیان کردووە و تەنها لەپێناوی سەرخستنی دینی پەروەردگار و پێغەمبەرەکەی (ﷺ) ( کۆچکارەکانی سەردەمی پێغەمبەری خوا)

ئەمانە لەو ڕۆژەدا مینبەری نوریان بۆ دابین کراوەو لەسەری دادەنیشن و ئارام و هێورن و دوورن لەترس و تۆقینی ئەو ڕۆژە سەختە

ئێدە با لەئێستاوە هەموو بڕیاربدەین ببینە نمونەی یەکێک لەمانە و زۆر ئاسانە تەنها با نیەتمان بۆ خوا ساغ بکەینەوە و با بڕیاربدەین کە ببینە خزمەتکاری دینەکەی ، ئەبێ لەوە خۆشتر هەبێ لەو ڕۆژە سەختەدا کە خەڵکان هەموو لە ئازارو نارەحەتی عارەق و گەرمای زۆردان بەڵام تۆ ئاوا ڕێزێت لێ گیراوە و نور بە ڕوخسارت بەخشراوە و جل و پۆشاکی تایبەتت لەبەهەشتەوە بۆ هاتووە و پێت بەخشراوەو پۆشیوتە و لەسەر مینبەری نورین و کورسی ئاڵتوونی پێشوازیت لێ کراوە و دانیشێنراوی ! ، ئێدە هەر شتێک کە خۆت لەدڵەوە هەستی پێ ئەکەیت خوای گەورە پێی ڕازی نیە لێی دووربکەوەرەوەو وازی لێبێنە وخۆت یەکلایی بکەرەوە بۆ پەروەردگار ، خۆت فێری تەوحید و ئیسلام بکە خۆت فێری قورئان بکە

ببە بە ئەهلی مزگەوت و ببە بەسوارچاکێک کە خزمەت بەدینەکەی بکەیت و خەڵکی بۆ بانگ بکەیت ، ئەگەر ئافرەتیت خۆت باڵاپۆش بکەیت و خۆت فێری ئیسلام بکەیت بۆئەوەی سبەینێ نەوەیەک پێبگەیەنیت ببێتە پیاوچاک و عالمێکی گەورەی ئەم ئیسلامە شکۆدارە ، ئیتر بەسە واز لە شتی بێ سودو بێ بایەخ و گەمەو گەپ و یاریکردن بێنە بەخوای گەورە لەو ڕۆژەدا یاری و فلیم و گۆرانی و ئەمانە ئەبنە نەگبەتی و ئازارو پەشیمانی بۆت ، خوایە ڕەحم بەهەمووما‌ن بکەیت و ئەم پلەیەمان پێ ببەخشی و ئیرادەمان بەهێز بکەیت اللهم امین .

## خەڵکانێک کە بەهیچ شێوەیەک مۆڵەتی گفتوگۆ ناکرێن !

حاڵی مسوڵمانانمان بینی بە چاک و خراپەوە هەر لە زیندوو بوونەوەیان و هەستانەوەیان لەگۆڕەکانیان تا کاتی هاتنی سەرەیان بۆ حساب و کتاب ، تیایدا ڕوونکرایەوە کە حاڵی مسوڵمانە تاوانبارەکان چۆنەو چ سزایەک ئەبینن بە گوێرەی جیاوازی تاوانەکانیان وە هەروەها حاڵی باوەڕدارە چاکەکارەکانمان بینی کە چ ڕێزو پلەو پایەیەکیان هەیە لەو ڕۆژەدا ، تا کاتی هاتنی سەرەیان بۆ حساب و کتاب

**تێبینی** / بێ باوەڕان و بێدینان و موشریکەکان ...هتد ئەوانەی کە خوای گەورەیان بەتەنها نەپەرستووەو باوەڕیان بە پێغەمبەرایەتی پێغەمبەران نەبووە (علیهم سلام) لەناویشیاندا بەتایبەتی پێغەمبەری ئیسلام (ﷺ) ، ئاو ئەو جۆرە خەڵکانە زۆر زۆر بەسەختر ئەو عەزاب و سزایەی ڕۆژی قیامەت ئەچێژن تا کاتی هێنانی تەرازوو بڕیاردان بە حەق و حساب لەو ساتەی کە تەرازوو دەهێنرێت و جەهەنەم دەهێنرێت ئا لەوێدا ئەمانە هەموو فڕێدەدرێنە ناو سجنە قوڵەکانی جەهەنەمەوە و تیایدا دەبرژێنرێن و سەرلەنوێ لاشەکانیشیان بەبەردەوامی بۆ دروست دەکرێتەوە بۆ بەردەوامبوونی سزاو ئەشکەنجە لەسەریان وە بەڕاستی ئەمانە شایەنی ئەو سزایانەو بەندینخانەو ئاگرانەی ناو دۆزەخ بوون وەک لە بەشەکانی پێشودا بەتەفاسیڵ باسمان لێوە کرد .

لەو ڕۆژەدا مرۆڤەکان یەک یەک دەهێنرێنە بەردەم پەروەردگار و هەریەکەو بە زمانی خۆی پرسیاری لێدەکرێت

لەو ڕۆژەدا پێش پرسیارکردن و ئامادەکردنی تەرازوو بۆ پێوانی کردەوەکان کۆمەڵە خەڵکانێک هەن کە خوای گەورە نایەوێ بەهیچ جۆرێک تەماشایان بکات و حساب و کتابیان بکات بەهۆی قێزەونی چەند کردەوەیەکیانەوە کە بەردەوام بوون لەسەری و تەوبەیان لێ نەکردووە !

کێن ئەوانەی کە خوای گەورە نایەوێ تەماشایان بکات و نایەوێ گفتوگۆیان لەگەڵ بکات ؟

١/ ئەوانەی کە ئایەتەکانی خوا دەشارنەوە کە دایبەزاندووە لە کتێبەکەیدا وە بە نرخێکی کەم دەیفرۆشن ئا ئەوانە ئاگر دەکەنە سکیانەوە وە سزایەکی سەختیشیان بۆ ئامادەیە

ئەوانەن کە قورئان لە تەعزێکاندا دەخوێنن پارەی پێ پەیدا دەکەن هەروەها ئەوانەی ئیسلام و قورئان دەکەنە هۆکاری بەدەستهێنانی ماڵ و سامانی دنیا

٢/ ئەوانەی سوێند بە زاتی گەورەیی الله تعالى دەخۆن بە درۆ بۆ کاری بازرگانی و کڕین و فرۆشتنی کەل و پەل ئەمانە خوای گەورە تەماشایان ناکات و گفتوگۆیان لەگەڵ ناکات وە سزایەکی سەختیان بۆ ئامادەیە

٣/ ئەوانەی جل و بەرگ و شەرواڵ و پانتۆڵەکانیان بۆ لوتبەرزی و فیزو خۆ دەرخستن و نواندن درێژ دەکەن و بەزەویدا دەیخشێنن ئەمانە خوای گەورە نایەوێ تەماشایان بکات و گفتوگۆشیان لەگەڵ ناکات

٤/ خوای گەورە لەو ڕۆژەدا تەماشای ئەو بەندەیە ناکات کە پشتی ڕێک ناکاتەوە لە نێوان ڕکوع و سوجدەکەیدا لە نوێژدا

( ئەی ئەوانەی نوێژەکانیان لەکۆڵ دەکەنەوەو بە دوو دەقە تەواوی دەکەن دەبێ حاڵیان چی بێ !!؟ )

٥/ سێ جۆر خەڵکانی تر هەن کە خوای گەورە تەماشایان ناکات و گفتوگۆیان لەگەڵ ناکات ئەوانەن کە ئازاری دایک و باوکیان داوە و ئەوەی مەی خواردۆتەوەو تەرکی نەکردووە ، وە ئەو کەسەی منەت کار بووە بەو شتانەی کە بەخشیویەتی و داویەتی بە خەڵکان

٦/ سێ جۆری تر لە خەڵکان کە گفتوگۆیان لەگەڵ ناکرێت و تەماشا ناکرێن وە سزایەکی سەختیشیان بۆ ئامادەیە بریتین لە (پیرێکی زیناکار ، سەرۆکێکی درۆزن، هەژارێکی لوتبەرزو خۆبەزلزان)

٧/ ئەو کەسانەی دەچنە لای ئافرەتان یان پیاوان لەدواوە ( نێربازی و داوێن پیسی) لەو ڕۆژەدا گفتوگۆیان لەگەڵ ناکرێت و بەکافر و بێ باوەڕ هەژمار کراون سزای سەخت و توندیان دەدرێت

٨/ خوای گەورە لە ڕۆژی قیامەتدا تەماشای ئافرەتانێک ناکات کە سوپاسی مێردەکانیان نەکردووە لەکاتێکا بێ مێردەکانیان ناژین و ناتوانن دەست بەرداریان ببن )

( مەبەست لە ئافرەتانی ناشکورن کە بەهەوڵ و ڕەنج و ماندووبوونی مێردەکانیان نەزانیوە لەبری ئەوەی سوپاسیان کردبن ناشکوریان کردووە بەبەردەوامی )

٩/ ئەو ئافرەتانەی کە خۆیان شوبهاندووە بە پیاوان و هەروەها ئەو کەسانەی ئاگادارن بە بەدڕەوشتی و داوێن پیسی کەسەکانیان و گوێی پێ نادەن ئائەمانە لەوانەن کە خوای گەورە گفتوگۆیان لەگەڵ ناکات

١٠/ سیان هەن خوای گەورە تەماشایان ناکات لەو ڕۆژەدا وە پاکیان ناکاتەوە لەتاوانەکانیان و سزایەکی سەختیان دەدات : پیاوێک کە ئاوی زیاد لە پێویستی خۆی هەیە لە ڕێگەیەکدا و لە ڕێبوار (موسافیر یان گەشتیار) ی قەدەغە کردووە ( بەنمونە کانیەک کە لەسەر ڕێگەیەکدایە کە ئەم کەسە دەستی نەبووە لە هەڵقوڵاندنیدا و کەچی ڕێی لە خەڵکان دەگرت کە ئاوی لێ بخۆنەوە یان بەپارە ئەیفرۆشتەوە) ئەم جۆرە کەسانە لەو ڕۆژەدا سزایەکی سەختیان بۆ ئامادەیە و خوای گەورە گفتوگۆیان لەگەڵ ناکات

١١/ پیاوێک پەیمانی ملکەچی دەدات بەسەرۆکێک تەنها پەیمانەکەشی لەبەر دنیایە ئەگەر پارەی پێ ببەخشێت لێی ڕازی دەبێت و ئەگەر پارەی پێ نەدات لێی بەتوڕەیە

**سەرۆك** : ئەوانەن کە حوکم بە بەرنامەی خوای گەورە دەکەن و دادپەروەرن زۆردارو زاڵم نین .

١٢/ خوای گەورە تەماشای پیاوێک ناکات کە کاڵایەک دادەنێت لەدوای عەسرو درۆ دەکات و دەڵێت ، سوێند بەو خوایەی کە هیچ خوایەک نیە تەنها ئەو نەبێت

ئەوەندەو ئەوەندەم پێ داوە ، کڕیارەکەش بەڕاستی دەزانێت و لێی دەکرێت ، ئا ئەو جۆرە فرۆشیارانە هیچ بەشێکیان بۆ نیە و سزایەکی سەختیان بۆ ئامادەیەو بەهیچ شێوەیەک پەروەردگار تەماشایان ناکات

**١٣/** ئەو کەسانەی کە بەرپرسیارەتیەکیان بەدەستەوەیە هەر لە ( سەرۆکی وڵاتەوە تا بچوکترین بەرپرس ) هەر کەسێک ببێتە سەرپەرشتیاری شتێک لە کاروباری مسوڵمانان‌دا و ئەو بەرپرسە یان سەرپەرشتیارە خۆی نیشانی گەلەکەی نەدات تا هەژاران و ئەوانەی پێویستیان پێیەتی دەنگیان بگاتە لای بۆ جێبەجێ کردنی کاروبارەکانیان ئەوا خوای گەورە خۆی نیشانی ئەو سەرپەرشتیارانە نادات لەو ڕۆژەداو پێویستیەکانیان بۆ جێبەجێ ناکات (سزای سەختیشیان دەدات )

**١٤/** ئەوانەی پۆشاکی گران بەها دەپۆشن بۆ خۆدەرخستن و فیزو تەکەبور ( پەنا بەخوای گەورە ئەمە زۆرینەی ئافرەتان و پیاوان دەگرێتەوە ) خوای گەورە ڕوویان تێناکات تا وازنەهێنن لێی

ئەم خاڵانەی تا ئێستا باسکران ئەوانەن کە خوای گەورە گفتوگۆیان لەگەڵ ناکات و تەماشایان ناکات وە سزای توندیشیان دەدات

**تێبینی** / تەوبەکردنی ڕاستەقینە (نصوح) لەم کارانە هەموو تاوانەکان دەسڕێتەوە و خوای گەورە لێی خۆش دەبێت بەمەرجێک ببیتە کەسێکی چاکەکار و بۆ خوا سوڵحاو

## کەسانێک کە بەهیچ شێوەیەک
## لەو ڕۆژەدا لێبوردن ناکرێن !

ئەوانەی خوای گەورە پێش حەق و حساب و تەرازوو لێیان نابورێت و سزای سەختی ڕۆژی قیامەتیش بۆیان ناکاتە هۆکاری سڕینەوەی تاوانەکانیان

ئەم جۆرە کەسانە ئیلا ئەبێ بە عەزابی خۆیان بگەن نە سزای جیهانی بەرزەخ نە سزای سەختی ڕۆژی قیامەت هیچیان نابنە سوککردن و کەمکردنەوەی ئەم جۆرە تاوانانە :

١/ لەئیسلامدا هەرکەسێک کەسێک بەئەنقەست بکوژێت دەکوژرێتەوە ، وە هەر کەسێک ئەو تاوانبارە داڵدە بدات و نەهێڵێت بەسزای خۆی بگەیەنرێت و تۆڵەی لێبکرێتەوە ، ئەو کەسە لەعنەتی خواو مەلائیکەتەکان و سەرجەم خەڵکانی لێ بێت، وە خوای گەورە کاری چاکەی وای لێ وەرناگرێت کە ببێتە هۆی سڕینەوەی ئەو تاوانەی یاخود خوا لێی ببورێت و بیخاتە بەهەشت !

٢/ ئەو کەسانەی زۆر ئازاری دایک و باوکیان داوە و منەتکار و ئەوانەی کە قەزاو قەدەری خوای گەورە بەدرۆ دەخەنەوە

٣/ ئەو کەسانەی کە بەتایبەت ئاژاوە دەخەنە شاری مەدینەی پێغەمبەری خواوە (ﷺ) یان ئەو کەسەی ئاژاوەچیەک داڵدە بدات ئەو کەسە نەفرینی خواو مەلائیکەتان و سەرجەم خەڵکانیان لێبێت وە خوای گەورە لە ڕۆژی قیامەتدا نایانبەخشێت وە هیچ چاکەیەکیشیان لێ وەرناگرێت و هیچ کارێکیش ناکاتە هۆکاری سڕینەوەی تاوانەکانیان

**ئاژاوەچیەکان** : تاقم و کۆمەڵە گومڕاکەرەکانن کە هەموو ئاژاوەیەک دەنێنەوە و ئیتر لەهەر وڵاتێکی مسوڵمانانداا بن

ئەو کەسانەش کە خۆیان لە باوکیان بەری دەکەن یان سەربە کەسانێکن و خۆیان بەری دەکەن لێیان ئەوانە بەهەمان شێوە نەفرینیان لێدەکرێت و هیچ

چاکەیەکیان نابێتە هۆکاری سڕینەوەی ئەم تاوانی خۆ بەری کردنە لە باوک یان دایکیان یان کەسەکانیان

٤/ هەر سەرکردەو دەسەڵاتدارێکی مسوڵمان لەو ڕۆژەدا نەفرینی خواو مەلائیکەتەکان و خەڵکانیان لێدەکرێت ئەگەر هاتوو کە (ستەمکار و زاڵم بوو) ئەوانە لە دنیادا کاتێک داوای دادپەروەریان لێکرا نەیانکرد ، بەڵێنیان دا و جێبەجێیان نەکرد ، داوای بەزەییان لێکرا و بەبەزەیی نەبوون بۆ خەڵکان ، ئەمانە هیچ کارێکیان لێ وەرناگیرێت هیچ کارێکیش ناکرێتە هۆکاری سڕینەوەی گوناهەکانیان .

**تێبینی** / هەر کەسێک ئەم خاڵانەی تیابوو وە ئەگەر تەوبەی ڕاستەقینەی کردو بووە کەسێکی چاکەکار و بۆ خوا ویست ئەوا خوای گەورە لێی خۆش دەبێت و تەوبەکەی لێ وەردەگرێت

خـراپترینی خـــەڵکـان !!!

هێشتا تەرازوو نەهێنراوە و لێپێچینەوە دەستی پێ نەکردووە و لەبەشەکانی پێشوودا باسی حاڵی خەڵکان کرا بە چاک و خراپەوە بە باوەڕدارو بێ باوەڕەوە

لێرەدا بەوردی باسی خراپترین خەڵکان دەکەین لە باوەڕداران و بێ باوەڕان لەو ڕۆژەدا کە کێن و کردەوەکانیان چی بووە وا بوونەتە خراپترینی خەڵکان لەو گۆڕەپانەی مەحشەردا ، ئەوانەش :

١/خراپترینی خەڵکان لەو ڕۆژەدا لای خوای گەورە پیاوێکە دەچێتە لای خێزانەکەی و لەگەڵ یەکدا دەبن ( سەرجێی دەکەن ) پاشان نهێنیەکەی بڵاودەکاتەوە لای هاوڕێکانی

٢/ خراپترینی خەڵکان لەو ڕۆژەدا کەسانێک بوون کاتێک پیاوچاکێک لەناویان بمردایە مزگەوتێکان بەسەر گۆڕەکەیەوە دروست دەکرد پاشان وێنەیان تیادەکێشا ئەوانە خراپترینی خەڵکانن لای خوای گەورە لە ڕۆژی کۆتاییدا

٣/ خراپترینی خەڵکان دووڕووەکانن لەو ڕۆژەدا ، ئەوانەی کە لەگەڵ باوەڕداراندا خۆیان بە باوەڕدار و مسوڵمان نیشان ئەدا و لە پشتەوە خیانەتیان لێ دەکردن و بەگرتن و کوشتن و زیندانی کردنیان ئەدان

٤/ خراپترینی خەڵكان ئەوانەن كە خەڵكی تر لەتاو خراپی و دەم و زمان و ناخ پیسیان خۆیان بەدوور لێگرتوون و دووركەوتوونەتەوەو لێیان جێیان هێشتوون

٥/ خراپترینی كەسان لە ئومەتی محمد (ﷺ) نیعمەت گوزارانن كە بێ دڵی خۆیان ناكەن و لەهەموو خۆراكێك دەخۆن و هەموو جۆرە جل و پۆشاكێك لەبەردەكەن و بە فیزو تەكەبورو خۆ بەزلزانینەوە دەدوێن و گاڵتە بەخەڵكان دەكەن ئەوانە خراپترینی كەسانی ئومەتن .

**تێبینی** / بەداخەوە زۆرێك هەیە هەر بۆ پۆز دەچێتە ڕێستۆرانت و سناپی خواردن دەكات و بڵاوی دەكاتەوە یان كە دەیدوێنی زمانی بادەدات و بەفیزو تەكەبورەوە دەدوێت ئیتر حساب بۆ كەسانی هەژار ناكات كە توانای چوونە ڕێستۆرانتی نیە یان توانای كرینی ئەو جل و پۆشاكانەی نیە كە ئەم بۆ فیزو تەكەبور دەیپۆشێ ، یان بەپێی (مۆدێل و ڕەنگ) پێڵاو و جل و بەرگی ڕیز كردووە كە لەوانەیە بەساڵی جارێكیش نەیانپۆشێت ئەوانە خراپترینی ئومەتن لەو ڕۆژەدا .

٦/ خراپترین كەسان لەو ڕۆژەدا ئەوانەن كە چەنەبازو بەفیز و خۆبەزلزانن ئەوانەی زۆربڵێن و دەمیان پڕدەكەن لە هەواو و فو دەكەن بۆئەوەی قسەكانیان زل و ڕەوانبێژو ڕازاوەتر بێت لەدەربڕیندا (زۆرێك بەناو ڕۆشنبیری ئەمڕۆ) لەوانەن كە زۆر بە خۆبەزلزانینەوە دەدوێن ، وە هەروەها ئەوانەش كە زۆرترین قسەی نابەجێی و ناڕەوا دەكەن

٧/ خراپترینی خەڵكان ئەوانەن كە سواڵ دەكەن و دەڵێن لەبەر خوا یارمەتیەكم بدەن (پێویستیشی نیە) ئەمە یەكەمیانە ، وە دووەمیشیان ئەو كەسەیە كە ئەمەی پێ وترا هیچی پێ نەبەخشێت لەكاتێكا ناوی خوای لەسەر هێنرا

٨/ خراپترینی خەڵكان ئەوانەن لەو ڕۆژەدا كە نەفرینیان لێكراوە چونكە ستەمكار بوون و ڕێگریان لە ئاینی خوای گەورە كردووە و ناشرینیان كردووە لە پێش چاوی خەڵكدا و گومڕایان كردوون

( وەك هەندێك بێدین كە لەژێر ناوی ئیسلامەوە بەناوی ڕیفۆرم و نوێخوازیەوە لەسەر شاشەكانەوە لە ئیسلام دەدەن )

٩/ گەورەترین تاوانبارو خراپترینی خەڵكان لەو ڕۆژەدا كە لە هەموو ئەوانەی باسكرا خراپترن لای خوای گەورە ئەوانەن كەسێكیان توشی لەناوچوون كردووە ئەوانەی كە برایانی خۆیان بەگرت داوە لای پێشەواكانیان بەم كارەش خۆیان و برایانی خۆیان و پێشەواكانیان توشی لەناو چوون كردووە لە دنیادا وە لە قیامەتیشدا خۆیان و پێشەواكانیان توشی لەناوچوون كردووە

( ئەمانە لە دنیادا خەڵكانیان توشی ئازارو مەینەتی و بەندینخانە كردووە )

**ئایا لەو ڕۆژە گەرمەدا مسوڵمان هەیە ڕێزی ئەوەی پێدرابێت نزیكی پێغەمبەری خوا (ﷺ) بێت و لەنزیكیەوە وەستا بێت و چاوەڕێی حساب و كتابی بكات ؟**

١/ ئەوانەی ئەو ڕۆژە لەو گۆڕەپانەی مەحشەردا كەنزیكی پێغەمبەری خوان (ﷺ)كە زۆرترین سڵاواتیان داوە بەتایبەت لەڕۆژی جومعەدا چونكە پێغەمبەری نازدار (ﷺ) خۆی دەفەرموێت سڵاواتی ئومەتەكەمم لە جومعاندا نیشانم دەدرێت كێ زۆرترین سڵاواتی دابێت ئەو كەسە لەهەموویان زیاتر جێگەكەی لەقیامەتدا لەمنەوە نزیكترە

٢/ خۆشەویسترین كەس و نزیكترین كەس لە كۆڕی پێغەمبەری خوا (ﷺ) لەو ڕۆژەدا ئەوانەن كە زۆر بەڕێز و بەئەدەبن و جوانترین خوڕەوشتیان هەیە ، دوورترینیشیان لە پێغەمبەری خواوە ئەوانەن كە زۆر چەنەبازو بێ ڕێزن ئەوانەی قسەی پوچ و بەتاڵ دەكەن و خوای گەورە پێی ڕازی نیە هەروەها ئەوانەی بەفیزو تەكەبورو لوتبەرزیەوە دەدوێن و قسە دەكەن

٣/ نزیكترین كەسان لە پێغەمبەری خواوە (ﷺ) ئەوانەن كە لەسەر هەمان بەرنامەو پڕۆگرامی ( قورئان و سونەت )ی پێغەمبەری خوا بوون تا لەدنیا دەرچوون و لایان نەداوە لێی وەك ئەو زەمەنەی كە خودی پێغەمبەری خوای لەسەر بووە ( واتە هیچ شتێكیان زیادو كەم نەكردووە لەدیندا )

٤/ پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەفەرمێ من و ئافرەتێكی پیری لێو سوور لە ڕۆژی كۆتاییدا ئاوها لە نزیك یەكین و ئیشارەتی كرد بە هەردوو پەنجەی شایەتمان لەگەڵ پەنجەی ناوەڕاستدا ، ئەوەش ئافرەتێكی خاوەنی جوانی و پلەو پایە بووە لەدوای

مردنی مێردەکەی شوی نەکردۆتەوە و خۆی تەرخانکردووە بۆ خزمەتکردنی منداڵە بێ باوکەکانی تا منداڵەکان گەورەبوون و جیابوونەتەوە یاخود مردوون ( لەپێناوی ئەوەی مناڵەکانی سەرەڕۆو بێ کەس نەبن )

**تێبینی** / ئەم خاڵە مانای ئەوە ناگەیەنێت کە ئافرەت مافی شوکردنەوەی نەبێت دوای وەفاتی مێردەکەی بەڵکو مافی شوکردنەوەی هەیە بەڵام ئەو پێگەیەی پێنادرێت لە ڕۆژی قیامەتدا کە لە نزیکی پێغەمبەری خوابێت والله اعلم

٥/ بازرگانی متمانە پێکراو و (خیانەت نەکار)ی ڕاستگۆو دڵسۆزی مسوڵمان لەو ڕۆژەدا لەگەڵ پێغەمبەران و ساڵحان و شەهیدەکاندا دەبێت

٦/ پێغەمبەری خوا (ﷺ)بە فاتیمەی کچی فەرموو من و تۆو ئەو کەسەی لە جێگاکەیدا پاڵکەوتووە ( مەبەست لە ئیمامی عەلی بوو ) خوای گەورە لێیان ڕازی بێت لە ڕۆژی قیامەتدا لەیەک جێگەداین

٧/ ئەو کەسەی کە خاوەنی دوو کچ یان زیاتربووە و بەجوانترین شێوە (واتە پەروەردەی ئیسلام ) پەروەردەی کردوون و گەورەی کردوون و بژێوی بۆیان دابینکردووە ئەو کەسە لە ڕۆژی کۆتاییدا لەگەڵ پێغەمبەری خوا دەبێت (ﷺ) ئیشارەتی کرد بۆ پەنجەکانی و وە بەیەکەوەی نوسانن

٨/ ئەو کەسەی پێغەمبەری خوای (ﷺ) زۆر خۆش ویستبێت لەدنیادا بەجۆرێک بەکردەوە لە خۆی و دایک و باوکی خۆشتر ویستبێت و ( لەبەرنامەو ڕێگەکەی لای نەدابێت لە خۆشەویستی بۆی )

ئەوا ئەو کەسە لە ڕۆژی قیامەتدا لەگەڵ پێغەمبەری خوا دەبێ(ﷺ)

یارب لە نزیکی پێغەمبەری خوا (ﷺ) بین لەو ڕۆژەدا کە خەڵکان لەوپەڕی سزادان بەهۆی خراپەکانیانەوە و تا قوڕقوڕاگەیان لە عارەقدایە بەڵام تۆی پەروەرێن گەورەترین ڕێز لە بەندە ڕاستەقینەکانی خۆت دەگریت لەو ڕۆژەدا یارب یەکێک بین لە بەندە ڕاستەقینەکان و چاکەکارەکان و دڵسۆزەکانی خۆت بەجۆرێک لەنزیکی پێغەمبەرە نازدارەکەت بین .

## ئەو بۆنە خۆش و تایبەتیەی دەگات بە هەندێک لە راوەستاوان !

یەکێکی تر لە تایبەتمەندیەکانی گۆڕەپانی مەحشەر ئەوەیە کە بۆنی بەهەشتی تیا دەکرێت بەڵام هەموو کەسێک ناتوانێ هەست بەبۆنی بەهەشت بکات ، بۆچی ناتوانن ؟ چونکە یەکێک لەناو ناڕەحەتی و سزای ئەو ڕۆژەدا بێت و ترس و خەم و ناڕەحەتی دایگرتبێت لەکوێ هۆش و خەیاڵی لای ئەوە دەبێت کە بۆنی بەهەشت بکات بەتایبەتی لەکاتێکا غەرقی عارەقی تاوانەکانی خۆی بووبێت بۆیە ئەو کەسانەی کە لەو ڕۆژەدا بۆنی بەهەشت دەکەن لە گۆڕەپانی مەحشەردا کەمن و کەسانێکی تایبەتن و ترسیان نیەو ڕێزلێگیراون بەهۆی چەند کردەوەیەکی تایبەتەوە ئەو بۆنە دەکەن و وە هەروەها پێویستە بزانین هۆکاری بۆن نەکردن چیە لەو ڕۆژەدا !

واتە ئەو کردەوانە چی بوون کە مسوڵمانان بەهۆیەوە ناتوانن بۆنی بەهەشت بکەن ؟

**تێبینی** / گۆڕەپانی مەحشەر گەورەیەو هەموو مەخلوقاتی تیایەو پاشان بەدوایدا دۆزەخێکی ئێجگار گەورە داندراوە کە ٤ ملیار ٩٠٠ ملیۆن فریشتەی ئێجگار گەورە ڕایانکێشاوە بۆ نزیکی مەحشەر وە لە چاڵایی دایە ٧ تەبەقە بۆ خوارەوە بەسەر ئەم دۆزەخەشدا پردی سیڕات دامەزرێندراوە خەڵکان دوای حساب و کتاب پێویستە بەسەریدا بپەڕێنەوەو پاش پردی سیڕاتیش پردێکی تر هەیە کە پێی دەڵێن پردی ( قەنتەڕە ) ئەم پردە ڕێک پێش گەیشتن بە حەوزی ئاوەکانی بەردەم دەرگاکانی بەهەشتە و لەوێوە بۆنی بەهەشت لە دووری چڵ ساڵ دەگاتە ناو زیندەوەرەکانی ساحەی مەحشەر بەڵام هەموو کەس ئەو توانایەی نادرێتێ کە بۆنی باخ و باخاتەکانی بەهەشت بکات و پێ بگات

ئیمانداران و موتەقیەکان بەپێی پلەی ئیمانیان توانای بۆنکردنی باخ و باخاتەکانی بەهەشتیان جیاوازە لەو ساحەی مەحشەرەدا بەنمونە پیاوی وا هەیە لەدووری ٧٠ ساڵ توانای هەیە بۆنی بەهەشت بکات ، پیاوی واهەیە لە دووری ١٠٠ ساڵ

دەتوانێ بۆنی بکات ، پیاوی وا هەیە لە دووری ٤٠ ساڵ بۆنی دەکات ، وە پیاوی زۆر موتەقی هەیە کە لە دووری ٥٠٠ ساڵەوە دەتوانێ بۆنی بەهەشت بکات

ئەو کەسانە کێن لەناو مسوڵمانان‌دا لەو ڕۆژەدا ناتوانن بۆنی بەهەشت بکەن ؟

١/ ئەو کەسانەی زانستێک فێربوون لەو زانستانەی کە تەنها بۆ خوا ئەنجام دەدرێت بەڵام ئەمانە لەپێناو بەدەستخستنی شتێکی دنیایی بەکاریانهێناوە بۆیە هەرگیز ئەمانە بۆنی بەهەشت ناکەن لەو ساحەیەدا

**تێبینی** / نمونەی ئەو زانستانە کە تەنها بۆ خوا ئەنجام دەدرێت بریتیە لە قورئان و سونەتی پێغەمبەری خوا کە خەڵکان لەپێناو دەستخستنی دنیا بەکاریانهێناوە

٢/ ئەوانەی سەرو ڕیشیان بۆیەی ڕەش دەکەن لەو ڕۆژەدا بۆنی بەهەشت ناکەن چونکە موی سپی لای پەروەردگار ڕێزێکی گەورەو تایبەتی هەیە، هەر تاڵێکی سپی دەبێتە هۆی سرانەوەی تاوانێک

٣/ ئافرەتانێک کە جلیان لەبەرایەو هێشتا ڕووتیشن (ئافرەتانی سفور و ئەو بەناو حیجابانەی کە مەرجەکانی حیجاب نایانگرێتەوە) لەو ڕۆژەدا ئەمانە بۆنی بەهەشت ناکەن کە بۆنەکەی لە دووری ٥٠٠ ساڵەوە دێت

٤/ ئەو ئافرەتانەی بەبێ بوونی هۆکارێکی شەرعی داوای تەلاق و جیابوونەوەیان لە مێردەکانیان کردووە ئا ئەمانە لەو ڕۆژەدا بۆنی بەهەشت ناکەن

٥/ ئەو کەسانەی خۆیان بە منداڵی باوکیان نەزانیوە و خۆیان لەباوکیان بێ بەری کردووە لەو ڕۆژەدا ئەمانە بۆنی بەهەشت ناکەن

٦/ ئەو کەسانەی کە خوای گەورە دەسەڵات و بەرپرسیارەتی پێداون و وە خەڵکانی کردۆتە ژێر دەسەڵاتیانەوە و ئەوانیش دڵسۆز نەبوون بۆیان لەڕووی دینەوە و ئامۆژگاریان نەکردوون ئەو سەرکردانە بۆنی بەهەشت ناکەن

٧/ هەرکەسێک جولەکەیەک یان نەسڕانیەک یان هەر غەیرە مسوڵمانێک بکوژێت کە (معاهد) بێت واتە پەیمانی سەلامەتی لێ وەرگیرابێت لە وڵاتی مسوڵمانان‌دا بژێت یان بە سەردان هاتبێت ئەوا ئەو بکوژە بۆنی بەهەشت ناکات

**دیمەنێك کە بیرمان نەچێت باسی بکەین ئەویش ئەوەیە :**

لەو ڕۆژەدا خەڵکی هەموو بەڕیز وەستاون لەبەردەم خوای خۆیاندا ( بەڵام خوای گەورە نابینن ) وەک چۆن یەکەمجار دروستی کردوون و ئا لەوێدا هەموو ئومەتەکان بەسەرچۆکدا کەوتوون لەگەڵ پێغەمبەرەکانیان پاشان کردەوەکانیان ( بەدەنگ و ڕەنگ ) نیشان دەدرێتەوە دەخرێتە پێش چاوییان و بەراورد دەکرێت لەگەڵ ( اللوح المحفوظ) دا و پێیان دەوترێت ئەمە ئەم کتابەی ئێمەیە ئێستا دێتە قسەو بە حەق هەموو شتێکتان پێ دەڵێ، یاخود بۆتان دەخوێندرێتەوە لەلایەن فریشتەکانەوە ( ئەو دوو فریشتەیەی کە کردەوەکانیان دەنوسیەوە ) بەبێ زیادو کەم {کردەوەکان هەمووی کۆپی کراوە} ئەو کردەوانەی کە ئێوە لە دونیا کردووتانە فریشتەکانی ئێمە هەموویان ئیستینساخ و کۆپی کردووە وەکو خۆی بێ زیادو کەم و هەمووی نووسراوەو زوڵمتان لێ ناکرێ. پاشان هەردوو نوسراوەکە بەراورد دەکرێت و وەک یەک دەردەچن

لێرەدا هاتینە کۆتایی حاڵی خەڵکان بە باوەڕداری چاک و خراپ و هەروەها بێ باوەڕەوە لە گۆڕەپانی مەحشەردا کە ساڵانێکی زۆر تیایدا چاوەڕێی یەکلایی بوونەوەی چارەنوسیان کردبوو دوای ئەوەی لەو ڕۆژەدا پێغەمبەری خوا (ﷺ) تکاو داوای لە پەروەردگار کرد و پەروەردگار وەڵامی تکاو داواکەی دایەوەو پاشان پۆل پۆل فریشتەکان هاتنە گۆڕەپانی مەحشەرو پاشان پەروەردگار زاتی جەلالی خۆی هاتە گۆڕەپانی مەحشەر و هەموو بوونەوەرانی مەحشەر بەنوری الله تعالی لەهۆش خۆیان چوون و پاشان هۆش هێندرایەوە بەبەریان ، وە پەروەردگار لەپشتی پەردەوە یان لەشێوەیەکی تردا دەستی کرد بە حساب و کتابی بونەوەران وە یەکەم حساب و کتابیش

کە کرا لەنێوان باڵندەکان و ئاژەڵەکان کرا وە پاشان فەرمانی کرد هەر کەسێک هەر شتێکی پەرستووە لەغەیری الله تعالی شوێنی پەرستراوەکەی خۆی بکەوێت ( بە وردەکاری باسمان لێوەکردن ) و هەموو مرۆڤەکان و تاغوتەکانیان و خوا دەستکردەکانیان لە مرۆڤ و بت و ئاگرو ...هتد پێکەوە خرانە ناو دۆزەخەوە تا کار گەیشتە ئەوەی کە گۆڕەپانی مەحشەر تەنها مسوڵمانانی هەموو ئومەتەکانی پێغەمبەرانی لێ مایەوە بە چاک و خراپەوە لەنێوانیشیاندا دووڕوو مونافیقەکان ،

لێرەوە لێپێچینەوەو لێپرسینەوەو پاشان تەرازووی کردەوەکان تایبەت دەبێت بە باوەڕداری چاک و خراپ بەبێ موونافیقەکان ( واتە تەرازوو بۆ کردەوەی موونافیق نیە بەڵکو خوای گەورە زۆر زیاتر لە کافرەکانی سەرەتا سزای بۆ داناون و لە سەرەنجامدا بەهەتا هەتایی دەکرێنە جەهەنەمەوە)

## سەرەتای دەسپێکردن بە لێپرسینەوە پێش هێنانی تەرازوو !

سەرەتای دەستپێکردن بە لێپرسینەوەو لێپێچینەوە ، ئەم جۆری دادگاییکردنە پێویستی بەتەرازوو نیەو مرۆڤەکان یەک یەک بانگدەکرێن و ڕاستەوخۆ هەریەکەو بەزمانی خۆی پەروەردگار گفتوگۆی لەگەڵ دەکات ،

پێش ئەو لێپێچینەوەو لێپرسینەوەیە چەند ڕووداوێک ڕوودەدەن ئەوانیش ئەمانەن:

دوای ئەوەی هەموو هەموو خەڵکان و ئومەتە کافرەکانی تر شوێنی پەرستراوەکانیان کەوتوون و خرانە ناو جەهەنەمەوە ئێستا تەنها ئومەتی محمد ماوە لەنێوانیشیاندا دووڕووەکان هەیە لەگەڵ پێغەمبەرانی ترو ئومەتەکانیان

یەکەم ئومەت لەپێش ئومەتی پێغەمبەرانی تر کە حساب و کتابیان لەگەڵ دەکرێت بریتیە لە ئومەتی کۆتا زەمان واتە ئومەتی ئیسلام کە شوێنیان لەو گۆڕەپانەی مەحشەردا بەسەر بەرزیەکەوەیە کە دەتوانن بەسەر هەموو دروستکراوانی تری مەحشەردا بڕوانن ،

پاشان خوای گەورە دێت بۆلای ئومەتی ئیسلام جیاوازتر لەو وێنەیەی کە ئەوان تیایدا دەیناسنەوە ، پاشان پەروەردگار بە ئومەتی ئیسلام دەفەرموویێت بۆ ئێوەش ناڕۆن وەک خەڵکان ڕۆیشتن ؟

( مەبەست لە بێ باوەڕان کە ڕۆیشتن و شوێن پەرستراوەکانیان کەوتن )

ئەوانیش دەڵێن ئێمە هەر لە دنیادا لێیان جیابووینەوە و هاوڕێیەتیمان نەکردن هەرچەندە زۆر پێویستمان پێیان بوو بەڵام لەو ڕۆژەدا لێیان جیابووینەوە ، ئێمە لێرە گوێمان لە جارچیەک بوو کە جاڕی دا با هەموو قەومێک شوێنی پەرستراوەکانیان بکەون ، ئێمە بەندەو خاوەن باوەڕەکانی خواین و پەرستوومانەو هەر ئەو پەروەردگارمانەو هەر ئەو دێت بۆلامان و پاداشتمان دەداتەوە و ئەمە جێگەمانە ، وە ئێمە چاوەڕوانی پەروەردگارمان دەکەین ، ئێمە پەروەردگارێکمان هەیە تا ئێستا نەمانبینیوە ،

پاشان پەروەردگار دەفەرموویت من پەروەردگاری ئێوەم ئەوانیش دەڵێن پەنا دەگرین بەخوا لە تۆ ( ..... بەهیچ جۆرێک شەریکی بۆ بڕیار نادەین ) ئەمە جێگەمانە تا پەروەردگارمان دێت بۆلامان و ئەگەر بێت بۆلامان دەیناسینەوە

**تێبینی** / لەوێدا ئومەتی ئیسلام نازانن کە ئەوە خوای گەورەیە گفتوگۆیان لەگەڵ دەکات بۆیە پێی دەڵێن پەنا دەگرین بەخوا لەتۆ ، بۆچی ؟ چونکە وەک باسمان کرد خوای گەورە لە شێوەیەکی تردا یان لە پشت پەردەوە گفتو گۆ دەکات لەگەڵ بونەوەرانی مەحشەر بۆیە ئومەتی ئیسلام لەو ساتەدا نازانن کە ئەمە پەروەردگار خۆیەتی

پاشان خوای گەورە دێت بۆلایان لەو وێنەیەی کە ئەوان تیایدا دەیناسنەوە و دەفەرموویت من پەروەردگاری ئێوەم ئەوانیش دەڵێن نا هەتا تەماشات دەکەین ، وە پاشان پەروەردگار خۆی نیشان دەدات بۆیان و پێدەکەنێت لە ڕوویاندا وە پێغەمبەران نەبێت کەس گفتوگۆی لەگەڵدا ناکات لەو ڕۆژەدا ، پاشان خوای گەورە دەفەرموویت ئایا لەنێوان ئێوەو ئەودا (مەبەست لە زاتی خۆیەتی) نیشانەیەک هەیە کە پێی بناسنەوە ؟ ئایا پەروەردگارتان دەناسنەوە ؟

ئەوانیش دەڵێن (پێغەمبەران دەڵێن) لەنێوان ئێمەو ئەودا نیشانەیەک هەیە ئەگەر بیبینین دەیناسینەوە ، پەروەردگار دەفەرموویت ئەو نیشانەیە چیە ؟ ئەوانیش دەڵێن کە ئەو نیشانەیە دەبینین هەموو خاوەن باوەڕێک دەچێت بەسوجدەدا بۆ پەروەردگار ، پاشان هەموو خاوەن باوەڕێک دەچن بە سوجدەدا لەو ڕۆژەدا

ئەویش بەپێی بینینی (ئەو نیشانەیەی کە خوای گەورە خۆی نیشان دەدات پێی و باوەڕدارەکان بەهۆیەوە دەچنە سوجدەوە)

پاشــان :

لەوێدا تەنها ئەوانە دەمێننەوە کە بۆ ڕیایی سوجدەیان بردووە (دووڕووەکان) هەر کەسێکیان کە دەیەوێت سوجدە بەرێت پشتی دەگەڕێتەوە دەبێت بەیەک پارچە یاخود پشتیان وەک شاخی مانگای لێدێت (ڕەق دەبێت و دەگەڕێتەوە) بۆیە ناتوانن سوجدە بەرن ، بۆچی ؟ چونکە پێشتر لە دنیادا ئەمانە بانگیان لێ دەکرا کە سوجدە بەرن لەکاتێکا ساغ و سەلامەت بوون ئەوان سوجدەیان نەدەبرد هەروەها

ئەگەر سوجدەیان ببردایە بۆخوایان نەدەبرد بەڵکو بۆ هەڵخەڵەتاندنی مسوڵمانان دەهاتنە مزگەوتەکان و سوجدەیان دەبرد چونکە لەناخ و دڵدا عەبدی دوژمنەکانی پەروەردگار بوون

لەوێدا مونافیقەکان پشتیان وەک شاخی مانگا ڕەق دەبێت و ناتوانن بچنە سوجدەوە، بەڵام لەگەڵ مسوڵمانان بەردەوام دەبن و لەناویاندا دەبن تا دواساتەکانی ڕۆژی قیامەت، بۆچی ؟

چونکە بەهەمان شێوە چۆن خۆیان لە دنیادا هاوڕێیەتی مسوڵمانانیان دەکرد و خۆیان نزیک دەکردەوە لێیان ماوەیەکی زۆر هاوڕێیەتیان دەکردن دەچوونە ناو بنج و بناوانی مسوڵمانانەوە ڕاپۆرت لەسەر ڕاپۆرتیان لەسەر دەدان و دەهاتن دەیانوت ئێمە براتانین و مسوڵمانین وە دواتریش دەچوونە لای دۆستەکانی خۆیان لە بێ باوەڕان دەیانوت ئێمە تەنها پێیان ڕادەبوێرین (زانیاریان لەسەر کۆدەکەینەوە) و دەهاتن بۆ نوێژە جەماعەتەکان پاشان لەکۆتاییدا بەکوشتن و گرتن و ئازاردانیان دەدان ، خوای گەورە بەهەمان شێوەی خۆیان لەو ڕۆژەدا دەیاهێنێت بەناو هەموو نارەحەتیەکانی قیامەتدا دەیانبات تا کۆتا ساتەکانی قیامەت کە سەر پردی سیراتەو لەوێ پێویستیان بە ڕوناکی دەبێت بۆئەوەی بتوانن بپەڕێنەوە بەسەریدا بەڵام ئەوان نوریان پێ نیە بۆیە ئا لەوێدا فڕێ دەدرێنە جەهەنەمەوە بۆ بەشی خواری خوارەوەو توندترین سزا دەدرێن کە بت پەرست و موشریکەکان بەو شێوە سەختە سزانادرێن

ئەم دوو ڕووانە کە بەڕواڵەت مسوڵمانن و لەناخو دڵدا کافرو بێدین بوون خوای گەورە سزای دەروونی و جەستەییان دەدات کە لەو ڕۆژەدا لەناو مسوڵماناندا دەیانهێڵێتەوەو ئەوانیش وا هەست دەکەن ڕزگاریان بووە کاتێک دەگەنە سەر پردەکە بەڵام لەوێ هەموو شتێک پێچەوانە دەبێتەوە و فڕێ دەدرێنە ناو ئاگرەوە چونکە ئەم بێدینانە لە دنیادا بەهەمان شێوە مسوڵمانانیان فریودا تا ماوەیەکی دوورو درێژ هاوڕێیەتیان دەکردن بەڵام لەکۆتاییدا توشی زیندان و گرتن و کوشتن و نارەحەتیان کردن)

پاشان پەروەردگار بە باوەڕداران دەفەرموێت سەرتان بەرزبکەنەوە ئینجا سەریان بەرزدەکەنەوە و دەبینن پەروەردگار لە شێوەیەکی تردایە جگە لە شێوەی

یەکەم جار و دەفەرموویت من خودای ئێوەم ، ئەوانیش هەموو دەڵێن تۆ خودای ئێمەی ئینجا دەڕوات و بڕوادارانیش شوێنی دەکەون

ئیتر بەدوای ئەم ڕووداوەدا لێپێچینەوە دەست پێ دەکات و بەشێوەیەک خێرا دەبێت کە مرۆڤ دەرکی پێ ناکات و لەو ڕۆژەدا ئادەمیزادە ستەمکارو زاڵمەکان پاساو و عوزرهێنانەوەیان سودیان پێ ناگەیەنێت

ئەو کەسانەی کە لەدنیادا تەمەنیان گەیشتبووە سەرو شەست ساڵ ئەوانە هیچ بەڵگەیەکیان بەدەستەوە نابێت کە پاساوی کارە خراپەکانیانی پێ بکەن واتە هیچ پاساو و عوزرێکی نەهێشتۆتەوە لەتەمەنیدا

لەو ڕۆژەدا هیچ نەفسێک ناتوانێت هیچ بکات بۆیەکێکی تر و مرۆڤەکان ناتوانن فێڵ و خۆدزینەوە بکەن بۆشیان ناچێتە سەر ، لەو ڕۆژەدا خزمایەتی و کەسایەتی هیچ سودێک ناگەیەنێت بەکەس و لەیەکتر جیادەکرێنەوەو دادەبڕێن بەجۆرێک نە هاوسەرەکەت نە مناڵەکەت هیچیان بەکەڵکت نایەن و تەنها کارو کردەوەکانی خۆت لە تەوحید و ئیخلاس و عیبادەتەکان و چاکەکان کە لەدنیادا ئەنجامت دابوو ڕزگارت دەکەن

لەو ڕۆژەدا پێغەمبەری خوا هیچی بۆناکرێت لای خوای گەورە تەنانەت بۆ خزمەکانی خۆیشی و بڕیاری خوای پێ ناگۆڕدرێت بۆیە لەئێستاوە خۆتان ڕزگاربکەن لە ئاگر و بەندینخانەکانی دۆزەخ

لەو ڕۆژەدا خەڵکان بەناوی خۆیان و باوکیانەوە بانگیان لێ دەکرێت .

## سات و کاتی پرسیارەکان و لێپێچینەوەکان !

پاشان مسوڵمانان لێپێچینەوەیان لەگەڵ دەکرێت و پاشان سەبارەت بەکردەوەکانیان پرسیاریان لێدەکرێت وە دوای پرسیارکردنیش ئەگەر پێویستی بە تەرازوو کرد ئەوا کردەوەکانیان دەپێورێت

**سێ جۆر لێپێچینەوە هەیە لەو ڕۆژەدا :**

١/ ئەوانەی لێپێچینەوەو حساب و کتابیان لەگەڵ ناکرێت و ڕاستەوخۆ دەچنە بەهەشتەوە

٢/ ئەوانەی لێپێچینەوەو حسابو کتابی ئاسانیان لەگەڵ دەکرێت وپاشان دەچنە بەهەشتەوە

٣/ئەوانەی کە تاوانیان هێندەی چیا بەرزەکانە خوای گەورە لێپێچینەوەیان لەبارەوە دەکات و خۆی زاناترە بەسەریاندا دەڵێن ئەوانە چەند بەندەیەکن لە بەندەکانت خوای گەورە دەفەرمووێت دایانگرن لەسەریان و بیانخەنە سەر جوولەکەو گاورەکان و بیانخەنە ناو بەهەشتەوە بە میهرەبانی خۆم

ئەمانە بە لێبوردنی خوای گەورە ڕزگاریان دەبێت لە دۆزەخ و وبەبەزەیی خوا دەچنە بەهەشتەوە و پاشان بە کردەوەکانیان پلەکانی بەهەشتیان دەست دەکەوێت

**تێبینی**/ئەمانەی خاڵی سێ تاوانەکانیان دەخرێتە سەر تاوانی جولەکەو نەسرانیەکان لەو ڕۆژەدا چونکە هەرچی فەسادی ئەم دنیایە کە هەیە لەمرۆژەدا بەپلەی یەکەم جولەکەکانن کە خاوەنی لەسەدا ٩٩ ی ئیعلامی هەموو دنیان کە بەردەوام فەساد لەسەر فەساد بەناو ملیارەها مرۆڤدا پەخش دەکەن وە بەپلەی دووەمیش نەسرانیەکانن کە ڕۆڵی سەرەکی دەبینن لەو فەسادخانەیەدا هەر لە مەلهاکان و کەناڵ و وێبسایتە خیلاعیەکان و فەسادی قومارو ...هتد

ئەمەش بەمانای ئەوە نایەت کە تۆ تاوان بکەیت و لەوێ لە قیامەتدا بخرێتە سەر ملی جولەکەیەک یان نەسرانیەک بەڵکو ئەمە بۆ کەسانێکە کە موەحید بوون و

بەنەزانانە توشی تاوانی گەورە بوون و دواتر کە بۆیان ڕوون بۆتەوە بەیەکجاری وازیان لێ هێناوە و تەوبەیان لەسەری کردووە

چوونە ناو بەهەشت بەبێ لێ پێچینەوە !

**یەکەم** / چینێکی تایبەت هەیە لە مسوڵمانان لێپێچینەوەو لێپرسینەوەیان لەگەڵ ناکرێت و بگرە کردەوەکانیان تەرزاووش ناکرێت بەڵکو ئەو ڕۆژە ڕاستەوخۆ بەبێ حساب و کتاب دەچنە ناو بەهەشتەوە ژمارەیان ٧٠ هەزار کەسن ئەوانەش ئەو کەسانەن کە ( داخیان بەکارنەهێناوە و داوایان نەکردووە کەس دوعایان بەسەردا بخوێنێت ، ئەوانەن کە هیچ شتێک بەشووم نازانن ، ئەوانەن کە لەهەموو کارو کردەوەیەکیاندا پشتیان بەخوای خۆیان بەستووەو هانایان بۆ کەس نەبردووە .

هەروەکا کۆچکارە هەژارەکانیش دەگرێتەوە کە ماڵ و سامانی خۆیان هەموو جێهێشت لەپێناوی دینی خوای گەورەدا جیهادو تێکۆشانیان کرد لەپێناوی خوای گەورەدا ئەوانە یەکەم چین دەبن لە ئومەتی پێغەمبەری خوا(ﷺ) کە بەبێ لێپرسینەوە دەچنە بەهەشتەوە ، لەو ڕۆژەدا ئەوانە دێن بۆلای دەرگای بەهەشت و داوای چوونە ژوورەوە دەکەن و دەرگاوانی بەهەشتیش پێیان دەڵێن : ئایا لێپێچینەوەتان تەواوبوو ؟ ئەوانیش دەڵێن : لەسەر چ شتێک لێپێچینەوەمان لەگەڵدا بکرێت ، ئێمە شمشێرەکانمان بەسەر شانمانەوە بوو لەپێناوی خوادا تێدەکۆشاین و دەجەنگاین هەتا مردین پاشان دەرگای بەهەشتیان بۆ دەکرێتەوەو دەچنە ژوورەوە چل ساڵ تیایدا دەحەوێنەوە پێش ئەوەی خەڵکان بچنە ناوییەوە

هەروەها ئەوانەش کە سەبرێکی گەورەیان گرتووە لەسەر هەژاری و نەداری و نەخۆشی و ترس لە پێناوی خوادا ئەوانەش لێپێچینەوەیان لەگەڵ ناکرێت ، ئەو کەسانەن کە خوای گەورە بۆیان پێدەکەنێت لە جێگەیەکدا وە هەر کاتێک خوای گەورە پێبکەنێت بۆ بەندەیەکی لە جێگەیەکدا ئەوا ئەو بەندەیە لێپێچینەوەی لەگەڵدا ناکرێت

ئەو کۆمەڵانەش کە خوای گەورە بۆیان پێدەکەنێت بریتین لە خۆگرانی گۆڕەپانی جەنگ لە پێناوی خوای گەورەو بەرنامەکەی خوای گەورەدا ، وە ئەوانەی شەونوێژ ئەنجام دەدەن لە ماڵەوە و لەسەفەردا .

لەو ڕۆژەدا سێ جۆر خەڵک هەن کە خوای گەورە خۆشی دەوێن و بۆیان پێدەکەنێت و مژدەی کارە باشەکانیان دەدات بەفریشتەکان لەوانە : -

ئەو کەسەیە کە لەگۆڕەپانی جەنگدایە (لەپێناوی سەرخستنی دینی خوادا) پاشان هاوڕێکانی هەموو هەڵدێن و ڕادەکەن و گۆڕەپانی جەنگ بەجێدەهێڵن بەڵام ئەو بەتەنها دەمێنێتەوە و لەڕووی دوژمندا ڕادەوەستێت تا خوا سەریان دەخات یان دەکوژرێت

هەروەها ئەو کەسەی کە هاوسەرێکی جوان و شۆخ و شەنگی هەیە و جێگەیەکی نەرم و گەرمی هەیە و لەهەردووکیان دووردەکەوێتەوە و شەونوێژ دەکات بۆ خوای گەورە ئەم جۆرە کەسەش خوای گەورە بۆی پێدەکەنێت و لێپێچینەوەی لەگەڵ ناکات و بەهەشتی پێ دەبەخشێت

هەروەها ئەو کەسەی کە لەگەڵ هاوڕێکانیدا لەسەفەرو گەشتدایە و لەهەموو درەنگانێکی شەودا دەخەوت بەڵام لەپارشێودا هەڵدەسێت و شەونوێژ و نزا دەکات لەهەموو کاتەکانی خۆشی و ناخۆشیدا ئەم جۆرەش لە باوەڕداران لێپێچینەوەیان لەگەڵ ناکرێت و بەبێ حساب دەچنە بەهەشتەوە .

## دەستپێکردنی لێپێچینەوە لەگەڵ یەکەم ئومەتدا !

یەکەم ئومەت کە لێپێچینەوەی لەگەڵ دەکرێت لەو ڕۆژەدا ئومەتی ئیسلامە و بانگیان لێدەکرێت و دەوترێت کوا ئەو ئومەتەی کە خۆیان و پێغەمبەرەکەیان نەخوێندەواربوون ؟

لێپێچینەوەی ئاسان / بۆ ئەو کەسانەیە لەڕۆژی قیامەتدا کە کاتێک قورئانیان خوێندووە ئەوەی تیایدا داواکراوە جێبەجێی کردووە و بەهۆیەوە دوورکەوتۆتەوە لە گومڕایی و جار بۆ جار هیدایەت و ڕێنوێنی زیاتری لێوەرگرتووە ئەمانە لەو ڕۆژەدا لە لێپێچینەوەی قورس و سەخت ڕزگاریان دەبێت ، سیفەتی ئەم جۆرە کەسانە کە لێپێچینەوەیان ئاسانە ئەوەیە هەرکاتێک تاوانێک بهاتایە پێشەوە یان نەیان دەکرد لەترسی خوا یان ئەگەر زاڵنەبوونایە بەسەر نەفسیاندا و ئەنجامیانبدایە دوای تاوانەکە پەشیمان دەبوونەوەو لێپێچینەوەیان لەگەڵ نەفسی خۆیان دەکردو تەوبەیان لێ دەکرد

تا خۆت دوورتر بگریت لەسەر حەرام لەو ڕۆژەدا لێپێچینەوەت ئاسانتر دەبێت .

ئایا لەو ڕۆژەدا لەسەر چ بنچینەیەك لێپێچینەوە دەکرێت ؟

پێش هەموو شتێک بزانن هیچ کەسێک نیە هێندەی پەروەردگار دادگەر بێت و عادل بێت لەو ڕۆژەدا هیچ مرۆڤێک زوڵمی لێناکرێت تەنانەت هێندەی گەردێک یاخود هێندەی تاڵی دەزووی ناو ناوکی دەنکە خورمایەکیش

لەو ڕۆژەدا ئەوەی هێندەی گەردیلەیەک هەر کارێکی ئەنجام دابێت لەچاک و خراپ ئەوا لەوێ ون نابێت و لەسەری لێپێچینەوەی لەگەڵ دەکرێت و پاداشت و سزا دەدرێتەوە لەسەریان ، ئەوەش ئەوپەڕی دادگەری و عەدلی پەروەردگارە لەو ڕۆژەدا کە بەچاوەکانی خۆتان دەیبینن

دڵنیابن لەو ڕۆژەدا کەستان تاوانی کەسی ترتان هەڵناگرن واتە تۆ ناتوانی تاوانێک ئەنجام بدەیت بە ئەندامەکانی لەشی خۆت و دواتر بڵێی ئەوە لەملی فڵان کەسە خوات پێ هەڵناخەڵەتێنرێ و لەسەریشی سزا دەدرێیت هەموو کەس تاوانی خۆی لەملی خۆیەتی

لەو ڕۆژەدا ئەوانەی سەرچاوەو هۆکاربوون بۆ بڵاوبوونەوەی کوفرو گومڕایی و فەسادی و بێ ڕەوشتی و هەر کارێکی خراپی تر و بەهۆیەوە خەڵکانیشیان توشی تاوان و فێری تاوان کردووە ئەوا بەئەندازەی بڵاوبوونەوەی تاوانەکە و گوناهی خەڵکان (بەهۆی جەنابتەوە) لەو ڕۆژەدا تاوانی هەموویان دێتە سەر حسابەکەی تۆ بەبێ ئەوەی لە هی ئەوان کەم بکات .

**تێبینی** / ئینجا بیهێنە بەرچاوی خۆت کەسانێک هەن لەمرۆژەدا ساڵۆنیان چواندووە بە مزگەوت و شەوی لەیلەتولقەدر و بە هەزاران کەس گوێیان بۆ دەگرن

یان ئەوانەی هۆکاری بڵاوبوونەوەی فەسادن هەر لەگۆرانی و فلیمی بەدرەوشتی و ...هتد وە بە ملیۆن بینەریان هەیە ئەوانەش هەموو تاوانی خەڵکان دەچێتە سەر حسابەکانیان بەبێ ئەوەی لەتاوانی خەڵکەکە کەم ببێتەوە

لەو ڕۆژەدا هەموو ئەمانە یەک یەکی کردەوە خراپەکانیان پێ ڕادەگەیەنرێت و نیشانیان دەدرێتەوە

لەو ڕۆژەدا تۆ هیچ کارێکی چاکەت لێ وەرناگیرێ ئیلا ئەوانە نەبێت کە زۆر بەدڵسۆزی لەپێناوی خوای گەورەو بۆ خوای گەورە ئەنجامت داوە تەنها لەسەر ئەو کارەش پاداشت وەردەگری ئیتر هەر کارێکی چاکەت ئەنجام داوەو مەبەستت یان نیەتت بەنمونە تیایدا (بەناوبانگ بوون بووە یان بۆ ڕازیکردنی کەسێک بووە یان بۆ گەیشتن بە مەبەستێکی تایبەتی و دیاریکراو بووە ) ئەوا ئەو کارەت بۆ خوا نەبووەو لەو ڕۆژەدا هیچ سودێکی بۆت نابێت

لەو ڕۆژەدا هەموو کارەکانت دەهێنرێت و یەک یەک جیادەکرێنەوەو پۆلێن دەکرێن هەموو کارەکانت کە بۆ خوا ئەنجامت داوە جیادەکرێنەوە لەو کارانەی تر کە مەبەستت تیایاندا بۆ خوا نەبووە ، پاشان هەموو ئەوانە کە بۆ خوا نەبووە فڕێ دەدرێتە ناو دۆزەخەوە ( خودی کارەکان فڕێ دەدرێتە دۆزەخەوە کە بۆخوا نەبوون ) دواتریش تەرازوو دەکرێن یان بۆ بەهەشت دەچیت یان بۆ بەندینخانەکانی دۆزەخ دەچیت

چونکە ئەو کارانە کە بۆ خوات نەکردووە هیچیان سودت پێ ناگەیەنێ و پێشت دەوترێ بڕۆ پاداشتەکەت لەفلان وەرگرە کە بۆ ئەو یان ڕازیکردنی ئەو ئەنجامت دابوو فلانیش لەو ڕۆژەدا حاڵی وێرانەو یان کافرەو لەدۆزەخدایە یان تاوانی هێندەی شاخەکان لەگەردنیایەتی لەخوای دەوێ تەنها خۆی ڕزگاری ببێت .

ئەوانەی کارە چاکەکانیان تەنهاو تەنها لەپێناو خوادا ئەنجام دابوو مەبەست و نیەتیان بەئیخلاسی و ڕاستگۆیی بۆ خوا بووە ئەوا ئەو کارە چاکانە هێندە زیاد دەکرێن کە بەندەکە لەوێدا توشی سەرسوڕمان دەبێت بەجۆرێک کە خودی کارە چاکەکە یەک بە ٧٠٠ دەبێت و بگرە زۆر لەوە زیاتریش کە خوای گەورە بەس خۆی دەزانێت چەندە !

بەنمونە ئەگەر تۆ تەنها لەبەر خوای گەورە ماڵێک و پارەیەک ببەخشی و بەئیخلاسی نیەتت بەس خوا بێت ئەوا لەو ڕۆژەدا بۆت دەکرێ بە ٧٠٠ ئەوەندەو بگرە لەوەش زیاتر کەواتە نیەتی بەخشینەکەت با بەس بۆ خوا بێت و بەخەڵکی ڕامەگەیەنە کە بەخشیوتە با کەسیش نەزانێ کە دەیبەخشیت ، چونکە ئەگەر مەبەستت ئەوەیە لەدنیادا پێو بڵێن پیاوێکی چاک و بەخشندەیە و حەزەبکەیت خەڵک بە چاکەکانت بزانن ئەوا لەو قیامەتەدا هێندەی یەک گەرد سودی بۆت نابێت

لەو ڕۆژەدا کلیلی وەرگرتنی چاکەکانت وەک مسوڵمان تەنها یەک کردەوەیە ئەویش نوێژەکانتە ئەوە یەکەم کردەوەیە کە پرسیارت لێ دەکرێت لەسەری پێش هەموو کردەوەکانی ترت ئەگەر نوێژەکانت تەواوو ڕێک و پێک بوو ئەوا هەموو کارەکانی ترت کە لەپێناو خوای گەورەدا ئەنجامت داوە لێت وەردەگیرێ و بۆت چاک دەکرێت و پاداشت دەدرێیتەوە لەسەری

ئەگەر نوێژەکانت خراپ بێت و کەم و کوڕ بن و بەجدی و لەکاتی خۆیدا ئەنجامت نەدابن یان دوانت کردووە دانەیەکت فەوتاندووە ئەوا بەنوێژە سونەتە موئەکەدەکانت ڕێک دەکرێنەوە ، ئەگەر هات و نوێژە سونەتە موئەکەدەکانت قەرەبووی نوێژە فەرزەکانیان نەکردەوە ئەوا هەموو کردەوە چاکەکانی ترت خراپ دەکرێن و لەو ڕۆژەدا لەناو ملیۆنەها خەڵکا سەرشۆڕو ڕسوابوونت بەسەردا دێت، بۆچی ؟

چونکە گەورەترین حەق و ماف لەم دنیایەدا کە تۆ بەلایەنی کەمەوە ٧٠ساڵ تیایدا دەژیت بریتیە لە حەق و مافی ئەو خوایەی کە لە نەبوونەوە هێنایتە بوون و ئەم هەموو زەوی و ئاسمان و گیانەوەرانەی بۆ دروستکردیت کە خزمەتت بکەن و ڕێزو گەورەییەکی پێ بەخشیت بەهیچ مەخلوقێکی تر نەدراوە بگرە عەقڵێکی گەورەی پێ بەخشیت لەناو هەموو بوونەوەراندا کە بتوانیت هەموو مەخلوقاتی تر بەکار بێنیت بۆ پێویستیەکانی ژیانت ، وە تۆ سوپاسی ئەو پەروەردگارەت نەکرد بە نوێژەکانت و سوجدەکانت لە تەمەنتدا ، ئیتر شایەنی سەرشۆڕی و زەلیلیت لەو ڕۆژەدا ، کە تۆ ئەوەنە بێ هەست و شعور بوویت و بەشکۆو پێگەی الله تعالی ت نەزانی و ئامادەنەبوویت بەدڵسۆزی نوێژەکانت ئەنجام بدەیت بۆی ئیتر موستەحەقی ئەو زەلیلبوونەیت لەو ڕۆژەدا ،

تۆیەک کە پێت بڵێن سبەینێ سەعات ٤ بەیانی موچە دەدرێت هەر لە شەوەکەیەوە بۆی ناخەوی یان سەعات سێ بۆی هەڵدەستیت تا لەکاتی خۆیا ئامادەبیت بۆ وەرگرتنی موچەکەت بەڵام کە خوای گەورە پێت دەفەرمێ نوێژی بەیانیت لەکاتی خۆیدا ئەنجام بدە تەمەڵی دەکەیت ئیتر قابیلی ئەوەیت کەزەلیل بیت لەو ڕۆژەدا

لە نوێژشیدا دەبێت ئاگات لە سێ بەش بێت : ئاگات لە دەست نوێژت بێ ، ئاگات لە ڕکوع بێت ، ئاگات لە سوجدە بێت بەڕێک و پێکی ئەنجامیان بدە بەهێواشی و

لەسەرخۆیی وە لەو سێ بەشەدا هەوڵدە هۆشت لای خۆت بێت لەو زکرانەی کە تیایاندا دەیخوێنیت و لەبیرت بێت بەرامبەری کێ وەستاویت یان لە سوجدەدایت بۆ کێ !

لەو ڕۆژەدا ئەو مسوڵمانەی کە نوێژەکانی مەزبووت بوو وە کارە چاکەکانی کە بەس لەبەر خوا ئەنجامی دابوو نەک لەبەر دڵی کەسێک یان ڕازی بوونی کەسێک یاخود نەک لەبەر بەمەبەستێکی تر ئەوا ئەو مسوڵمانە (خۆشی لەخۆی) ئیتر ئەو عەبدە دەبێتە یەکێک لە براوەکانی گۆڕەپانی مەحشەر لەناو ملیارەها مرۆڤدا

پێی دەوترێت ها ئەوە شەهادەو بڕوانامەکەتە تۆ دەرچوویت و بردتەوە تۆ بەهەشتت بەدەست هێنا تۆ ئیتر لە ئێستاوە بۆ هەتا هەتایە لەخۆشی و بەختەوەریدا دەژیت ، تۆ ئیتر دەگەیت بەو بەهەشتەی کە چاوەکان نەیانبینیوە تۆ دەگەیت بەچێژی بینینی ئەو پەروەردگارەی کە لەدایک و باوکت بەڕەحمتر بوو بۆت ، تۆ ئەگەیت بەو نازو نیعمەتانەی کە لەو بەهەشتەدا بۆت ئامادەکراوە .

## بە یەکگەیشتنی خوای گەورە لەگەڵ بەندەکانی بۆ لێپرسینەوە !

ئایا چۆن لێپرسینەوە دەست پێدەکات لەنێوان خوای گەورەو بەندەکانی ؟

لەو ڕۆژەدا هەموو تاکێک بەتەنها دەگات بەخوای گەورەو بەزمانی خۆی گفتوگۆی لەگەڵدا دەکرێت وە هەمووتان پێ پەتی و ڕووتن

( بێجگە لە ئەهلێکی تایبەت نەبێ کە پۆشتە دەکرێن لەسەرەتای هاتنە دەرەوە لەگۆڕەکانیان پێشتر باسمان کردووە )

سەرەتا پێش گفتوگۆکردن :

١/ خەڵکانیک هەن لەو ڕۆژەدا زۆر زۆر ڕێز لێگیراو دەبن چونکە ئەم باوەڕدارانە لە دنیادا خوای گەورەیان لە شکۆ و پێگەی خۆیدا ناسیبوو وە خوای گەورەیان زۆر خۆش ویستووە بەجۆرێک تەمەننایان دەکرد بگەنەوە بەخوای گەورە لە خۆشەویستیان بۆی ، وە هێندە پەروەردگاریان خۆش ئەویست شوێن هەموو سونەتەکانی پێغەمبەرەکەی (ﷺ) کەوتبوون و بەهیچ جۆرێک نزیکی شرک و هاوبەش دانان نەکەوتبوون ئەمانە ئەولیاکانی الله تعالی ن لەو ڕۆژەدا ئەمانە کە دەگەن بەخوای گەورە سڵاو لە خوای گەورە دەکەن بە سڵاوی ( السلام علیکم ) خوای گەورەش لە ئەسنای ئەم لیقایە ئەجرێکی زۆر گەورەو پڕ لە ڕێزیان پێ دەبەخشێ، ئەمانە لە دنیادا زۆر تامەزرۆی گەیشتن بوون بە دیداری پەروەردگار بۆیە پەروەردگاریش زۆر پێی خۆشە بەگەیشتنەوەی ئەم بەندانەی بۆلای خۆی .

٢/ خەڵکانێک کە زۆر ئەهلی مەدینەیان خۆش ویستووە خوای گەورە خۆشی ئەوێن بۆچی ؟ چونکە ئەهلی مەدینە ئەوانە بوون کە پشتگیری پێغەمبەریان کرد (ﷺ) کاتێک لە زێدی باو باپیرانی دەکراو عەزێت درا بەڵام ئەهلی مەدینە بوونە چەتر بۆی و لەوێوە دین و بەرنامەی خوای گەورە بەهەموو جیهاندا بڵاو بۆوە تا ئەمڕۆی خۆشمان کە لەهەموو شوێنێکی ئەم سەر زەوییە مزگەوتی لێیەو خوای بەتەنها تیا دەپەرستریێت بۆیە هەموو ئەم فەزڵە دەگەڕێتەوە بۆ ئەهلی مەدینەی خۆشەویست .

٣/ هەرکەسێک لەدنیادا ڕێزی گرتبێت لە سەرۆکێکی مسوڵمانی دادپەروەری شوێنکەوتەو کارپێکەر بەبەرنامەی قورئان و سونەت خوای گەورە ڕێزی لێ دەگرێت لەو ڕۆژەدا ، وە هەرکەسێکیش سوکایەتی پێ بکات ئەوا ئەو کەسە لەو ڕۆژەدا سوک و ڕسوا دەکرێت .

٤/ هەرکەسێک پلەو ڕێزی خوای گەورە چۆن بێت لەلای ئەوا پلەو ڕێزی بەهەمان شێوە دەبێت لای پەروەردگار ، بزانە ئاستی گەورەیی و شکۆی پەروەردگار چۆنە لەناو دڵ و دەروونتا بزانە چەنێ شەرم لەخوای گەورە ئەکەیت کاتێک تاوانێکت ڕووبەڕوو دەبێتەوە .

٥/ لەو ڕۆژەدا ئەوانەی بەڕۆژوو بوون زۆر بەدڵخۆشی و کامەرانیەوە دەگەن بە خوای گەورە و شادمان و دڵخۆش دەکرێن .

٦/ لەو ڕۆژەدا خەڵکانێک دەگەن بە خوای گەورە بۆ لێپرسینەوە گەڕوگولن چونکە ئەمانە بە سوێندی درۆ سەروەت و سامانێکیان لە خەڵکان زەوت کردووە وە خوای گەورە لەو ڕۆژەدا ڕوویان تێناکات

٧/ لەو ڕۆژەدا سواڵکەرەکان کە دەگەن بەخوای گەورە هیچ پارچە گۆشتێک بە دەم و چاوییانەوە نەماوە

٨/ لەو ڕۆژەدا خوای گەورە خۆی مافی سێ جۆر لەخەڵکان وەردەگرێتەوە لە کەسانێک کە مافەکانیان زەوتکراوە ئەوانیش ئەمانەن :

پیاوێک سوێند بە خوای گەورە دەخوات بۆ یەکێک کە (نایکوژێت یاخود دزی لێ ناکات یاخود خراپەی بەرامبەر ناکات یاخود مافی پێشێل ناکات ) پاشان درۆی لەگەڵ دەکات و ئەوە دەقۆزێتەوە و بەهەلی دەزانێت کە ئەو پیاوەی هەڵخەڵەتاندووە و خراپەکاریەکەی لەگەڵ ئەنجام دەدات

وە پیاوێک ئازادێک بفرۆشێت و پارەکەشی بخوات

وە پیاوێک کرێکارێک بەکرێ بگرێت و کارەکەی پێ ئەنجام بدات و پاشان کرێ و مافەکەی نەداتێ ، ئەمانەی باسکرا خوای گەورە خۆی دەبێتە داوالێکاری مافەکانیان و پشتگیریان دەکات

۹/ لەو ڕۆژەدا خەڵکانێک دێن لە باوەڕداران زۆر بەڕێزەوە پێشوازیان لێ دەکرێت کاتێک دەگەن بەخوای گەورە هۆکاری ئەم ڕێز لێگرتنەش ئەوەبووە ئەم کەسە لەدنیادا زۆر بەڕێز بووە بەرامبەر بەخەڵکان و زۆر بەڕێزەوە پێشوازی لەخەڵکان کردووە ،

وە بە پێچەوانەشەوە ئەگەر پیاوێک چووە لای خەڵکان و پێی وترا پێشوازیت لێ نەبێ ئەی وشکی قات و قڕ ، ئەوا ئەو خەڵکە هەمان قسەیان پێ دەوترێ لەو ڕۆژەدا کە دەگات بەخوای گەورە

۱۰ / لەو ڕۆژەدا کەسانێک کاتێک دەگەنە بەردەم خوای گەورە بۆ لێپێچینەوە دەبینرێ لەنامەی کردەوەکانیانا تاوانەکانیان پۆشراوە (سەترکراوە) چونکە ئەم کەسە لەدنیادا هەڵەو تاوانی کەسانی تری پۆشیوە و ئاشکرای نەکردووە بۆ خەڵکان واتە سەتری کردووە

۱۱/ لەو ڕۆژەدا کەسانێک کاتێک دێنە بەردەم خوای گەورە دەبینرێت ناڕەحەتی ئەو ڕۆژەیان زۆر لەسەر ئاسانکراوە و وە حساب و کتابیشیان ئاسان دەکرێت لەبەردەم خوای گەورە ، بۆچی ؟ چونکە ئەمانە لەو کەسانە بوون کە ناڕەحەتی و ناخۆشیەکانیان بەسەر مسوڵمانانەوە ئاسان کردبوو وە لایان بردبوو وە کارئاسانیان بۆ قەرزدارەکان کردبوو قەرزەکانیان بۆ ئاسان کردبوون هاوکاریان کردبوون بۆیە لەو ڕۆژەدا خوای گەورە کار ئاسانیان بۆ دەکات

## توڕەبوونی الله تعالی لە خەڵکانێک !

لەو ڕۆژەدا کەسانێک دێنە بەردەم خوای گەورە بۆ لێپێچینەوە خوای گەورە زۆر لێیان توڕەیە :- کێن ئەمانە ؟

١/لەو ڕۆژەدا کەسانێک دێنە بەردەم پەروەردگار کە ناویان لەخۆیان ناوە پادشای هەموو جیهان یان پادشای موڵک و سامانەکان ،

(چونکە ئەم مرۆڤە بچکۆلەیە ئەگەرچی پاشای وڵاتێکیش بوبێت بەڵام خاوەنی تەنانەت خانەیەکی لەشی خۆیشی نیە وبەنمونە ( حاڵی زۆر جوان دەبێت کاتێک توشی سکچوون (اسعال) دەبێت ئەوکات با بەخۆی بڵێ پاشا )

٢/کەسانێک دەگەن بەخوای گەورە زۆر لێیان توڕەیە ئەوانەش ئەوانەن کە کاتێک بەشوێنێکدا ڕۆیشتوون زۆر لوتبەرزو بەفیزو تەکەبوربوون لەناخی خۆیاندا وا وێنایان کردووە کەس لەمان گەورەتر نەبووە و یان کەس لەم زیرەکترو ئازاتر نەبووە یان هەر بۆ خۆ نیشاندان خەڵکانیان وەک پاسەوان و هەوادار شوێن خۆیان خستووە

٣/لەو ڕۆژەدا کەسانێک هەن خوای گەورە زۆر لێیان توڕەیە چونکە ئەمانە یارمەتی کەسانێکیان داوە لە دەمەقاڵێ و گفتوگۆیەکی ناڕەواو ستەمدا وە دوژمنایەتیان ناوەتەوە بۆیە ئەو کەسانە خوای گەورە زۆر لێیان توڕەیە کاتێک پێی دەگەن

٤/ لەو ڕۆژەدا کەسانێک دەگەن بەخوای گەورە کە ئاڵای ئابڕووچوونیان بۆ بەرزکراوەتەوەو هیچ بەڵگەیەکیان بەدەستەوە نیە ، پاشان لەوێدا دەوترێت ئەمە ئەو کەسەیە کە غەدری لە فلان کردووە وە گەورەترین غەدریش لەدوای شەریک بۆخوادانان ئەوەیە کەسێک بەڵێنی ملکەچ بوون لەسەر بەڵێنی خواو پێغەمبەر (ﷺ) (واتە لەسەر ئەو مەرجەی کە خواو پێغەمبەری خوا دیاریان کردووە بۆ ملکەچ بوونی سەرکردەکان) بداتێ و پاشان بەڵێنەکەی هەڵوەشێنێتەوەو نەیباتە سەر ، ئەم جۆرە کەسە ئاڵای ئابڕووچوونی بۆ بەرزدەکرێتەوە لەو ڕۆژەدا

٥/ لەو ڕۆژەدا کەسانێک کە دەگەن بەخوای گەورە زۆر لێیان تورەیە ئەوانیش ئەوانەن کە زۆر توند و تیژ بوون لەکاتی شەڕو دەمەقاڵەدا بەناحەق بۆ سەرخستنی ستەم و گومڕایی

٦/لەو ڕۆژەدا کەسانێک دەگەن بەخوای گەورە زۆر لێیان تورەیە ئەوانیش ئەوانەن کە خراپەکاریان بڵاوکردۆتەوە لەناو حەرەمی مەککە و مەدینەدا ، ئەوانەی کە ڕێچکەیەکی نەفامی و گومڕایی لە ئیسلامدا دروست بکات و بەرپای بکات ، وە کەسێکیش دوای یەکێک بکەوێ بەناحەق بۆئەوەی خوێنی بڕێژێت .

لەو ڕۆژەدا خەڵکانێک دەگەن بەخوای گەورە کە بەدەستی پێغەمبەرێک کوژراون یان پێغەمبەرێکیان کوشتووە ، خوای گەورە لەو ڕۆژەدا زۆر لەمانە بەتوڕەیە ( ئەمانە لە ڕیزی بێ باوەڕەکاندان ) و سەختترین سزایان هەیەو بەهەتا هەتایی دەکرێنە جەهەنەمەوە

لەو ڕۆژەدا خوای گەورە زۆر تورەیە لەو کەسەی کە سەر لە خەڵکان دەشێوێنێت بەبێ زانست یاخود ئەو کەسە کە وێنە دەکێشێت و پەیکەر دەتاشێت (مەبەست لە وێنەی رۆحلەبەرە).

## گەیشتنی خەڵکانێک بە پەروەردگار لەنێوان رازی بوون و رازی نەبووندا !

١/لەو ڕۆژەدا کەسانێک دەگەن بەخوای گەورەو خوای گەورە بەهۆی وشەیەکەوە کە وتوویەتی لێی ڕازی بووە لەکاتێکا ئەو کەسە خۆی گومانی ئەوەی نەبردووە کە بگات بەو جێگەیە (پلە بەرزەی) بەهۆی ئەو وشەیەوە کە وتوویەتی بەهۆی ئەمەوە خوای گەورە ڕازیبوونی خۆی بۆ نوسیوە تا ڕۆژی کۆتایی

وە هەروەها لەو ڕۆژەدا کەسێک دێت کە لە قسەکردنیدا وشەیەکی وتووە خوای گەورە پێی ناخۆشە وە گومان نابات بگات بەو جێگەیەی (پلە نزمەی) کە پێی گەیشتووە ، خوای گەورە توڕەبوونی خۆی بۆ ئەو کەسە دەنوسێت تا ڕۆژی کۆتایی

**تێبینی** / مەبەست لەم خاڵە ئەوەیە کەسانێک هەن بەئەنقەست قسەیەک دەکەن و لەدڵیشیانا هەستی پێ دەکەن کە خوای گەورە پێی خۆش نیە بەتایبەت ئەوانەی کە دەیانەوێ دین بکەن بەبابەتی سوعبەت و گاڵتەجاری یان باسی کەسێک بکەن یان هەر باسێکی ناشایستەبێت لەهەر بوارێکدا تەنها بۆئەوەی خەڵک بهێنێتە پێکەنین ئەم کەسانە دوور نیە خوای گەورە بەهۆی ئەم وتە قێزەونەیانەوە توڕەبوونی خۆی بۆی بنوسێت بۆ هەتا هەتایە تا ڕۆژی قیامەت

هەروەها کەسانێکیش هەن کە کۆمەڵێ قسەی بەجێ و جوان و گونجاو دەکەن و لە ئەسنای قسەکانیانا وتەیەک یان ڕستەیەکی زۆر جوان بە دڵسۆزی و دڵسافی لە پێناوی خوای گەورەدا لە زاریان دێتە دەرەوە کە بەهۆیەوە خوای گەورە ڕازی بوونی خۆی بۆیان دەنوسێت بۆ هەتاهەتایە تا ڕۆژی کۆتایی

بۆیە زۆر بەئاگابن لەکاتی قسەو وتەو گوفتارەکانتان

٢/ لەو ڕۆژەدا کەسانێک دەگەن بەخوای گەورە کە لێیان ڕازی بووە ئەویش بەهۆی ئەوەی زۆر بەڕێز بوون لەگەڵ دایک و باوکیانا بەجۆرێک باوک و دایکیان

لێیان ڕازی بوون بەهەموو شێوەیەک خوای گەورەش بەهۆی ئەمەوە لێیان ڕازی بووە وە بەپێچەوانەشەوە خەڵکانێک دەگەن بەخوای گەورە خوای گەورە هەرگیز لێیان ڕازی نیەو زۆریش لێیان توڕەیە بەهۆی ئەوەی زۆر عەزێتی دایک و باوکیان داوە بەتایبەتی لە تەمەنی پیریاندا.

( بەداخەوە لەم ڕۆژەدا زۆرێک دەبینین کە عەزێتی دایک و باوکیان دەدەن دەریان دەکەن بەئاشکرا و تا شتێکیان بۆ دەکرن ١٠٠ جار دەیدەنەوە بەچاوی ئەو دایک و باوکە بەتەمەنەدا لەکاتێکا ئەو پیرانە خێرو بەرەکەتی ماڵن خوای گەورە ڕێزی گەورە لەو ماڵانە دەگرێ کە سەر سپیەکی بەتەمەنی تیایەو بەرەکەت دەڕژێنێتە ئەو ماڵانەوە ، خوای گەورە بەگەورەیی خۆی شەرم لە چرچولۆچی ڕوخسارو سەری سپی ئەو بەتەمەنانە دەکات بەڵام کوڕو کچەکانیان ڕێزیان ناگرن بۆیە خوای گەورە هەرگیز لەمانە ڕازی نابێت و سزای سەختیان بۆ ئامادەکراوە )

٣/ لەو ڕۆژەدا کەسانێک دەگەن بەخوای گەورەو پەروەردگاریش لێیان ڕازی بووە بەهۆی ئەوەی ئەم کەسانە هەموو بەیانی ئێوارەیەک سێ جار لەسەر یەک ئیسپاتیان کردووە بۆ پەروەردگار کە وتوویانە ( ڕازیم بە الله کە پەروەردگارم بێت و بە ئیسلام کە ئاینم بێت و وە بە محمد (ﷺ) کە پێغەمبەرم بێت ) ئەو کەسانەی کە سێ جار بەیانیان و ئێواران ئەم ویردەیان خوێندووە خوای گەورە پێویستی کردووە لەسەر خۆی کە ڕازیان بکات لەڕۆژی کۆتاییدا .

٤/ لەو ڕۆژەدا کەسانێک دەگەن بەخوای گەورە و خوای گەورەش لێیان ڕازی بووە بەهۆی ئەوەی ئەم کەسە ڕقی خۆی خواردۆتەوە تەنها لەبەر خوا وە بەهۆیەوە بێدەنگی کردووە وە توانیویەتی زاڵ بێت بەسەر ئەو ڕقەی کە لە دڵیدا دروست بووە بۆ بەرامبەرەکەی یان هەرکەسێکی تر بێت بەهۆیەوە تەنها لەپێناوی خوای گەورەدا لێی بوریوەو کۆتایی بەڕق و کینەکەی هێناوە و دڵی پاک و خاوێن کردۆتەوە ، خوای گەورەش بەرامبەر ئەم کارەی لە قیامەتدا دڵی پڕ دەکات لەڕازی بوون

٥/ لەو ڕۆژەدا کەسانێک دەگەن بەخوای گەورەو ڕازی بوونیان بەدەست هێناوە ئەویش بەهۆی ئەوەی کاتێک لەژیانی دنیایاندا قەرزاری خەڵک بوون زۆر بەجوانی

و بێ فرت و فێڵ و لەسەر پەیمانی خۆیان قەرزەکانیان داوەتەوەو مافی خەڵکانیان گێڕاوەتەوە بەڕازی بوونی خۆیان ، ئەمانە چاکترین بەندەکانی خوان لەو ڕۆژەدا لای خوای گەورە

٦/ لەو ڕۆژەدا کەسانێک هەن کاتێک دەگەن بەخوای گەورە خوای گەورە لێیان ڕازی نیەو وە دەیانبوغزێنێت هۆکاری ئەمەش ئەوەیە کە ئەم کەسانە لەکاتی قسەکردندا زۆر لوتبەرزو خۆ بەزلزان بوون و ڕەوانبێژبوون و قسەکانیان ڕازاندۆتەوە و جوانیان کردووە بۆ شتی ناحەق بۆ لەخشتەبردنی خەڵکان .

٧/ لەو ڕۆژەدا کەسانێک دەگەن بەخوای گەورە کە ئەمانە هەر لە دنیادا خوای گەورە بەیانیان لێیان توڕەبووە کاتێک دەرچوون و وە ئێوارانیش کە گەڕاونەتەوە بەخەشم و قین و توڕەیی خواوە گەڕاونەتەوە وە خوای گەورە لێیان ڕازی نیە بۆچی ؟ چونکە ئەمانە کاتێک لەدنیادابوون بەیانیان کە چوونەتە دەرەوە قامچیان پێ بووەو کە لەشێوەی کلکی مانگادایە لەخەڵکیان داوە پێی ( ستەم و زوڵمیان لەخەڵکان کردووە پێی ) بەهۆی ئەم زوڵم و ستەمەوە ئێوارانیان کە گەڕاونەتەوە بەخەشم و قین و توڕەیی خواوە گەڕاونەتەوە .

**تێبینی** / لەڕۆژی ئەمڕۆدا ئەو قامچی بەدەستانە زۆرن ئا ئەوانە بەیانیان کە دەرەچنە دەرەوە خوای گەورە لێیان توڕەیەو ئێوارانیش کەدەگەڕێنەوە لەخەشم و قینی خوای گەورەدا دەگەڕێنەوە لە ڕۆژی قیامەتیشا خوای گەورە لێیان ناڕازیە ( کە دەوترێت خوای گەورە لێی ناڕازیە واتە سزای سەختی ناو جەهەنەم دەدرێت و بۆی ئامادەکراوە ئەگەر تەوبە نەکات و وازی لێ نەهێنێت)

تۆ ئەی قامچی بەدەست تەوبە بکە تا مردن ئێخەی نەگرتوویت و لەخەشم و توڕەیی و قینی خوای گەورەدا ژیان مەگوزەرێنەو ئەو دنیاشت بەهەتا هەتایی مەدۆڕێنە

٨/ لەو ڕۆژەدا خەڵکانێک دەگەن بەخوای گەورە لێیان ناڕازیە و زۆر لێیان توڕەیە بەهۆی ئەوەی ئەمانە کاتێک چوونەتە تەوالێتەکان قسەیان کردووە لەگەڵ یەکتریدا وە شەرمیان نەکردووە عەورەتی خۆیان دەرخستووە و تەماشای یەکتریان کردووە .

## حاڵی سەرکردەکان لەڕۆژی قیامەتدا !

( مەبەست لەو سەرکردانەیە کە حوکمیان بە قورئان و سونەت کردووە تیایاندا بووە دادپەروەربووەو تیاشیاندا بووە زاڵم و ستەمکاربووە )

١/ لەو ڕۆژەدا کەسانێک هەن لە ژیانی دنیایاندا سەرکردەو فەرمانڕەوای خەڵکان بوون ئەمانە لەو قیامەتەیا ئاوات دەخوازن کە لە ئەستێرەی هەرەبەرزی ئاسمانەوە ( ثورەیا) ەوە فڕێ بدرانایەتە خوارەوە بەڵام هیچ کارێکی خەڵکانیان بەدەستەوە نەبووایە ،

پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەفەرمێ هاوارو بەهیلاکچوون بۆ کاربەدەستان و هەواڵگران و وەزیرەکان و ئەمیندارەکان ، کەسانێک ئاوات دەخوازن بە قژ هەڵبواسرانایە بە ئەستێرەی هەرەبەرزی ئاسمانەوە (ثورەیاوە) و بلەرانایەتەوە لەنێوان ئەرزو ئاسماندا بەڵام کاروباری خەڵکانیان بەدەست نەبووایە

پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەفەرمێ ئێوە سوردەبن لەسەر بەدەستهێنانی کاربەدەستی وە ئەوەش دەبێت بە پەشیمانی و ئاخ بۆتان لە ڕۆژی قیامەتدا

پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەفەرمێت هەرکەسێک سەروکاری ١٠ کەسی کردبێت یان زیاتر

لەو ڕۆژەدا دەستی بەستراوە بەملیەوە بەکۆت و زنجیر و دێتە بەردەم خوای گەورە یان چاکەکانی ڕزگاری دەکات یان خراپەکانی لەناوی دەبات

لەڕیوایەتێکی تردا تەنها دادپەروەریەکەی کۆت و زنجیرەکەی لەسەر لادەبات یاخود ستەمەکەی لەناوی دەبات

٢/ لەو ڕۆژەدا کەسانێک دێن کە سەرکردەبوون یان بەرپرسیارەتیەکی خەڵکانیان لەشاندا بووە و خوای گەورە شتێکی لە کاروباری خەڵکان خستۆتە ژێردەستیانەوە لە دنیادا ، ئەمانە خۆیان دزیوەتەوە لەپێویستی و کەم و کوڕی و هەژارییان ، لەو ڕۆژەدا ئەمانە خوای گەورە پێویستی و کەم و کوڕی هەژارییەکانیان

بۆ جێبەجێ ناکات ( مەبەست لە هەژاربوونیان بۆ کردەوەی چاکەو زۆری و گەورەیی تاوانەکانیان بەهیچ شێوەیەک چاوپۆشی لێناکرێت )

٣/ هەر کەسێک خۆی لە کۆمەڵی مسوڵمانان جیابکاتەوەو هەوڵی دەستخستنی دەسەڵات بدات هیچ نرخێکی نابێت کە دەگات بەخوا لە ڕۆژی کۆتاییدا

٤/ کاربەدەستان لە ڕۆژی کۆتاییدا دەهێنرێن و هەندێکیان کەم و کوڕیان کردووە لەفەرمانڕەواییەکەیاندا وە هەندێکیان دەست درێژیان کردووە ، خوای گەورە پێیان دەفەرمووێت : ئێوە کلیل بەدەستی خەزێنەکانی سەر زەوی من بوون وە شوانی مەڕەکانم بوون ، داواکاریەکانی من لای ئێوەیە ، ئینجا بەوەیان کە فەرمان ڕەواییەکەی بەکەم و کوڕی ئەنجام داوە پێی دەفەرمووێت : چی وایلێکردیت بەو جۆرە ڕەفتاربکەیت ؟ ئەویش دەڵێت : بۆئەوەی بەزەیی بم بۆیان . خوای گەورەش دەفەرمووێت : ئایا تۆ بەبەزەیی تر بوویت بۆ بەندەکانم لەمن . ئینجا بەوەیان دەفەرمووێت کە سنوری بەزاندووەو دەست درێژی کردووە : چی والێکردیت بەو جۆرە ڕەفتار بکەیت ؟ ئەویش دەڵێت : لەپێناوی تۆدا لێیان توڕەبووم . خوای گەورەش دەفەرمووێت : ئایا تۆ توڕەتر بوویت لەمن ( واتە : من لەدنیادا لێیان توڕەنەبووم ئەی تۆ بۆ لێیان توڕە بوویت ) پاشان خوای گەورە دەفەرمووێت : بیان بەن گۆشەیەکی دۆزەخیان پێ پڕبکەنەوە .

## بانگکردنی مرۆڤەکان بۆ لێپێچینەوە هەریەکەیان بەزمانی خۆی !

ئێستا کاتی لێپێچینەوە :

ئێستا کاتی ئەوەیە کە مرۆڤەکان بانگ بکرێن و یەک یەک بەزمانی خۆیان لێپێچینەوەیان لەگەڵدا بکرێت

**تێبینی** / هەموو بێدینەکان و بت پەرست و بێ باوەڕان و خۆرپەرست و ئاگر پەرست و بوزا پەرست و (ستالین و لینین) پەرست و ماسۆلینی و هیتلەرو عەلمانیەت پەرست و شەیتان پەرست و (قارون و نەمرودو فیرعەون) پەرست بت پەرستەکان هتد ، بەهەموو جۆرەکانیانەوە شوێن خواکانیان کەوتن و فڕێدرانە ناو دۆزەخەوە چونکە ئەمانە الله تعالی یان نەئەناسی خۆیان یان بەرنامەکانیان و فەلسەفەکانیان کردبوو بەخواو دەیانپەرست یان وەک فیرعەونەکان خۆیان لێ بوو بووە خوا و ئەمریان بەخەڵکان دەکرد بیان پەرستن بۆیە ئەمانە پێویست بە لێپێچینەوە ناکات و هەرزوو خۆیان و خوا پڕوپاگەندەو بەرنامە پڕوپوچەکانیان فڕێدرانە دۆزەخەوەو گۆڕەپانی مەحشەریان لێ خاوێن کرایەوە .

ئەوەی لێپێچینەوەی لەگەڵ دەکرێت بریتیە لە مسوڵمانی یەک خوا پەرست لەهەموو ئومەتانی گشت پێغەمبەران ئەگەر ئەم مسوڵمان و باوەڕدارانە چاکەکانیان زۆر بوو پێویستی بەتەرازوو نەبوو ئەوا تەنها لێپێچینەوەی لەگەڵ دەکرێت (واتە جارێ تەرازوو پێویست ناکات ) و دوای لێپێچینەوە بەرەو شوێنی خۆیان ڕەوانە دەکرێن و ڕوناکیان دەدرێتێ کە بەهۆیەوە بتوانن ڕێگا تاریک و سەختەکەی سەر پردی سیڕات ببڕن (دواتر باس دەکرێت ) ، ئەگەر پێویستیشی کرد تەرازوو بەکاردەهێنرێت بۆئەوەی بزانرێت کە ئایا چاکەی قورسە یان خراپەی ؟ ، ئایا شمولی شەفاعەت دەکات یان نا ؟ ، ئایا بەر ڕەحمەتی فراوانی پەروەردگار دەکەوێ یان نا ؟

خوێنەر بن بۆ تێگەیشتن لەم وردەکاری و حساباتە

لەو ڕۆژەدا یەکەم ئومەت کە لێپێچینەوەی لەگەڵ دەکرێت ئومەتی موحەممەدە (ﷺ) دوای ئومەتی محمد ئومەتەکانی تر لێپێچینەوەو حساب و کتابیان لەگەڵ دەکرێت

لەبەشەکانی پێشودا باس کرا کە سێ جۆر لێپێچینەوە هەیە یەکەمیان بەبێ حساب و کتاب دەچنە بەهەشتەوەو ٥٠٠ ساڵ لەبەهەشتدا ئیسراحەت دەکەن ژمارەشیان ٧٠ هەزار کەسە کە دەچنە بەهەشتەوە بەبێ لێپێچینەوە

لەکاتێکا باقی زیندەوەران هێشتا لە گۆڕەپانی مەحشەردان و حساب و کتابیان لەگەڵ نەکراوە

دووەم لێپێچینەوەی ئاسان ( باس کرا لەبەشەکانی پێشوو)

سێیەم ئەوانەی تاوانی زۆر گەورەیان کردووە خوای گەورە ڕەحمەتی خۆی دەڕژێنێ بەسەریاناو تاوانەکانیان دەخاتە سەر شانی جولەکەو نەسڕانیەکان ( چۆنێتی ئەمەش باسکرا )

لەو ڕۆژەدا چاکەو خراپەی بەندەکان دەهێنرێت و بەهەندێکیان تۆڵەی هەندێکی تریانی پێ دەسێنرێت ، گەر دوای ئەوە بەندە چاکەی تری بۆ مایەوە ئەوکات خوا بۆی گەورە و فراوان دەکات لەبەهەشتدا

لەو ڕۆژەدا پەروەردگار کە بەندەکانی حەشر دەکات بەڕووتی و بەپێ پەتی ...هیچ شتێکیان لەگەڵدا نیە ئینجا پەروەردگار بانگیان لێ دەکات بەدەنگێک کە ئەوانەی دوورن گوێیان لێیە وەک ئەوانەی نزیکن و دەفەرمێت : من پاشام من تۆڵەسێنەرم نابێت هیچ کەسێک لەبەهەشتیەکان بچێتە ناو بەهەشت و هیچ کەسێکیش لە دۆزەخیەکان بچێتە ناو دۆزەخەوە ئەگەر ستەمێکی کردبوو هەتا تۆڵەی بۆ لێ دەسێنمەوە تەنانەت ئەگەر زلەیەکیش بێت ...)

یەکەم تاوان لەو ڕۆژەدا کە حوکمی لەسەر دەدرێت لەنێوان خەڵکیدا بریتیە لە تاوانی خوێن ڕشتن

لەو ڕۆژەدا ئەوەی پیاوێکی بەستەم و زوڵم کوشتبێ ئەوا هەزار جار دەکوژرێت و زیندوو دەکرێتەوە بەهەمان شێوەو شێوازی کوشتنەکەی لە دنیادا

لەو ڕۆژەدا کوژراو بکوژەکەی خۆی دێنێت و دەستی بەدەستیەوەیەتی وە ناوچەوانی و سەری خۆی بەهەردوو دەستیەوەیەتی و شادەمارەکانی خوێنی لێ دەڕژێت و دەڵێت ئەی پەروەردگار ئا ئەمە منی کوشت ، هەتا نزیکی دەکاتەوە لە عەرش ، ( خوای گەورە پێی دەفەرمێ بۆچی کوشتت ) ؟ بکوژیش دەڵێت : بۆئەوەی سەربەرزی بۆ فڵانە کەس بێت - لەڕیوایەتێکدا - ( لەبەر موڵک و سامانی فڵانە کەس ) ، بکوژەکە تاوانەکانی کوژراوەکەی لەسەر دادەنرێت ( وە خوای گەورە بە بکوژەکە دەفەرمووێت : ڕیسوا بوویت و دەبرێت بەرەو ئاگر )

لەفەرموودەیەکی تردا : لێی دەپرسن بۆچی کوشتت ؟ بکوژیش دەڵێت فڵانە کەس فەرمانی پێ کردم بیکوژم ، ئا لەوێدا فەرمان کار (ئەوەی فەرمانی پێکردووە) و بکوژەکە وەک یەک سزا دەدرێن )

**تێبینی** / تاوانی کوشتن هێندە گەورەیە لای خوای گەورە بەجۆرێک خوای گەورە ڕەخنەی لە پێغەمبەر موسا (علیە سلام) گرت لەسەر کوشتنی کافرێک کە بە ئەنقەستیش نەی کوشتبوو )

لەو ڕۆژەدا ئەوەی بکوژە ئەگەر نوێژ و ڕۆژوو و زەکاتیشی دابێت ئەوا موفلیس دەبێت و هەموو چاکەکانی دەدرێت بە کوژراو و ئەگەر بەشیشی نەکرد ئەوا تاوانەکانی کوژراو دەدرێت بەسەریدا و پاشان فڕێ دەدرێتە ناو دۆزەخەوە

**تێبینی** / تەوبەی نەسوح و واز هێنان لەم تاوانە ئێجگار گەورەیەو پێدانی حەقی خوێنی کوژراو(بەمەرجێک بەیەکجاری وازبێنێت و ئامادەی کوشتنەوەشی بێت لەدادگای ئیسلامدا) ئەمانە باری شانی بکوژ سوک دەکات لە ڕۆژی قیامەتدا ، وە ئەگەر حوکمی ئیسلام هەبێت ئەوا بکوژ دەبێ بکوژرێتەوەو بەکوشتنەوەشی تاوانەکەی لەسەر لادەچێت ( ئەگەر بکوژ بەپێی خۆی بڕوات بۆ لای قازی لەکاتێکا دەشزانێت کە دەکوژرێتەوە ) والله اعلم

لەو ڕۆژەدا یەکەم دوو کەسێک دەمەقاڵەیان دەبێت لەو گۆڕەپانەدا بریتین لە دوو دراوسێ وە هەروەها پاش ئەوە چەندین دراوسێ لەو ڕۆژەدا یەخەی دراوسێکەی خۆی دەگرێت و پێی دەڵێ : پەروەردگار ئائەمە دەرگاکەی بەڕوومدا داخستبوو وە لە چاکەکانی منی بێ بەش کردبوو

لەو ڕۆژەدا یەکەم کەس کە بانگی لێدەکرێت پیاوێکە قورئانی کۆکردۆتەوە ( واتە لەبەری کردووەو لێی تێگەیشتووە ) و خوای گەورە پێی دەفەرمووێت ئایا فێرم نەکردیت ئەوەی کە ناردبوومە خوارەوە بۆ سەر نێردراوەکەم ؟ ئەویش دەڵێت بەڵێ ئەی پەروەردگار ، دەفەرمووێت : کاری چیت پێکرد بەوەی کە زانیت؟ ئەویش دەڵێت ( زانست فێربووم و خەڵکانی تریشم فێرکرد وە لەپێناوی تۆدا قورئانم خوێند ) لەدرێژایی شەو و ڕۆژدا ، خوای پەوەردگار دەفەرمووێت : درۆت کرد !! مەلائیکەتەکانیش پێی دەڵێن درۆت کرد !! خوای پەروەردگاریش دەفەرمووێت : زانست فێربوویت بۆئەوەی پێت بڵێن زانایت ، و قورئانت خوێندەوە بۆئەوەی پێت بوترێت قورئان خوێنە ، و پێشت وترا ( واتە : خەڵکان لەدونیادا پێیان وتیت تۆ زاناو قورئان خوێنیت ) ، ئینجا فەرمان دەکرێت کە ڕابکێشرێت لەسەر دەم و چاوی تا فڕێ دەدرێتە ناو دۆزەخەوە .

لەو ڕۆژدا دووەم کەس دەهێنرێت کە خوای پەروەردگار دەرووی خێری لێ کردۆتەوە و لەهەموو جۆرەکانی سامانی پێ بەخشیوە ، دەیهێنێت و نیعمەتەکانی خۆی نیشان دەدرێتەوە تا دەیناسێتەوە ( بەدەنگ و ڕەنگ هەروەک شاشەیەک والله اعلم چونکە وزە لەدنیادا لەناو ناچێت و فریشتەکانیش هەموویان تۆمار کردووە)، خوای پەروەردگار پێی دەفەرمووێت : ئایا دەرووم لێ نەکردبوویتەوە هەتا وام لێکردیت کە پێویستت بەکەس نەبێت ؟ ئەویش دەڵێت : بەڵێ ئەی پەروەردگار ، پێی دەفەرمووێت : چیت کرد لەوەی کە پێم بەخشیت ؟ ئەویش دەڵێت : خزمانم پێ بەسەرکردەوەو لێم کرد بەخێر ( هیچ ڕێگەیەکم بەجێ نەهێشت کە تۆ پێت خۆش بێت تیایدا سەرف بکرێت لەهەموو ئەو ڕێگایانەدا بەخشیم لەپێناوی تۆدا ) ، خوای گەورە پێی دەفەرمێت : درۆت کرد !! مەلائیکەتەکانیش پێی دەڵێن درۆت کرد ئینجا پێی دەوترێت : ( بەڵام تۆ بۆیە واتکرد بۆئەوەی پێت بوترێت خێرومەندە و پێشت وترا ( واتە : لەدنیادا پێت وترا خێرومەندە) : ئینجا فەرمان دەکرێت کە لەسەر دەم و چاو ڕابکێشرێت تا فڕێ دەدرێتە ناو دۆزەخەوە .

لەو ڕۆژەدا سێیەم کەس بانگ دەکرێت کە لە پێناوی ڕێگەی خوای گەورەدا کوژراوە ، خوای گەورە پێی دەفەرمووێت : لەچیدا کوژرایت ؟ ئەویش دەڵێت : ئەی پەروەردگار فەرمانت بە جیهادکردن دا لە پێناوتدا منیش جەنگام لەپێناوی تۆدا تا

کوژرام ، خوای پەروەردگار پێی دەفەرموویت درۆت کرد و مەلائیکەتەکانیش پێی دەڵێن درۆت کرد ، خوای گەورە پێی دەفەرمووێت : بەڵکو ویستت کە پێت بوترێت فلاَن کەس چاونەترسەو پێشت وترا ، ئینجا فەرمان دەکرێت کە ڕابکێشرێت تا لەسەر دەم و چاو تا فڕێ دەدرێتە ناو دۆزەخەوە

ئەم سیانەی باس کران یەکەم کەسانێکن کە ئاگری دۆزەخیان پێ گەرم دەکرێت لەو ڕۆژەدا

لەپاش ئەو سیانە لەهەموو تاقم و کۆمەڵێک گەورە تاوانبارانیان لەپێشدا فڕێ دەدرێتە ناو دۆزەخەوە یەک بەدوای یەکدا

## کێن ئەوانەی وازیان لێ ناهێنرێت ؟
## یان سزا دەدرێن ! یان رزگاریان دەبێ !

لەو ڕۆژەدا چەند چینێک هەن کە تۆڵەیان لێ دەسەندرێتەوەو وازیان لێ ناهێنرێت تا ماف بۆ خاوەن مافەکان دەگێڕدرێتەوە ئیتر یان ئەوەتا ڕزگاری دەبێت یان سزادەدرێت !

١/ لەو ڕۆژەدا کەسانێک دەهێنن و تۆڵەیان لێدەسێندرێتەوەو حەددی (جەڵدی)یان لێدەدرێت چونکە ئەمانە تۆمەتی زینایان داوەتە پاڵ خەڵکان بەبێ ئەوەی بەچاوی خۆیان بینیبێتیان ، مەگەر ئەو تۆمەتە ڕاست بووبێت

**تێبینی** / ئەم بوهتان چیانە هەنێکیان لەسەر تاریکاییەکانی پردی سیڕات ڕادەگیرێن و پێیان ئەوترێت بەڵگە بێنن بۆ بوهتانەکانتان کە کردووتانە لەوێدا دەوەستێنرێن و ڕێیان پێنادرێت بپەڕێنەوە هەتا بەڵگە دێنن یان سزا دەدرێن لەسەر بوهتانەکانیان و فڕێ دەدرێنە ناو دۆزەخەوە

٢/لەو ڕۆژەدا کەسانێک دێن بەتوندترین شێوە سزادەدرێن و تۆڵەیان لێدەسێندرێتەوە چونکە ئەمانە لە دنیادا سزای خەڵکانیان بەسەختی داوە و لێیان داون

لەو ڕۆژەدا کەسانێک دێنن کە هەتکی ڕۆح لەبەرەکانیان کردووە( گوێ و لوت و کلکیان بڕیون ) و بەهەمان شێوە لەو ڕۆژەدا هەتک دەکرێنەوە

لەو ڕۆژەدا لێپێچینەوە لەگەڵ هەموو ئەوانەدا دەکرێت کە باڵندەیەکیان کوشتووە بەناحەق و سودیان لێ نەبینیون واتە کوشتویانن یان سەریان بڕیون و فڕێیان داون بەبێ ئەوەی خواردبێتیان یان سودیان لە گۆشتەکانیان بینیبێت

٣/ لەو ڕۆژەدا خەڵکانێک دێن موفلیس دەبن هیچیان بەدەستەوە نامێنێ لە کاری چاکەو نوێژ و عیبادەت ، ئەم خەڵکانە نوێژو زەکات و ڕۆژوو عیبادەت و خێرو چاکەیان زۆرە بەڵام لەو ڕۆژەدا موفلیس دەبن بەهۆی ئەوەی ئەمانە لە دنیادا جنێویان داوە و غەیبەت و بوهتانیان کردووە و ماڵی ئەم و ئەویان خواردووە و

خوێنی ئەوی ڕشتووەو لەوی داوە بۆیە لە چاکەکانی ئەم جۆرە کەسانە دەدرێت بەو کەسانەی کە ئەم بوهتانی بۆ کردوون وە دەدرێت بەو کەسانەی کە بەناحەق لێی داون وە دەدرێت بەو کەسانەی کە جنێوی پێداون وە دەدرێت بەو کەسانەی پارەی خواردوون وە دەدرێت بەو کەسانەی کە خوێنی ڕشتوون ، ئەگەر هاتوو چاکەکانی تەواوبێت و بەشی مافی کەسانی تر نەکات (واتە پێش ئەوەی مافی خەڵکی لانەمێنێت) ئەوا لە خراپەکانی ئەوان هەڵدەگیرێت و فڕێ دەدرێتە سەر تاوانەکانی و پاشان فڕێدەدرێتە ناو ئاگرەوە

بەڵام لەو ڕۆژەدا ئەو کەسانەی کە قەرزیان کردووەو نیەت و مەبەستیان دانەوەی قەرزەکانیان بووە و مردن و ئەجەل ماوەی نەداون ئەوانە خوای گەورە خۆی قەرزەکانیان بۆ دەداتەوە

لەو ڕۆژەدا پیاوێک دەهێنرێت تەماشای چاکەکانی دەکرێت کە بۆی کۆکراوەتەوە وادەزانێ کە فریای دەکەوێت، یەکێک هاواردەکات : کێ ستەمی لێکراوە لەلایەن فڵان کەسەوە با بێت، (پیاوەکە تەماشادەکات) باوک و دایکی و خێزانەکەی و بەردەستەکەی و ئەوانەی کە ستەمێکی ئێجگار کەمیان لێکراوە لەلایەن ئەم کەسەوە دێن و پێیان دەوترێت: لەچاکەکانی ببەن بەقەدەر ستەمەکەی کە لێی کردوون هەتا هەموو چاکەکانی تەواودەبێت ، وە ستەمێکی زۆری هێشتا بەسەرەوە ماوە ، دەوترێت : خراپەکانی ئەو کەسانە بەرن بیخەنە سەری بەقەدەر ئەو ستەمانەی کە لێی کردوون و دواتر دەست بەتاڵ دەردەچێت و دەیبەن بۆناو ئاگر

**تێبینی** / بیهێنە پێش چاوی خۆت لەم دنیایەدا ناتەوێ چارەی کەسێک ببینیت و کەیفت پێی نایەت وە تۆش دنیایەک غەیبەت و بوهتانی بۆ دەکەیت لەلای ئەم و ئەو بەردەوام باسی دەکەیت و دەیبوغزێنیت ئینجا لەو ڕۆژەدا ئەو کەسەی کە زۆرت ڕق لێبوو دەیهێنن و لەچاکەکانتی دەدەنێ و وە خراپەکانیشی ئەدەن بەسەر کۆڵتا ، کەواتە هەرچەنە لەناخەوە ڕقت لەکەسێک بوو ئاگاداربەو زمانت بپارێزە لەباسکردنی چونکە سبەی ئەمە حاڵت دەبێ لەگەڵیا ، هەوڵدەن دڵساف و نەرم بن لەگەڵ هەموو کەسانێکدا چونکە دنیا ئەوە ناهێنێ ڕق لەکەس هەڵگریت بۆی بەڵکو ناڕەحەتی گەورە لەو قیامەتەیایە دوو ڕۆژێکی دنیا ئەوە ناهێنێ خەڵکانی تیا ببوغزێنیت و بوهتان و غەیبەتیان بۆ بکەیت و ئەو دنیاشت لەدەست بدەیت بەهۆیەوە .

٤/ لەو ڕۆژەدا خەڵکان بەبەردەوامی دەمەقاڵێ و مناقەشەیان دەبێت لەنێوانی خۆیاندا هەتا ئەو کاتەی کە خوای گەورە حەق دەگێڕێتەوە بۆ خاوەن حەقەکەو ناحەقەکەش سزادەدرێت لەنمونەی ئەو دەمەقاڵێ و موناقەشانە کە دەکرێت لەنێوان خەڵکانی ئەو ساحەیەدا بریتیە لەوەی ( ئەگەر مسولمانێک مسوڵمانێکی تری بەناحەق کوشتبوو یان تاوانێکی بەرامبەر ئەنجام دابوو ئەوی تریش نکوڵی لێ دەکرد و وەیان تاوانێکی تایبەتی بەرامبەر ئەنجام دابوو وە بەهۆیەوە دەبێتە دەمەقاڵێیان ...هتد) ئەمانە تا دەگەنە بەردەم حەق و حساب و لێپێچینەوە موناقەشەیان دەبێت و تا خوای گەورە حەق بۆ خاوەن حەقەکە دەگێڕێتەوە، هەموو دروستکراوێک موناقەشەو دەمەقاڵەیان دەبێت لەگەڵ یەکدا، تەنانەت دوو شەکیش (دوو مەڕی یەک ساڵ) دەمەقاڵەیان دەبێت لەسەر ئەو شتەی شەڕە شاخیان لەسەر کردووە

٥/ لەو ڕۆژەدا پیاوێک دەهێنن بۆ لێپێچینەوە ئەم پیاوە لە خزمەتکارەکانی داوە یان جنێوی پێداون بەهۆی ئەوەی خزمەتکارەکانی خیانەتیان لێکردووەو درۆیان لەگەڵ کردووە و سەرپێچیان کردووە ، لەو ڕۆژەدا تاوانی هەردوو لا هەژمارو پێوانە دەکرێت ئەگەر هاتوو سزای پیاوەکە زیاتر بوو لە تاوانی خزمەتکارەکانی ئەوا ئەو پیاوە تۆڵەی لێ دەسەندرێتەوە وە بەپێچەوانەشەوە ئەگەر خیانەتی خزمەتکارەکان زیاتر بوو ئەوا تۆڵەیان لێ دەسەندرێتەوە

(کەواتە تا دەتوانی باش بە بۆ ئەو کەسانەی خراپن بەرامبەرت چونکە هەموو شتێک هەژمارو پێوانە دەکرێت لەو ڕۆژەدا )

٦/ هەر کەسێک ستەم لە بێ باوەڕێکی ڕێگەپێدراو لەلایەن دەوڵەتەوە لەوڵاتی مسوڵماناندا (معاهد) بکات و سوکایەتی پێ بکات یان شتێکی لێ داوابکات کە لە توانایدا نەبێت یاخود شتێکی لێ بسەنێت بەبێ ڕەزامەندی خۆی ، ئەوا پێغەمبەری خوا (ﷺ) خۆی لەو ڕۆژەدا داوای تۆڵەی بۆ دەکات وە داواکار دەبێت لەسەر ئەو کەسەی کە ستەمەکەی لە بێ باوەڕەکە کردووە ( پێغەمبەری خوا داواکاری گێڕانەوەی مافی بێ باوەڕەکە دەبێت لە مسوڵمانەکە کە ستەمی کردووە )

٧/ لەو ڕۆژەدا هەر کەسێک خیانەتی بەرامبەر خێزانی موجاهیدێک کردبێ ئەوا ئەو خیانەتکارەی بۆ ڕادەوەستێنرێ و پێی دەوترێت ( ئا ئەمە فڵانی کوڕی فڵانە لە چاکەکانی ببە ) ، پاشان هەموو چاکەکانی دەبات و هیچی لێ جێ ناهێڵێت

٨/ لەو ڕۆژەدا ( ڕەحم و بەزەیی خزمایەتی) کە بەشێکە لە ناوی خوای گەورە دێت و قسەدەکات بەزمانێکی پاراو ( دەڵێت ئەی پەروەردگار من ستەمم لێکراوە ، من خراپەکاریم بەرامبەر کراوە ، من پچڕێنراوم ، پەروەردگاریش وەڵامی دەداتەوەو دەفەرموێت : ئایا ڕازی نابیت ؟ ئەوەی کە تۆی پچڕاندووە منیش هەموو میهرەبانی خۆمی لێ دەپچڕێنم وە ئەوەی کە تۆی گەیاندووە منیش هەموو میهرەبانی خۆمی پێ دەگەیەنم ) ، ڕەحمەکەش (لەوێ) هەر کەس دەستنیشان بکات کە گەیاندوویەتی خوای گەورەش هەموو چاکەیەکی پێدەگەیەنێت وە هەر کەس دەست نیشان بکات کە پچڕاندوویەتی خوای گەورە هەموو چاکەیەکی لێ دەپچڕێنێت ) .

**تێبینی** / تەنها بۆ تێگەیشتن : سیلەی ڕەحم و بەزەیی وەک (ئامێرێک و ڕۆبۆتێکی کۆمپیوتەری) هەموو ئەو کەسانەی لەناودا تۆمار کراوە کە لەدنیادا پەیوەندی خزمایەتیان گەیاندووە و هەموو ئەوانەش کە نەیانگەیاندووە .

٩/ لەو ڕۆژەدا توندترین لێپێچینەوە کە دەمێنێتەوە لەدوای خەڵکان بەسەر ئەو کەسانەوەن کە خاوەن سامان و دەسەڵاتدار بوون بەجۆرێک ئەو کەسەی خاوەنی تەنانەت دوو درهەم ( دوو دۆلار) یش بێت لێپێچینەوەی سەختر دەبێت لەوەی خاوەنی یەک درهەم یان یەک دۆلار بووبێت

١٠/ لەو ڕۆژەدا ئەو کەسانەی کە دایک و جگەرگۆشەکەی یان باوک و منداڵەکەی لەیەک کردبێت و جیاوازی خستبێتە نێوانیانەوە یان خۆشەویستانی لەیەک کردبێت ئەو کەسانە لەو گۆڕەپانەدا خوای گەورە لە خۆشەویستانیان دووریان دەخاتەوە .

## هەندێک کردەوە لەدەست مەدەن پێش قۆناغی پرسیارە جدییەکان !

ئێستا لە قۆناغێکداین لە گۆڕەپانی مەحشەر کە تاک تاکی مسوڵمانان وەستێنراون و یەک یەک دەبرێنە بەردەم خوای گەورە ، پەروەردگاریش لە پشت پەردەوە لێپێچینەوەی لەگەڵ دەکات و پاشان پرسیاری لەسەر چەند شتێک لێ دەکات دوای پرسیارە جدییەکان ئەگەر پێویستی کرد تەرازووی کردەوەکان دەکرێت

**تێبینی** / هەندێک بەندە هەیە هێندە تاوانبارە تەرازووی پێویست نیە

ئەمەی تا ئێستا باسمان کردووە تەنها لێپێچینەوە بووە کە جیاوازە لە پرسیارە جدییەکان کە لە تاک تاکی مسوڵمانان دەکرێت پاش وەڵامی پرسیارەکان نامەی کردەوەکان بە دەرچوو یان دەرنەچوو دەدرێتە دەست مسوڵمانەکەو چارەنوسیشی دیاری دەکرێت ( دواتر بە وردەکاری باسی دەکەم )

پێش گەیشتن بە (پرسیارە جدییەکان و چارەنووسەکان و نامەی اعمال) هەندێک کردەوە هەیە لەدەست خۆتانیان مەدەن : بۆچی ؟ خوێنەربن :

**١/** یەکەم پێوەری هەموو کردەوەکانت بریتیە لە شایەتمان ( کە تەنها خوا بەحەق بزانیت بۆ پەرستنی و مەیلت بۆ هیچ زاڵم و زۆردارێک نەبێت وە مەیلت بۆ هیچ دین و بەرنامەیەکی تر نەبێت لەغەیری بەرنامەی ئیسلامی خوای گەورە ) وە سەرجەم ئەو مرۆڤانەی کە خوا هەڵیبژاردوون بۆ گەیاندنی وتەو بەرنامەو پەیامەکانی خۆی بۆ ناو مرۆڤایەتی (مەبەست لە پێغەمبەرانە) بەحەقیان بزانیت و شوێن بەرنامەکانیان بکەویت بەو شێوەیە خوا بپەرستی کە خوای گەورە ئەو پێغەمبەرانەی فێرکردووەو ئەوانیش ئێمەیان فێرکردووە . وە ئیسلامیش کۆتا پەیامی الله تعالی یەو کۆکراوەی سەرجەمی دینی هەموو پێغەمبەرانە علیهم السلام کە هەموویان فەرمانیان کردووە خوا بەتەنها بپەرستین و کوفر بکەین بە هەموو دین و بەرنامەیەکی تری غەیری ئیسلام و تەوحید (کوفر بە تاغوت) بکەین

٢/ دەبێ قوربانیکردن و قوربانیدانت تەنها بۆ خوای گەورە بێت تەنانەت جائیز نیە قوربانی بدەیت بۆ پێغەمبەریکیش چ جای قوربانی بدەیت لەپێناوی مرۆڤێکی زاڵمی گۆشت و خوێنی وەک خۆت ، قوربانیکردن بە ئاژەڵ تەنها بۆ خوای گەورە دەبێت و قوربانیدانیش تەنها بۆ سەرخستنی پەیام و دینی خوای گەورە دەبێت بۆچی ؟ چونکە تۆ یەک ژیانت هەیە یەک ڕۆح و لاشەت هەیە و یەک تەمەنت هەیە یەک دەرفەتی بەدەستهێنانی بەهەشتت هەیە ئیتر چۆن دێیت دەیکەیتە قوربانی لەپێناوی مرۆڤێکا کە ئەویش وەک تۆ یەک ژیان و یەک دەرفەتی هەیە !؟ ئینجا ئەو مرۆڤە بێدین بێت یاخود مسوڵمان بێت ! بۆیە قوربانی کردن و قوربانی دان تەنها بۆ خوای گەورەو بەرنامەکەی دینی خوای گەورە دەکرێت .

٣/ نوێژ : لەقیامەتا نوێژ بەو دوو مەرجەی خاڵی یەک و دوو ئەگەر بەجدی ئەنجامتدا و کەم و کوڕی نەبوو هەمووی بەڕێک و پێکی لەکاتی خۆیدا ئەنجامتداو لێت نەفەوتاندن ئەوکات ئەم نوێژانە دەبنە هۆکاری ئەوەی سەرجەم کردەوە چاکەکانی ترت لێ وەربگیرێت و بەهۆشیەوە پاداشتەکانیان گەورە بکرێت ( تەنها ئەو کردەوانە کە بەس لەبەر خوا ئەنجامتداون ) ، ئاگاداربە شەو و ڕۆژ نوێژ بکەیت بەڵام مەیلت بۆ زاڵمێک یان بێدینێک هەبێت یان بۆ دوژمنێکی خوا هەبێت لەزیادە نوێژت کردووە لێت وەرناگیرێ چ جای سەرخەرو شوێنکەوتەیان بیت .

٤/ لەو ڕۆژەدا کردەوەیەک هەیە زۆر زۆر پاداشتت گەورە دەکات ئەگەر ئەنجامت دابێ لەدنیادا بەجۆرێک ئەم کردەوەیە بریتیە لە چاکترین و پاکترین و ڕازیترینیان لای پەروەردگار کە لە بەخشینی ئاڵتوون و زیو چاکترە تەنانەت لە پاداشتی ڕووبەڕووبوونەوەی دوژمنیش گەورەترە ئەویش بریتیە لە زیکرو یادکردنی خوای گەورە ( وەک زیکرەکانی لا اله الا الله و سبحان الله و الحمدلله و الله اکبر ...هتد)

لەو ڕۆژەدا هیچ کەسێک پاداشتی ناگاتە ئەو کەسەی کە ئەم زیکرانەی کردووە ئیلا مەگەر یەکێک کە لەو زیاتری کردووە .

هەروەها زیکرو یادی خوا بریتیە لە کۆڕو مەجلیسەکانی مزگەوتەکان کە تیایدا باسی خوای گەورەو ڕوونکردنەوەی پەیامەکەی دەکرێت . (بۆیە بەشداربە لەدەرس و وانەکانی مزگەوتەکان ) چونکە ئەم مەجلیسانە مەگەر خوای گەورە تەنها خۆی بزانێت ئەجرەکەی چەنێ گەورەیە !!!

٥/ لەو ڕۆژەدا بانگ کارێک بانگ دەکات بەناو گۆڕەپانی مەحشەرداو دەڵێ ئەمڕۆ گەورەترین ڕێز بۆ ئەو کەسانەیە کە شەونوێژیان کردووەو ئەو کەسانەی کە زۆرترین زیکری خوای گەورەیان تیاکردووە ( بازاڕو تیجارەت لە زیکری خوا داینەبڕیون ) ئەو کەسانەی کە زۆرترین حەمدو سوپاسی خوایان کردووە ، ئەوانە چاکترین خەڵکانێکن لەو ڕۆژەدا ، بیهێنە پێش چاوی خۆت لەو ڕۆژەدا ناوت بخوێندرێتەوە لەناو ملیارەها مسوڵمان و مرۆڤی مەحشەردا بەوەی کە یەکێک بوویت لەوانەی زۆرترین شەونوێژت ئەنجام داوە !!! وە بەهۆیەوە گەورەترین ئەجرت بەدەست هێناوە . (ئەمانە یەکێکن لەوانەی کە بەبێ لێ پرسینەوە دەکرێنە بەهەشتەوە )

٦/ لەو ڕۆژەدا پلەی خەڵکانێک هێندە بەرزدەکرێتەوە کە وەک پلەی پێغەمبەرێک وایە بەرامبەر کەسێکی بچوکی ناو مسوڵمانان ، بۆچی ؟ چونکە ئەم کەسانە زانا بوون و هەوڵ و کۆششی تەواویان داو خۆیان فێری زانستی شەرعی بەتایبەتی وە زانستەکانی تر بەگشتی کرد بۆ سەرخستنی دینی خوای گەورە بۆیە کەسێکی زاناو لێهاتوو و بەشەرع و زانستی دینی خوای گەورە وەک پلەی پێغەمبەرێک وایە بەرامبەر کەسێکی نا زانای عابدی ناو مسوڵمانان .

پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەفەرمووێت  پلەی زانا بەبەراورد لەگەڵ خواناس وەک پلەی من وایە بەبەراورد لەگەڵ بچوکترین کەسی ئێوەدا .

ئەگەر دەتەوێ ئەو پلەیە بەدەست بێنی یەکەم نیەتت تەنها بۆ خوا بێت دووەم دوعای زۆر بکە کە خوای گەورە بەکارت بێنێ تەنها بۆ سەرخستنی دینەکەی سێیەم شەو وڕۆژ بە ئازایانە بەبێ تەمەڵی و بەبێ لاوازی هەوڵی فێربوونی شەرع و زانستەکەی بدە چوارەم پەلە مەکە لەفێربوونیاندا چونکە تەمەنێکی (چەند ساڵێکی ) دەوێ تا دەگەیتە ئەو پلەیە .

٧/ لەو ڕۆژەدا کەسانێک پلەیان زۆر زۆر گەورەیەو چاکەی زۆریان بۆ تۆمارکراوە پێش گەیشتن بە پرسیارکردن ئەوانیش ئەوانەن کە دوعایان زۆر زۆر کردووە ، بۆچی ؟ چونکە دوعاکردن بەتەنیاو لە شوێنێکدا کە کەست لێوە دیار نەبێت ئەوپەڕی ئیخلاسە بۆ خوای گەورە وە هیچ ڕیاییەکی تیا نیە ، ئەو کەسانەی کە دوعایان کردووە بۆ گەیشتن بە شتێک یان کەسێک یان ئامانجێکی ژیانیان بەلام خوای

گەورە پێی نەداون لەدنیادا ئەو کەسانە لە قیامەتدا بۆ وەڵامی ئەم دوعایانەیان خوای گەورە پاداشتێکی زۆر گەورەیان دەداتەوە بەمەرجێک دوعاکانیان لەدنیادا بۆ تاوان و پچڕانی پەیوەندی خزمایەتی نەبووبێت .

دوعا زۆر زۆر بکەن بەتایبەتی کە بەتەنهان یان هەوڵدەن ژوورێک تایبەت بکەن لە ماڵەکانتانا بیکەن بە (مزگەوت و شوێنی نوێژ و عیبادەت و دوعا) وە لەکاتی دوعادا ئەگەر کەسێک هاتە بەردەمت یان ژوورەوە ئەوا دوعاکەتی بۆ مەبڕە چونکە ئەو ئەجرە گەورەیە لەدەست دەدەیت بەڵکو بەردەوام بە لە پاڕانەوەکانت و گوێی پێ مەدە .

٨/ دامرکاندنەوەی فیتنەو کۆمەڵی سەرلێشێواوەکان وەک خەواریجەکان پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەفەرموویێت لەهەر شوێنێکا پێیان گەیشتن بیانکوژن چونکە لە کوشتنیاندا پاداشت هەیە بۆئەوەی کە دەیانکوژێت لەڕۆژی کۆتاییدا

**خــەواریــج** : ئەوانەن کە بەڕاست و چەپ خەڵکان کافر دەکەن بەجۆرێک ئیمامە بەڕێزەکانی وەک ئیمامی شافیعی و مالک و ابو حەنیفەو ...هتد (ڕەحمەتی خوایان لێبێ) تەنانەت زۆرینەی هەرە زۆری عولەمایانی مێژووی ئیسلام تا ئەم سەردەمەش کافر دەکەن ، تیایاندایە هێندە گومڕایە تەنها پێغەمبەری خواو هەندێک لە هاوەڵانی هێشتۆتەوە باقی ئومەتی کافرکردووە ، خەواریجەکان ئەوانەن کە لەسەردەمی حوکمڕانی ئیمامی عەلی (خوای گەورە لێی ڕازی بێت) هەڵگەرانەوەو ئیمامی عەلیان بەکافر زانی و جەنگان لە دژی ، کوشتنی ئەو خەواریجانە ئەجرێکی گەورەی هەیە لەڕۆژی قیامەتدا .

٩/ کەسانێک لەو ڕۆژەدا کە خێرێکیان کردووە لەپارەی حەڵاڵ و لە کاسپی پاکەوە ئەوانە دێن پاداشتی خێرەکانیان زۆر گەورەکراوە بەجۆرێک دەنکە خورمایەکیان بۆ کراوە بە شاخێک (واتە هێندە گەورە کراوە) چونکە ئەمانە تەنها بۆ ڕازی بوونی خوای گەورە کردوویانە و لەپارەی حەڵاڵ خێرەکانیان کردووە دوور لەڕیاو دەرکەوتن ، وە خوای گەورە خێر لە پارەو کاسپی پاکەوە نەبێت وەری ناگرێت و بەرزنابێتەوە ، نمونەی ئەم جۆرە خێرکردنانە وەک ئەوەیە کە بیخاتە دەستی خوای گەورەوە و خوای گەورە بۆی گەورەو پەروەردە بکات وەک چۆن یەکێک لە ئێوە ئاژەڵێکی لە شیر بڕاوە پەروەردەو گەورە دەکات .

١٠/ ئەو کەسانەی کە بەختەوەربوون لە دنیایاندا لەو ڕۆژەدا ئاوات بەو کەسانە دەخوازن کە بەڵاداربوون بەجۆرێک ئەم بەختەوەرانەی دنیا خۆزگە دەخوازن بە مەقاش پێستەکانیان کەرت کەرت بکرایە ، بۆچی ؟ چونکە باوەڕدارە بەڵادارەکان کە هیچ خۆشیەکیان بەخۆیانەوە نەدیوە ئەجرێکی زۆر گەورەیان دەدرێتەوە لەسەر ئەو هەموو بەڵاو نەهامەتی و ناخۆشیەی کە هاتۆتە ڕێیان لەپێناوی دەستگرتن و مانەوەو سەرخستن و گەیاندنی دینی خوای گەورەدا ، مسوڵمانە بەختەوەرەکانی دنیا کە توشی بەڵاو نەهامەتی و فیتنە نەهاتوون لەو ڕۆژەدا خۆزگە دەخوازن کە لەدنیادا ئەمانیش بە مەقاش پێستیان کەرت کەرت بکرایە تا وەکو ئەوان ئەو پاداشتە گەورانەیان دەست بکەوتایە .

١١/لەو ڕۆژەدا خوای گەورە هیچ چاکەیەکی خاوەن باوەڕان ون ناکات و لەسەری پاداشتی گەورەیان دەداتەوە بەجۆرێک هەر کەسێک شەوڕەوییەک بکات لەپێناوی خوای گەورەدا بەئەندازەی ئەو تەپ و تۆزەی کە پێوەی دەنیشێت میسکی دەدرێتێ لە ڕۆژی کۆتاییدا ( نوێژی عیشاو بەیانی بەجەماعەت بکەن لە مزگەوت لەپێناوی خوای گەورەدا تا ئەم ئەجرەتان دەست بکەوێ )

**تێبینی** / لەوانەیە پرسیارێکتان بۆ دروست ببێت کە بڵێن خۆ بێ باوەڕەکانیش چاکە دەکەن ئەی ئەوان حسابیان چۆن دەبێت ؟ ئەوانە هەر لەدنیادا پاداشتیان دەدرێتەوە بەڕزق و ڕۆزی و لەش ساغی و زۆری تر بەڵام لە قیامەتدا هیچ ئەجرێکیان بۆ نیە چونکە ئەمانە خوای گەورەیان نەناسیوەو نوێژو ڕۆژوویان بۆ ئەنجام نەداوەو پێغەمبەرانیان (علیهم سلام) بەحەق نەزانیوەو شوێنیان نەکەوتوون بۆیە ئەمانە هیچ پاداشتێکیان بۆ نیە لە قیامەتدا وە هەموو پاداشتێکیان لە دنیادا دەدرێتەوە بەگوێرەی چاکەکانیان ، بەڵام مسوڵمانی چاکەکار بەتایبەتی باوەڕدارە ڕاستەقینەکان ئەوانە لە دنیاو قیامەتدا پاداشتیان دەدرێتەوە چونکە پەروەردگاریان ناسیوەو پێغەمبەرانیان (علیهم سلام) بەحەق زانیوە تەنها لە پێناوی ڕەزامەندی خوای گەورەدا چاکەیان ئەنجام داوە بۆیە پاداشتی دنیاو قیامەتیان دەدرێتەوە .

## قۆناغی پرسیارە جدییەکان !

ئێستا لە قۆناغی پرسیارکردنداین ، پەروەردگار لەو ڕۆژەدا ڕاستەوخۆ چەند پرسیارێکی گرنگ وپێویست دەکات لە بەندەکان بەبێ بوونی وەرگێڕ هەموو بەزمانی خۆیان پرسیاریان لێ دەکرێت کە ئەمانەن :

١/ ئەو ڕۆژە خەڵکان بانگ دەکرێن و پرسیاریان لێدەکرێت دەربارەی ئەو بت و خواوەندانەی کە بۆ خوایان بڕیاردابوو وە لەبری خوا شوێنیان کەوتبوون و دەیانپەرستن (ئەمە مەبەست لێی موشریک و بێدینەکانە بە ئیسلام)

٢/ لەو ڕۆژەدا خەڵکان بانگ دەکرێن و پرسیاریان لێدەکرێت دەربارەی ئەوەی کە چەنێک وەڵامی بانگەوازی پێغەمبەرانیان داوەتەوە ، خوای گەورە دەفەرمووێت ئایا پێغەمبەرم بۆ ڕەوانە نەکردیت ؟ (ئایا قورئان و سونەتی پێغەمبەرەکەتم پێ نەگەیاندیت ؟) هەروەها خوای گەورە پێیان دەفەرمووێت ئەی ئادەمیزاد چی بوو تۆی فریودا بەرامبەر بەمن ئایا تا چەنێک وەڵامی بانگەوازی پێغەمبەرانت دایەوە؟ وە دەفەرمووێت ئەی ئادەمیزاد چیت ئەنجامدا بەو زانیاریەی کە دەتزانی ؟

٣/ لەو ڕۆژەدا خەڵکان کۆدەکرینەوەو پرسیاریان لێ دەکرێت دەربارەی خۆیان و ئەوانەشی کە پەرستوویانە جگە لە خوا ، خوای گەورە بە پەرستراوەکان دەفەرمووێت : ئایا ئێوە ئەو بەندانەی منتان گومڕاو سەرلێشێواو کرد یان ئەوان خۆیان گومڕاو سەرلێشێواو بوون ؟ پەرستراوەکان لەوەڵامدا دەڵێن : پاکی شایستەی تۆیە ئەی خوای پەروەردگار ئێمە کەی ئەوەبووین کە بکرێینە هاوتاو بپەرسترێین بەڵام ئەوان و باوکانیان ئەوەندە نیعمەتت پێدان تا ئاینەکەی تۆیان لەبیرکرد ، ئەوان خۆیان کەسانێکی لەناوچوو بوون )

**تێبینی** / ئەمە موشریک و بێباوەڕان دەگرێتەوە پێش ئەوەی بکرێنە دۆزەخەوە کە بت و مرۆڤ و خۆرو مانگ و شەیتان و گیانەوەران و داروبەردیان پەرستووە لەبری پەروەردگار ، خوای گەورە پرسیار لەو پەرستراوانە دەکات پێش ئەوەی

بێباوەڕان و موشریک و بێدینەکان بخرێنە دۆزەخەوە ( پێشتر بە وردەکاری باسی حاڵی بێباوەران کرا ) .

٤/ لەو ڕۆژەدا پرسیار لەهەموو خەڵکان دەکرێت سەبارەت بە کردەوەکانیان کە لە دنیادا ئەنجامیان داوە بۆچی ؟ ( چونکە تۆ لێرەیت واتە لەدنیایت خوای گەورە بەبێ هۆ (ژیان و تەمەن و ئەندامەکانی لەشی) پێ نەبەخشیویت ! وە وازی لێ نەهێناویت بەڵکو لەسەر هەموو هەنگاوێکی ژیان و تەمەنت پرسیارت لێ دەکرێت).

٥/ تۆ هەر بەڵێنێکت دابێت بەخوای گەورە لە دنیادا بەدڵنیاییەوە لەو ڕۆژەدا پرسیارو لێپرسینەوەت لێ دەکرێت لەسەری وە پێویستە هەموو بەڵێن و پەیمانەکانتان ببەنە سەر کە بەخواو پێغەمبەرانتان داوە چونکە سبەینێ بەرپرسیار دەبن لێیان .

**تێبینی** / تۆ کە بەڵێنت داوە ببیتە مسوڵمانێکی بۆخوا سوڵحاو ئەوا بەڵێنەکەت ببەرە سەر ، ئەگەر بەڵێنت داوە ببیتە خزمەتکاری بەرنامەو دینەکەی ئەوا ڕاستگۆبەو پەیمانەکەت ببەرە سەرو خزمەت بکە ، ئەگەر بەڵێنت داوە بەخوای گەورە کە تەنها ئەو بپەرستیت و بێدین بیت بەهەموو بەرنامەکان و دینەکان و بت و پەرستراوەکان ئەوا بەڵێنەکەت ببەرە سەرو واز لەهەموو بەرنامەو ڕێچکەکان و فرقەکان بێنە ، تەنها خوا بەتەنها بپەرستە بەو شێوەیەی کە پێغەمبەرەکانی خۆی فێرکردووەو فەرمانی پێکردوون وە خۆتان لامەدەن لە ڕێگە ڕاست و ڕەوانەکەو خۆتان مەدەنە پاڵ هیچ حیزب و گروپ و لایەن و بەرنامەیەک جگەی لە دینی خوای گەورە ، چونکە سوێند بەخوای گەورە ڕادەوەستێنرێن و پرسیارو لێپرسینەوەتان لێ دەکرێت لەسەری .

٦/ لەو ڕۆژەدا پرسیارت لێدەکرێت لەسەر ((چاو و گوێ و دڵت و سەرجەم ئەندام و ئامێرەکانی لەشت)) چونکە وانەزانیت خوای گەورە هەموو ئەم ئامێرە گرانبەهایانەی بەبێ سەبەب و بەبەلاش لێ بەستووبیت ! ،بەڵکو پرسیارو لێپرسینەوەت لەسەر یەک یەکیان لێ دەکرێت ، ئایا دەزانیت خوای گەورە لەهەر ئامێرێکیاندا چەندێ تێچووی تیاکردووەو لەتۆیا دایمەزراندوون ؟! وا نەزانیت هەموو ئەم نیعمەتی بیستن و بینین و بیرکردنەوانە بەبێ هۆکاربن ! بۆیە بزانە چۆن و لەپێناوی چیدا بەکاریان دێنیت و خزمەتی کێ و چ بەرنامەیەکی پێ

دەکەیت ! خوای گەورە چۆن لێت قبوڵ دەکات لەو ڕۆژەدا کە خۆی هەموو ئەم ئامێرانەی پێ بەخشیویت و لێی بەستوویت و تۆش لە پێناوی ڕێگەو ڕێچکەی پڕ لە بێدینی و گومڕایی بیانخەیتە گەڕو بەکاریان بێنیت خەڵکانی پێ بانگ بکەیت بۆ غەیری تەوحید (یەک خوا پەرستی) بەجۆرێک هەموو ئەم ئامێرانە بەکاربێنیت بۆ حەرام و شیرک و بت پەرستی و بەرنامەو ڕێچکە چەپەکان و پڕ لە فەسادییەکان ! یەک یەکی ئەم ئامێرانە بەتایبەتی گوێ و چاو و دڵ لێپرسینەوەت لێ دەکرێ لەسەریان ، ئایا گوێت بۆچی گرت ؟ ئایا بەچاوەکانت تەماشای چیت پێکرد (ئایا هەموو ئەم ئاسمانانەو دروستکراوانەت نەبینی ؟ ئایا ژیریت نەخستە گەڕ کە هەموو ئەمانە دروستکارو بەدیهێنەرێکیان هەیە !!! ئایا لەدڵەوە هەستت نەدەکرد بەوەی کە هەموو ئەمانە لەلایەن خالقێکەوە بەدیهێنراون !؟ ئایا ئەو دوو کامێرایەی (ئەو دوو چاوەی) پێت درابوو بەهۆیەوە ٧٠ساڵ وێنەو ڤیدۆو نوسین پێ تۆمار دەکردن ؟ خزمەتی ڕێگای ناساندنی یەک پەرستی خوای گەورەت پێکرد ؟ کە لەو ڕۆژەدا بەرەو ڕووی دەبیتەوەو خودی خۆی پرسیارت لێ دەکات !؟ ئایا گوێیەکانت تەنها بۆ گۆرانی و مۆسیقاو فلیم و فەلسفەی پڕوپوچ و خوڕافیات بەکارهێنا ؟! یان هەوڵتدا زانستی پێ فێربیت و لەو ڕێگەیەوە بگەیتە پێگەیەکی گەورەو نزیک لەخوای گەورە ئەو پەڕی نزیک بوونەوە لە گەورەیی پەروەرێن لەزانست و وردەکاری دروستکراوەکانیدا ؟

**٧/** لەو ڕۆژەدا خەڵکان پرسیاریان لێ دەکرێت لەهەموو پێویستیەکانی دنیایان کە پێیان درابوو هەر لە تەمەن و ئەندامەکانی لەش و لەشساغی و خۆراک و کشتوکاڵ و ئاوی سارد و میوەکان و گۆشتی ئاژەڵان و دەستەمۆکردنی گیانەوەران بۆیان و زانست و داهێنانەکانیان لەژیانیاندا .

خوای گەورە لە بەندەکەی دەپرسێت ئایا لاشەی ساغم پێ نەبەخشیت و تێر ئاوم نەکردیت لە ئاوی سارد ؟

**تێبینی** / بەنمونە لەو ڕۆژەدا پرسیارت لێدەکرێ من کارم بۆ ئاسان کردیت کە ببیتە خاوەنی پەیجێکی گەورە یان سایتێکی گەورە کە بتوانی پەیامەکەی من بگەیەنیت بەڵام تۆ لە ڕێگەی گومڕایی و فەسادی بەکارت هێنا ، چونکە ئەم سۆشیال میدیایانە ئەمڕۆ نیعمەتێکی زۆر گەورەن ئەگەر بزانین ئەم هەلە بقۆزینەوە بۆ بانگەواز ئەوا

دەتوانین پلەیەکی ئێجگار گەورە بۆخۆمان بەدەست بێنین لەو ڕۆژەدا وەخوای گەورە پرسیاری ئەم نیعمەتی سۆشیال میدیایەمان لێ دەکات لەو ڕۆژەدا .

٨/ لەو ڕۆژەدا پرسیارتان لێ دەکرێت لەسەر هەموو نیعمەت و بەخشراوەکانی کە پێتان درابوو لەژیانی دنیاتاندا هیچ شتێک جێناهێڵدرێت و ون نابێت لای پەروەردگار

٩ / لەو ڕۆژەدا فەرمان دەکرێت کە هەموو سەرۆک و فەرمان ڕەواکان ڕابوەستێنن چونکە ئەمانە بەرپرسیارن لێپێچینەوەیان لەگەڵدا بکەن ئەمانە کاربەدەستانی خەڵکی بوون

لەو ڕۆژەدا نەک تەنها فەرمان ڕەواکان (سەرۆکەکان) بەڵکو هەموو تاکێک ئەگەر بەرپرسیارەتیەکی هەبووبێت ڕادەوەستێنرێت لێپێچینەوەی لەگەڵ دەکرێت تەنانەت لەگەڵ (پیاو کە بەرپرسە لە ژن و مناڵەکانی) لەگەڵ (ژن کە بەرپرسە لە مێردو مناڵەکانی) ، لەگەڵ (بەرێوەبەری دائیرەیەک کە بەرپرسە لە کارمەندەکانی ژێر دەستی ، لەگەڵ مامۆستایەک کە بەرپرسە لە فێرخوازەکانی...هتد) .

١٠/ لەو ڕۆژەدا خوای گەورە دەگات بەبەندەکەی و پێی دەفەرمووێت : ئەی فلان کەس ئایا ڕێزم لێ نەگرتیت ؟ ئایا نەم کردیت بەخاوەنی سەروەری ؟ ئایا نەمکردیت بەخاوەنی ژن ؟ ئایا ئەسپ و وشترم بۆ ژێر دەستە نەکردیت (بەزمانی ئەمڕۆ ئایا ئۆتۆمبێل و هاوبابەتەکانیم پێ نەبەخشیت؟) ؟ ئایا تۆم نەکردە سەرۆک و خاوەن دەسەڵات ؟ ئەویش دەڵێت بەڵێ ئەی پەروەردگار ، خوای گەورە دەفەرمووێت : ئایا گومانت وابوو کە بەمن دەگەیت ؟! دەڵێت نەخێر ئەی پەروەردگار ، دەفەرمووێت : ئەمڕۆ فەرامۆشت دەکەم وەک چۆن تۆ منت فەرامۆش کرد ( واتە وەک چۆن گەیشتنەوەت بەمن بە خوڕافات و درۆ و خەیاڵ دەزانی ) .

١١/ لەو ڕۆژەدا هەردوو قاچی مرۆڤەکان ناتوانرێت جوڵەیان پێ بکرێت (لەئیش دەخرێن لەشوێنی خۆیاندا) هەتا پرسیاری لێ نەکرێت لە پینج شت : تەمەنی لە چیدا بردە سەر ، وە گەنجێتی لە چیدا بەکارهێناوە و پارەکەی لەکوێوە بەدەستی هێناوە و لەچیدا خەرجی کردووە ( واتە سەرفی کردووە ) وە چ کردەوەیەکی کردووە بەو زانستەی کە زانیوەتی (.....و جەستەی و ئەندامەکانی لەچیدا بەکارهێناوە )

هاوەڵی بەڕێز ئەبو دەرداء (خوای گەورە لێی ڕازی بێت) دەڵێت ترسناکترین شت کە لێی دەترسم ئەوەیە کاتێک ڕادەوەستم بۆ لێپێچینەوە پێم بوترێت : تۆ زانیاریت هەبوو چەندە کارت بە زانیاریەکەت کرد ؟ )

١٢ / لەو ڕۆژەدا پرسیارتان لێدەکرێت لەسەر ئەو ژن و سامان و منالانەی کە پێتان بەخشرابوو خوای گەورە دەپرسێت لەبەندەکەی ئایا فلان ئافرەتم نەکرد بەهاوسەرت داواکاران داوایانکرد لەوانم قەدەغەکردو کردمە هاوسەرت ؟ ئایا سامان و منالم پێ نەبەخشیت ؟

١٣/ لەو ڕۆژەدا خوای گەورە هێندە بەڕەحمە موڕاعاتی هەندێک لەو بەندانەی دەکات کە جورئەتی ڕێگریکردنیان لە خراپە نەبووە لە دنیادا ، کاتێک بەچاوی خۆیان خراپەو مونکەریان بینیوە بەڵام لەبەر گەورەیی ستەم و جەوری بێ باوەڕان نەیانتوانیوە ڕێگری لە خراپە بکەن ، خوای گەورە پرسیار لەبەندەکەی دەکات لەو ڕۆژەدا هەتاکو دەفەرموویێت چی ڕێگەی لێگرتیت کە خراپەت بینی ڕێگریت لێ نەکرد ؟ لەوێدا خودا خۆی وەڵام دەخاتە دڵی بەندەکەیەوە و کاتێک خوای گەورە بەڵگەکەی خستە دڵی بەندەکەیەوە لە وەڵامدا دەڵێت : ئەی پەروەردگارم متمانەم (هیوام بەتۆ) بەتۆ هەبوو بەڵام لە خەڵکی دەترسام .

١٤/ لەو ڕۆژەدا خوای گەورە بە هەندێک لە بەندەکانی دەفەرموویێت : ئەی ئادەمیزاد نەخۆش کەوتم سەردانت نەکردم ، ئەویش دەڵێت : ئەی پەروەردگارم چۆن سەردانم بکردیتایە و تۆ پەروەردگاری هەموو جیهانەکانیت ؟ دەفەرموویێت: ئەی نەتزانی کە بەندەکەم فلان کەس نەخۆش کەوت و سەردانت نەکرد ؟ ئەی نەتزانی ئەگەر سەردانت بکردایە منت دەدۆزیەوە لای ئەو .

پەروەردگار دەفەرموویێت: ئەی ئادەمیزاد داوای خواردنم لێکردیت و تۆ خواردنت نەدامێ ؟ دەڵێ : ئەی پەروەردگار چۆن خواردنت بدەمێ کە تۆ پەروەردگاری هەموو جیهانەکانیت ؟ دەفەرموویێت : بەندەکەم ئەی فلان کەس داوای خواردنی لێ نەکردیت و خواردنت پێ نەدا ؟ ئەی نەتزانی ئەگەر خواردنت پێ بدایە منت دەدۆزیەوە لای ئەو .

پەروەردگار دەفەرموویێت : ئەی ئادەمیزاد داوای ئاوی خواردنەوەم لێ کردیت و تۆ پێت نەدام ؟ دەڵێت : ئەی پەروەردگار چۆن ئاوی خواردنەوەت پێ بدەم و تۆ پەروەردگاری هەموو جیهانەکانی ؟ فەرمووی : بەندەکەم فڵانەکەس داوای ئاوی لێکردیت و پێت نەدا ، ئەگەر پێت بدایە منت دەدۆزیەوە لای ئەو ( واتە پاداشتی ئەو کارەت پێ دەبەخشرا لای من ) .

لەسورەتی البقرة ئایەتی ٢٤٥ پەروەردگار دەفەرموویێت : { کێیە ئەو کەسەی قەرز دەدات بەخوای گەورە بەقەرزێکی چاک (قەرزەکە لە سامانێکی حەڵاڵ ) بێت ئەو کەسە خوای گەورە پاداشتی دەداتەوە بەچەندین قات وە زیاتر }

لەو ڕۆژەدا خوای گەورە دەفەرموویێت : داوای قەرزم لەبەندەکەم کرد و ئەو قەرزی پێ نەدام .

**تێبینی** / هاوەڵی بەڕێز ئەبو دەحداح باخێکی گەورەی ٦٠٠ دارخورمایی دا بەقەرز بەخوای گەورە کاتێک ئایەتی ٢٤٥ دابەزی .

**١٥/** لەو ڕۆژەدا تەنانەت پرسیار لەبەندەکان دەکرێت لەسەر سێبەری سارد و خورمای شیرین و ئاوی سارد .

**١٦** / لەو ڕۆژەدا خوای گەورە تەنانەت لێپێچینەوەو لێپرسینەوە دەکات دەربارەی دڵخۆشی و کامەرانی ، چونکە ئادەمیزاد ڕۆچووە لە نیعمەتەکانی خوادا کە لە ژمارە نایەن بەجۆرێک خەڵکان لەهەموو شتێک پرسیاریان لێ دەکریت تەنها سێ شت نەبێ ئەوانیش پارچە پەڕۆیەک کە عەورەتی خۆی پێ داپۆشیبێت و لەتە کولێرەیەک کە برسێتی پێ ڕەواندبێتەوە و لانەو جێگەیەک کە لەتاو گەرماو سەرما چووبێتە ناوییەوە .

## لەو ڕۆژەدا ڕووداوێکی سەیر ڕوودەدات !!!

لەو ڕۆژەدا بێ باوەڕان کە دەبینن و گومانیان نامێنێ تەنها مسوڵمانان لەهەموو ئومەتەکانی پێغەمبەران دەچنە بەهەشتەوە هەروەها کە دەبینن خوای گەورە لە گوناهی دڵسۆزەکان خۆش دەبێت و وە کە دەبینن خوای گەورە هیچ تاوانێکی بەلاوە گەورە نابێت گەر لێی خۆش بێت تەنها تاوانی هاوتادانان واتە شەریکدانان بۆ خوا نەبێت کە هەرگیز لەخاوەنەکەی خۆش نابێت لەوێدا موشریک و بێدین و کافرو هاوتابڕیاردەرەکان دێن دەڵێن وەرن با نکوڵی لە کردەوەکانمان بکەین و بڵێین ئێمە شەریکمان بۆ خوا دانەناوە و تەنها ئێمە لە گوناهباران بووین ، خوای گەورەش دەفەرمووێت : ئەوانە لەبەرئەوەی تاوانی شەریک دانانەکەیان بۆخوا دەشارنەوە مۆر بنێن بەسەر دەمیاندا و پاشان دەستەکان و قاچەکانیان دێنە زمان و شایەتی دەدەن لەسەر کردەوەکانیان

**تێبینی** / شەریک بۆ خوادانان تەنها بریتی نیە لەوەی بتێک دابنێیت و بیپەرستی و سوجدەی بۆ بەریت بەڵکو شەریک بۆ خوادانان بریتیە لە خەڵک کردنە هاوبەشی خوا لە دانانی دەستورو یاسادا ، خەڵک کردنە هاوبەشی خوا لە پەرستن و خۆشەویستندا ، خەڵک کردنە هاوبەشی خوا لە پاڕانەوەو سوجدە بردندا ، خەڵک کردنە هاوبەشی خوا لە قوربانیکردن و قوربانیداندا ...هتد وە شەریک دانان بریتیە لە هەر بەرنامەو پرۆگرام و دینێکی تر لەغەیری ئاینی تەوحید و یەک خوا پەرستی ، لای خوای گەورە لە دنیاو قیامەتدا هیچ دین و بەرنامەیەک قبوڵ نیەو ڕەفزە ئیلا دینی ئیسلام نەبێ وە خوای گەورە تەنها بە دینی ئیسلام ڕازیە

کاتێک پەروەردگار پرسیار لە مرۆڤە بێ باوەڕەکان دەکات ئەوانیش نکوڵی و ئینکاری لە کردەوەکانیان دەکەن و بەهۆی ئەمەشەوە

پەروەردگار مۆر دەنێت بەسەر دەمیانەوە ( لە قسەکردنیان دەخات ) پاشان ئەندامەکانی لاشەیان دەهێنێتە زمان و قسەکردن (کە ئەم مۆرە تایبەتە بە بێباوەڕان) هۆکاری ئینکاری کردنیشیان لەبەرئەوەیە کە بێ گومان دەبن و ئیتر

بۆیان دەرەکەوێ کە لەو ڕۆژەدا تەنها مسولْمانان و باوەڕداران دەچنە بەهەشتەوە بۆیە ئینکاری و نکۆڵی دەکەن بۆئەوەی بچنە ڕیزی مسولْمانانەوە

ئینجا خوای گەورە مۆری نا بەسەر دەمیانەوە و دەست و قاچی هێنانە زمان و هیچ شتێک ناشارنەوە لە خوای گەورە ، وە ئەم ئەندامانە کە دێنە قسە بریتین لە ( دەم و زمان و قاچ و گوێ و چاو و پێست )

لەو ڕۆژەدا خوای گەورە بە بەندەکەی (دوو ڕووەکان ) دەگات دەفەرمووێت : ئەی فلان کەس ئایا ڕێزم لێ نەگرتیت ؟ ئایا تۆم نەکردە خاوەن دەسەڵات ؟ ئایا نەمکردیت بەخاوەن ژن ؟ ئەویش دەڵێت : بەڵێ ئەی پەروەردگار ، خوای گەورە دەفەرمووێت : گومانت وابوو کە بە من دەگەیت ؟ دەڵێت : من بەندەی تۆم باوەڕم بەتۆو بەپێغەمبەرەکەت و کتێبەکەت هێنا و بەڕۆژوو بووم و نوێژم کرد و چاکەم کرد و هەتا دەتوانێت باسی خۆی بەچاکە دەکات

**تێبینی** / لێرەدا ئەم بێ باوەڕە درۆ دەکات وەک چۆن لەسەرەتاوە وتیان با نکۆڵی لە کردەوەکانمان بکەین، یاخود ڕاستەکات نوێژو ڕۆژووی گرتووە بەڵام مونافیق و دوو ڕوو بووە تەنها لەبەرئەوە نوێژو ڕۆژووی ئەنجام داوە کە مسولْمانانی پێ فریو بدات وە لە دڵەوە بێ باوەڕبووە و خیانەتیان لە مسولْمانان کردووەو خەنجەری غەدرو خیانەتیان لێ داون لەدنیادا

پاشان خوای گەورە پێی دەفەرمووێت : ئایا شاهیدەکانمان بهێنینە قسە لەسەرت؟ ئەویش بیردەکاتەوە کە کێ شاهید بێت بەسەریەوە .. دەڵێت ئەی پەروەردگار ئایا منت ڕزگار نەکردووە لە ستەم ؟ دەفەرمووێت : بەڵێ ، دەڵێت : من ڕێگە نادەم کە کەس شاهید بێت بەسەرمەوە تەنها شاهیدێک نەبێت لە خۆم ، خوای گەورە پێی دەفەرمووێت : ئەمرۆ بەسە کە خۆت شاهید بیت بەسەر خۆتەوە و بەسە کە نوسەرە بەڕێزەکان ( واتە مەلائیکە بەڕێزەکان) .شاهید بن بەسەرتەوە ئینجا مۆر دەنرێت بەسەر دەمیەوە ( ئەم مۆرە پارچە قوماشێکە کە دەمی پێ دەبەسترێت ) ، وە بەڕانی دەوترێت بێتە قسە ( ڕان یەکەم بەشی لاشەیە کە پرسیاری لێ دەکرێت پاشان ناو لەپی دەستی دەهێنرێتە قسەکردن و دێتە زمان و پاشان شاهیدی لەسەر دەدات )

ئینجا ڕانی و گۆشتی و ئێسکەکانی دێنە زمان و باس لەو کردارانە دەکەن کە ئەنجامیان داوە پاشان دواتر ئەو کەسە بواری قسەکردنی پێدەدرێت )

**تێبینی** / لە بواری پزیشکیدا لەڕووی تیۆری زانستیەوە ئەمە شتێکی ئاساییەو لەڕووی بیردۆزەوە هاتووە ، پزیشک و زانا پزیشکیەکان زۆر بەباشی دەزانن چۆن ؟

بەنمونە / کۆدی جینێکی تایبەت لەناو (DNA) بۆ نمونە جینی ناو ترشە ناوکی DNA قژ کە بەرپرسە لە چالاکی قژ هەمان کۆدی قژ لە جینی ترشە ناوکی پەنکریاسدا هەیە و نا ئەکتیڤە ئەگەر ئەو کۆدە ئەکتیڤ بێت لە جینی پەنکریاسدا ئەوا لەناو پەنکریاسدا قژ دروست دەبێت و ئەکتیڤ دەبێت ) وە زۆر نەخۆشیش هەیە کە تیایدا مو بەڕێژەیەکی زۆر لە شوێنێکی نا پێویستدا دروست دەبێت ئەمە وەک نمونەیەک بوو ) بۆیە زۆر ئاسایە خوای گەورە ئەو (دی ئێن ئەیەی DNA) کە لە ناو جینی ترشە ناوکی زماندایە هەمان کۆد ئەکتیڤ بکات لەو DNA یەی کە لەناو ڕان و لەپی دەستدا هەیە )

**ڕوونکردنەوە** / هەموو بەشەکانی لەشی مرۆڤ بەهۆی جیناتەکانی DNA یەوە ئەکتیڤ دەبن و بەڕێوە دەبرێن ، ئەکتیڤبوونی جینێکی DNAی لە قژدا هۆکارە بۆ گەشەو خۆراک و فرمانی قژ ، ئەکتیڤبوونی جینێکی تری تایبەت لە DNA ی پەنکریاسدا تایبەتە بە دەردانی هۆرمۆنی ئەنسۆلین و چالاکی و فرمانی پەنکریاس وە هەمان ئەو جینانە لە هەموو بەشە جیاوازەکانی لەشدا هەیە بەڵام بەپێی پێویستی ئەندامەکە هەریەکەو جینی تایبەت بەخۆی ئەکتیڤەو کاری ئەندامەکە جێ بەجێ دەکات لەناو DNAیەکاندا

بۆیە لەو ڕۆژەدا لەڕووی لۆژیکی و پزیشکیەوە زۆر ئاساییە خوای گەورە جینی تایبەت بەزمان و قسەکردن لەناو DNAی ناو ئێسک و ماسولکەی ڕان و لەپی دەستەکان و ئەندامەکانی تردا ئەکتیڤ بکات و بەهۆیە ڕان و لەپی دەست و پێست و گوێ و چاو و قاچ بێنە زمان و بکەونە قسەکردن

دوای ئەوەی کە هەموو ئەم ئەندامانە هاتنە قسەکردن و شاهیدیان دا لەسەر کردەوە خراپەکانی بەندە بێ باوەڕەکە ، ئەوانیش دەڵێن ( واتە بێ باوەڕەکان

بە ئەندامەکانی لەشی خۆیان دەڵێن ) بۆچی شاهیدیتان دا بەسەرمانەوە ؟ ئەندامەکانیش دەڵێن خوا هێنایینیە زمان کە هەموو شتێکی هێناوەتە زمان ، وە ئەویش بوو یەکەمجار دروستی کردن و (ئەندامەکانی دروستکردن) هەر بۆلای ئەویش دەگەڕێنەوە ، (پاشان پەروەردگار دەفەرموویێت) : ئێوە خۆتان واتان دەزانی کە دوورن لە شایەتی دانی گوێ وچاو و پێستی لەشتان دژتان بەڵکو وا گومانتان دەبرد کە خوا نازانێت بەزۆرێک لەو کارانەی دەیکەن ، ئایا ئەوە گومانتان بوو کە دەتان برد بە پەروەردگارتان (گومان و کردەوەکانتان) ئێوەی لەناوبرد و چوونە ڕیزی زیان لێ کەوتووانەوە ) .

ئینجا ئەو کەسە دەڵێت (بەئەندامەکانی لەشی خۆی دەڵێت) : دووربکەونەوەو بهاڕدرێن خۆ من هەوڵ و کۆششم لەبەر ئێوە دەکرد ، ئینجا ئەو کەسە مونافیقە!! وا دەکات کە خۆی ڕزگار بکات ((بەڵام رزگاری نابێت)) و هەر ئەویشە کە خوا زۆر ڕقی لێیەتی)

هەر لەو ڕۆژەدا کافر (مونافیق و دووڕووەکان) بە کردەوەکانی خۆی ئاشنا دەکرێت ئەو ئینکاری دەکات . دەوترێت: ئا ئەوانە دراوسێکانتن شاهیدی دەدەن بەسەرتەوە ؟ ئەویش دەڵێت: درۆیان کرد ( واتە کاتێک دراوسێکانی شاهیدی دەدەن لەسەریان ئەوان نکۆڵی دەکەن و دەڵێن درۆیان کرد ) ، ئینجا پێیان دەوترێت سوێند بخۆن، ئەوانیش سوێند دەخۆن ( واتە کافرو دووڕووەکان سوێند بەدرۆ دەخۆن ) پاشان خوای گەورە بێ دەنگیان دەکات و زمان و دەستەکانیان شاهیدی دەدەن بەسەریانەوە ئینجا خوای گەورە دەیانخاتە ئاگرەوە .

**تێبینی** / بێ باوەڕو مونافیقەکان نکۆڵی و ئینکاری لەکوفرو دووڕوویيەکانیان دەکەن پاشان یەکەمجار دراوسێکانیان کە لە دنیا دراوسێیان بوون شاهیدیان لەسەر دەدەن کە ئەمانە کافرو دووڕوو بوون بەڵام بەدرۆیان دەخەنەوە دواتر خوای گەورە ئەندامەکانی لاشەیان دەهێنێتە زمان و شاهیدیان لەسەر دەدەن لەسەر شرک و کوفرو کارە قێزەونەکانیان

ئیتر لە کاتی ئەم پرسیارو وەڵامانەشدا کە بێ باوەڕەکان و دووڕووەکان ئینکاری و نکۆڵی دەکەن بەوشێوەیە ئەندامەکانی لاشەی خۆیان دێنە زمان و شایەتیان لەسەر دەدەن و پاشان هەموویان فڕێ دەدرێنە ئاگری دۆزەخەوە

## لەو رۆژەدا سێ جۆر زوڵم و تاوان و ستەم هەن !

لەو ڕۆژەدا سێ جۆر زوڵم و تاوان و ستەم هەن کە یەکەمیان پەروەردگار وازی لێ ناهێنێت دووەمیان لێی خۆش دەبێت سێیەمیان هەرگیز لێی خۆش نابێت

واتە سێ جۆر ستەم هەیە کە مرۆڤەکان کردوویانە بەم شێوەیەن

١/ ئەو ستەم و زوڵم و تاوانانەی کە وازی لێ ناهێرنرێت بریتیە لە زوڵمی نێوان مرۆڤەکان خۆیان کە ئەمە وازی لێ ناهێنرێت و ئیلا حەق بۆ خاوەن حەق دەگێڕدرێتەوە وەک لەبەشەکانی پێشوو ڕوون کرایەوە کە چۆن تۆڵە لە هەندێکیان وەردەگرێت بۆ هەندێکیان ... هتد

٢/ ئەو ستەم و زوڵم و تاوانانەی کە پەروەردگار هەرگیز لێی خۆش نابێت بریتیە لە هاوبەش دانان بۆ خوای گەورە بەهەموو جۆرەکانیەوە هەر لە خەڵک کردنە شەریکی خوا لە حوکم و دەستورو پەرستن و عیبادەتکردندا وە بتپەرستی و ئاژەڵ و ئاگرو خۆر پەرستی و مرۆڤ پەرستی و تاغوت پەرستی و شەیتان و دەجال پەرستی ...هتد کە پێشتر باسی لێوەکرا

هەروەها خوای گەورە هەرگیز لەکەسێک خۆش نابێت کە باوەڕدارێکی بەناحەق کوشتبێ

بۆیە هەر کەسێک بەکافری و موشریکی مردبێت و تەوبەی نەکردبێ و وازی لەو کوفرو شیرکە نەهێنابێ پێشتر ئەوا هەرگیز خوای گەورە لێی خۆش نابێت وە کەسێکیش تەوبەی نەسوحی نەکردبێ لە کوشتنی باوەڕدارێکدا ئەوا خوای گەورە هەرگیز لێی خۆش نابێت ئەگەر بەو تاوانەوە گەڕابێتەوە غەیری ئەوانە خوای گەورە لەهەموو تاوانێک خۆش دەبێت لەو ڕۆژەدا

٣/ ئەو ستەم و تاوان و زوڵمانەی کە مرۆڤ لەنێوان خۆی و پەروەردگاردا ئەنجامی داوە خوای گەورە لێی خۆش دەبێت ئەگەر بەردەوام تەوبەو پەشیمانی دەربڕی بێت بۆ پەروەردگار

خوای گەورە فەرموویەتی ئەی ئادەمیزاد ئەگەر بەئەندازەی سەر ڕووی زەوی تاوانت هەبێت و بگەیت بەمن هاوتات (شەریکت) بۆ بڕیار نەدابم ئەو کات پێت دەگەم و بەئەندازەی سەر ڕووی زەوی لێخۆشبوونم بۆت هەیە

لێرەوە تەماشای باوەڕدارانێک و مسوڵمانانێک بکەن کە دەگەنە بەردەم خوای گەورە چۆن خوای گەورە لە تاوانەکانیان خۆش دەبێت بەهۆی هەنێ کارو حاڵەتی تایبەتەوە کە کردوویانە :-

لەو ڕۆژەدا باوەڕدارانێک و خەڵکانێک دەگەن بەخوای گەورە و خوای گەورە بەڕەحمەتی خۆی دەیان بەخشێ ، چۆن ؟ خوێنەربن

لەو ڕۆژەدا کەسانێک دەگەنە بەردەم پەروەردگار کە سیفەتیان ئەوە بووە بەردەوام لەهەڵە و پەشیمانبوونەوەی مسوڵمانانیان بوریوە لەمامەڵەو شتی تردا بەوهۆیەوە خوای گەورە لەو ڕۆژەدا لەهەڵەکانیان دەبورێت

لەو ڕۆژەدا جۆرە کەسانێکی تر دەگەنە لای خوای گەورە کە کارەکانیان لەسەر ئاسان دەکرێت و ڕزگار دەکرێن چونکە ئەمانە قەرزیان سوک کردووە لەسەر کەسانی دەست کورت و دەست تەنگ

لەو ڕۆژەدا کەسانێک کە قەرزیان کردووە بەئیخلاسی و ڕاستگۆیی وە نیەتی دانەوەی قەرزەکانیان هەبووە بەڵام مردن ڕێگەی پێ نەداون و وەفاتیان کردووە ئەوانە لەو ڕۆژەدا پەروەردگار خۆی قەرزەکانیان بۆ دەداتەوە

لەو ڕۆژەدا پیاوێک دێتە بەردەم پەروەردگارو لێپێچینەوەی لەگەڵ دەکرێت کە ئەم پیاوە هیچ چاکەیەکی نەبووە تەنها ئەوە نەبێت کە تێکەڵ بەخەڵکان دەبوو وە دەوڵەمەند بوو لە ژیانی دنیایدا ، ئەم پیاوە هەمیشە بەمنداڵەکانی دەوت کە لە خەڵکانی دەست تەنگ و کورت ببورن ، خوای گەورەش لەو ڕۆژەدا پێی فەرموو: ئێمە شیاوترین بەو لێبوردنە لەو ، ئینجا خوای گەورە لێی بوراو لە تاوانەکانی خۆش بوو

لەو ڕۆژەدا کەسانێک دەگەن بە پەروەردگار بۆ لێپێچینەوە بەڵام خوای گەورە ترس لەدڵیان دەردەکات و بێ باکیان دەکات لە ناڕەحەتی ئەو ڕۆژە ، بۆچی ؟

چونکە ئەم باوەڕدارانە لە دنیادا باکیان بە ترسان لەخوای گەورە هەبووە خۆیان دەپاراست لە زۆرینەی ئەو کارو کردەوانەی کە حەرام و قەدەغە کرابوون لەلایەن پەروەردگارەوە بۆیە پەروەردگار سوێند دەخوات بەشکۆمەندی و گەورەیی خۆی دەربارەی ئەم بەندانە کە دەفەرمووێت سوێند بەشکۆمەندی خۆم کۆی ناکەمەوە لەسەر بەندەکەم دوو ترس و دوو بێ باکی ئەگەر بەندەکەم بترسێ لێم لە دنیادا بێ باکی دەکەم (لەترسی) ڕۆژی کۆتاییدا ، ئەگەر بەندەکەم لەدنیادا بێ باک بێت لەمن ئەوا دەیترسێنم لەڕۆژی کۆتاییدا

لەو ڕۆژەدا پیاوێک دێتە بەردەم پەروەردگار بۆ لێپێچینەوە کە ئەم پیاوە لە ئومەتەکانی پێش ئیسلامدا بووە هیچ کارێکی چاکەی نەبوو تەنها یەک خوا پەرست بوو ، کاتێک ئەم پیاوە سەرەمەرگی هاتە پێش بەخزمەکانی وت : گەر مردم لاشەکەم بسوتێنن تا دەبێتە خەڵوز ، پاشان بیهاڕن پاشان لەڕۆژێکی با و زریاندا نیوەی بپرژێنن بەسەر وشکانیدا و نیوەکەی تری بپرژێنن بەسەر دەریادا وتی: سوێند بەخوا گەر خوای گەورە کۆی بکاتەوە سزایەکم دەدات کە هیچ کەسێکی وا سزا نەدابێت لەجیهاندا ، کاتێک ئەو پیاوە مرد بەو جۆرەیان لێ کرد کە خۆی داوای کردبوو ، خوای گەورەش فەرمانی بە وشکانی کرد ئەوەی تیایدا بڵاوبۆتەوە کۆی بکاتەوەو بیهێنێت ، وە فەرمانی بەدەریاش کرد ئەوەی تیایدا بڵاوبۆتەوە کۆی بکاتەوەو بیهێنێت ، تا بەپێوە وەستا لە مشتی خوادا ، خوای گەورە فەرمووی: ئەی ئادەمیزاد چی وایلێکردیت ئەو کارە ئەنجام بدەیت ؟ ئەویش وتی : خوای گەورە ئەم کارەم لەترسی تۆ ئەنجام داوە تۆش باشتر دەزانیت ، خوای گەورە لەبەر ئەو کارەی لێی خۆش بوو وە ئەو کەسە هیچ چاکەیەکی تری نەبوو تەنها یەک خوا پەرست بوو ).

**تێبینی** / ئەم کارەی ئەم پیاوە لە ئومەتەکانی پێش ئیسلامدا بووە و ئەنجامدانی ئەم جۆرە کارە لە ئیسلامدا جائیز نیە خوای گەورە بەگەورەیی و ڕەحمی خۆی لەسەر ترسەکەی و تەوحیدەکەی لەم پیاوە خۆش بووە

لەو ڕۆژەدا کەسانێک دێنە بەردەم پەروەردگار بۆ لێپێچینەوە بەڵام پەروەرێن سزای خۆی لێیان دەگرێتەوە چونکە ئەمانە تورەیی خۆیان گرتۆتەوە لە خەڵکان و تورە نەبوون و نەرم و نیان بوون بۆیە لەو ڕۆژەدا ڕزگاریان دەبێت لە تورەبوونی خوای گەورە

لەو ڕۆژەدا ئەو کەسانەی کە پێنج نوێژە فەرزەکانیان بەجوانی بەجدی ئەنجام دابێت وە پارێزگاریان لێکردبێت ئەو کارەیان بۆ دەبێتە ڕووناکی و بەڵگەو ڕزگاربوون .

لەو ڕۆژەدا کەسانێک دێن کە دەپۆشرێن و تاوانەکانیان دادەپۆشرێت و دەسڕدرێتەوە لەسەریان وە نارەحەتی لەسەریان لادەبرێت چونکە ئەمانە لە دنیادا تاوان و هەڵەو کەم و کوڕی برایانیان لە مسوڵمانانیان پۆشیوەو سەتریان کردووە وە نارەحەتیان لەسەریان لابردووە

لەو ڕۆژەدا کەسانێک یان کۆمەڵێک خۆزگە دەخوازن کە خراپەیان زۆر بکردایە چونکە خوای گەورە خراپەکانی بۆ گۆڕیون بەچاکە ، چۆن ؟ چونکە ئەمانە لە دنیادا زۆر تاوانبار بوون بەڵام تەوبەی (ڕاستەقینەیان) نەسوحیان کردووە و گۆڕاون و بوون بە کەسانی چاکەکارو خواپەرستی چاک وە بەیەکجاری وازیان لەهەموو ئەو تاوانە گەورانە هێناوە کە ئەنجامیان داوە ، ئەمانە لەو ڕۆژەدا کە دەبینن خوای گەورە بەهۆی تەوبە ڕاستەقینەکەیانەوە خراپەکانی بۆ گۆڕیون بەچاکە خۆزگە دەخوازن کە پێش تەوبەکەیان تاوانەکانیان زۆرترو گەورەتربووایە

لەو ڕۆژەدا خوای گەورە بڕوادار لەخۆی نزیک دەخاتەوە تا دەیخاتە ژێر سایەی خۆی و ونی دەکات لەپێش چاوی خەڵکی پاشان وای لێدەکات تا دان بەتاوانەکانی خۆیدا دەنێت و خوای پەروەردگار پێی دەفەرمووێت : ئایا ئەو گوناهو ئەو گوناهەت دەناسیتەوە هەتا وایلێدەکات کە دان بەهەموو تاوانەکانیدا دەنێت و بەندەکەش ئیتر وا گومان دەبات کە دۆزەخی بۆ مسۆگەر بووە ، هەتا دەیگەیەنێتە ئەو شتانەی کە خوا دەیەوێت پێی بگەیەنێت ، ئینجا خوای گەورە دەفەرمووێت : من ئەوانەم بۆ داپۆشیت لەدونیادا ئەمرۆ من لەوانەت دەبوورم ، ئینجا نامەی چاکەکانی پێ دەبەخشرێت ....)

لەو ڕۆژەدا کەسانێک دێن کە هەندێ ویردی تایبەتی لەپێش و دواوە دەبنە پارێزگاری و ڕزگاربوونیان ، (وە هەر ئەوانەش کردەوە چاکەکانن) کە دەمێننەوە ئەویش ویردەکانی ( سبحان الله والحمدلله ولا اله الا الله و الله اکبر )

مرۆڤ هیچ کردەوەیەکی نەکردووە کە ڕزگارتر بێت بۆی لەسزای خوای گەورە لەو ڕۆژەدا وەک زیکرو یادکردنی خوا

لەو ڕۆژەدا ئەوانەی بەڕۆژوو بوون خوای گەورە دەفەرموویت ڕۆژوو بۆ منەو منیش پاداشتیان دەدەمەوە

**تێبینی/** تەماشای ئەم ڕووداوە بکەن: ( پێغەمبەری خوا (ﷺ) لەگەڵ چەند کەسێک لەهاوەڵانی تێپەڕین و منداڵێک لەڕێگەکەدا بوو ، کاتێک دایکەکەی ئەو کۆمەڵە کەسەی بینی ترسا لەوەی کە منداڵەکەی بکرێت بەژێر پێوە ئینجا بەڕاکردن هاتوو وتی: کوڕەکەم کوڕەکەم و بەخێرایی هات تا هەڵی گرت ، هاوەڵان فەرموویان: ئەی پێغەمبەری خوا ئەو ئافرەتە هەرگیز منداڵەکەی فڕێ ناداتە ئاگرەوە ، پاشان پێغەمبەری خوا (ﷺ) بێ دەنگی کردن و فەرمووی : ( نەخێر خوای پەروەردگاریش خۆشەویستی خۆی فڕێ ناداتە ناو ئاگرەوە ) .

لەو ڕۆژەدا کەسانێک دوور دەبن لە سزای خوای گەورە کاتێک دێنە بەردەم پەروەردگار بۆ لێپێچینەوە چونکە ئەمانە بەردەوام داوای لێخۆش بوونیان لە خوا کردووە

کۆمەڵێک هۆکاری تر هەن بۆ بەدەستهێنانی لێخۆش بوونی خوای گەورە :

لەوانە ( دوعاو نزا ، تەوبەکردن ، چوون بۆ نوێژی جەماعەت ، چاوەڕوانیکردنی نوێژ لەدوای نوێژ ، جوان دەست نوێژ شۆردن ، ئەنجامدانی نوێژە فەرزەکان لەگەڵ نوێژی هەینی ، نوێژە سوننەتەکان و شەونوێژ و نوێژی ( التسبیح و تەوبە) و تەڕاویح ، بەڕۆژووبوونی مانگی ڕەمەزان و ڕۆژانی عەرەفەو عاشورا، ئەنجامدانی حەج و عەمرە ، ئامادەبوونی کۆڕو زیکری یادی خواو فێربوونی زانستە شەرعیەکان و بوون بەزانا ، بەرپاکردنی سڵاو و سلام ، بەکارهێنانی وتەی جوان و شیاو لەگەڵ خەڵکیدا ، بانگدان و خوێندنی دوعای دوای بانگ ، وتنی ئامین لەدوای ئیمام ، خوێندنی زیکری دوای نوێژ ، توشبوون بەنەخۆشیی، خۆ دوورگرتن لەتاوانە گەورەکان ، بەخشینی یارمەتی بەهەژاران ، شوێن کەوتنی سونەت و نەریتی پێغەمبەری خوا (ﷺ) ، تەوقەکردن لەگەڵ مسوڵمانانندا، سڵاوات دان لەپێغەمبەری خوا(ﷺ) ، شۆردنی مردوو ، شەهید بوون لە ڕێی خوادا ، سوپاسکردنی خوا لەدوای نان و سوپاکردنی خوا لەکاتی لەبەرکردنی جل و بەرگ ، کۆچکردن لەپێناوی خوادا ، نوێژکردن لە مزگەوتی ( قدس) دا ، لێخۆش بوون لەتاوان و هەڵەکانی خەڵکی ، خەفەت و ماندووبوون و گرفتاری و

توشی بوون بەئێش و ئازار ، پێدانی قەرز بە مسوڵمانان ، لابردنی نارەحەتی لە ڕێگاوبان، خوێندنی قورئان بەتایبەتی سورەتی ( الملک و الاخلاص) ، چاکەکردن لەگەڵ سەرجەم گیانلەبەراندا .... ئەمانە هەمووی بەڵگەی ئایەت و فەرموودەی سەحیحیان لەسەرە .

## تەماشای ڕەحم و بەزەیی پەروەردگار بکەن لەو ڕۆژەدا چەند گەورەو بێ ئەندازەیە !!!

لەو ڕۆژەدا لەکاتی لێپێچینەوەدا پەروەردگار بەجۆرێک ڕەحمەتی خۆی ئەڕژێنێ بەسەر باوەڕداراندا کە بێ ئەندازەیە بەجۆرێک لێیان خۆش دەبێت و کردەوەکانیان بۆ گەورە دەکات کە لە ١٠٠ ڕەحم ٩٩ ڕەحمی خۆی دەبەخشێ پێیان

تەماشای ڕەحمی پەروەردگار بکەن چەند گەورەو بێ ئەندازەیە !!!

خوای گەورە لە ١٠٠ ڕەحم تەنها یەک ڕەحمی لەسەر زەوییە بەهۆی ئەو ڕەحمەتەوە گیانەوەران خۆیان بەکوشت دەدەن لەپێناوی بێچووەکانیان ، دایک و باوک خۆیان دەکەنە قوربانی لەپێناوی منالەکانیان، بەهۆی ئەو تاکە ڕەحمەی پەروەردگارەوەیە کە دایبەزاندووەتە سەر زەوی بەهۆیەوە هەموو ئەو خێرو چاکەو چاکەکاریە دەگوزەرێ لەسەر زەویدا ، بەهۆی ئەو تاکە ڕەحمەوەیە کە دایک و باوک ئامادەن خۆیان برسی و تینوو بکەن و سەبر بگرن بەڵام منال و بێچووەکانیان برسی و تینوو نەبن بەڵکو تێربن و دڵخۆش بن ...هتد

ئینجا بیهێننە پێش چاوی خۆتان لەو ڕۆژەدا کە نەک یەک ڕەحم بەڵکو پەروەردگار ٩٩ ڕەحم بڕژێنێ بەسەر باوەڕداراندا و لێیان خۆش بێت و ئەو هەموو کۆشک و قەسرو ڤێلاو وڵات و مەملەکەتانەی ناو بەهەشتیان پێ ببەخشێت

خوای گەورە هێندە بەڕەحمە کاتێک کە دروستکراوەکانی دروستکرد لە کتێبێکیدا کە لای خۆیەتی لەسەر عەرش تیایدا نوسیویەتی : بەزەییم زاڵ بووە (پێشکەوتووە) بەسەر توڕەبوونمدا.

ڕەحمەتی خوای گەورە هێندە فراوان و گەورەیە بەجۆرێک کاتێک فیرعەونی تاغوت لەناوچوو جوبرەئیل (عليه السلام) لەکاتی سەرەمەرگی فیرعەوندا ئاو و قوڕی دەکرد بەدەمی فیرعەوندا بۆئەوەی نەوەکو خوای گەورە بەزەیی پێدابێتەوەو ڕەحمی پەروەردگاری پێ بگات، یان نەوەکو بڵێت لا اله الا الله بەر بەزەیی پەروەردگار بکەوێت

**تێبینی** / فیرعەونی تاغوت هێندە لوت بەرز بوو دەیووت بە گەلەکەی من پەروەردگاری بەرزی ئێوەم دەبێ بمپەرستن وە هیچ خوایەک نیە لەغەیری من ، بەرنامەو دەستوری خۆی زاڵکردبوو بەسەر وڵاتەکەیدا ، خوای گەورە خۆی و سەرخەرانی (جوندیەکانی) هەمووی بەیەکەوە لەناوبرد ، فیرعەون لە لوتبەرزی خۆی نەکەوت کاتێک گەیشتە ئەوپەڕی زەلیلی و لەناوچوون تەنانەت لەسەرە مەرگیدا نەهات بەدەمیا بلێت باوەڕم بەخوای گەورە هێناوە بەڵکو دەیووت (امنت برب موسى) ، واتە باوەڕم بە خوای موسا هێنا ، بۆیە جبرەئیل (عليه السلام) لەناو بەحرەکەدا قوڕاوی کرد بەدەمی فیرعەوندا نەوەکو بەر ڕەحمەتی الله تعالى بکەوێت

خوای گەورە هێندە بەبەزەییە تەنانەت لە دایکێک بەڕەحمترە کە بەزەیی بە منداڵەکەیدا دێتەوەو توند بەخۆیەوە دەیگوشێت و شیری پێدەدات ، ئایا بەڕای تۆ ئەم دایکە منداڵەکەی فڕێ دەداتە ئاگرەوە ؟ هەرگیز فڕێی نادات بەڵکو خوای گەورە زۆر لەو دایکە بەبەزەیی ترە بۆ بەندەکانی لەو ڕۆژەدا و فڕێیان ناداتە ناو ئاگرەوە

خوای گەورە لەو ڕۆژەدا هێندە بەبەزەیی و بەڕەحمە لەکاتی لێپێچینەوەدا بۆ بڕواداران و مسوڵمانان بەجۆرێک تەنها بەهۆی یەک ڕەحم کە داییەزاندۆتە سەر زەوی مرۆڤ و جنۆکەو ئاژەڵەکان سۆزو بەزەییان هەیە بۆ یەکتر تەنانەت دڕەندەکانیش بەوە سۆزیان هەیە بۆ بێچووەکانیان ، پەروەردگار ٩٩ بەزەییەکەی تری هەڵگرتووە بۆ ئەو ڕۆژە و دەیبەخشێ بە مسوڵمانان و باوەڕداران و کەسانێک و خەڵکانێکی تر کە خۆی بیەوێ پێیان ببەخشێ

خوای گەورە هێندە بەڕەحمە تەنانەت ڕەخنەی لە پێغەمبەری خوا گرت علیە صلاة والسلام ، چۆن ؟ کاتێک پێغەمبەری خوا (ﷺ) کە باسی حاڵی خەڵکانی دەکرد لە ڕۆژی قیامەتدا کە لە ١٠٠٠ کەس ٩٩٩ ی دەکرێنە دۆزەخەوە

(لەبەشەکانی پێشودا باسکراوە کە ٩٩٩ی یەئجوج و مەئجوج و غەیرە مسوڵمانەکانن لەبەرامبەردا یەکێک لە مسوڵمانانە)

پاشان پێغەمبەری خوا (ﷺ) ڕۆیشت و هەموو هاوەڵان دەستیان کرد بەگریان ، پاشان خوای پەروەردگار جبرەئیلی نارد بۆلای پێغەمبەری خوا (ﷺ) پێی ڕاگەیاند

که خوای گەورە دەفەرموویت : بۆچی بەندەکانی منت بێ ئومێد کرد ، پاشان پێغەمبەری خوا (ﷺ) گەڕایەوە بۆلای هاوەڵان و پێی فەرموون ( کارەکانتان با بەو جۆرە بێت که لێتان داواکراوە و مژدە بێت لێتان و دڵخۆش بن ...هتد)

بۆیە تۆی مسوڵمان و باوەڕدار هەرگیز پێویست ناکات بێ ئومێد بیت له ڕەحمی پەروەردگارێک که له ڕەحمی دایکێک بۆ جگەر گۆشەگەی بەڕەحمترە بۆ بەندەکانی بەڵکو ئەوەی پێویستە لەسەرت تا بتوانی خۆت بپارێزی له کوفرو شرک و تاوانە گەورەکان ، وە خۆت بێ باک نەکەیت له سنورەکانی خوای گەورە بەجۆرێک هەرچی تاوانێک هاتە پێشەوە ئەنجامی بدەیت بەڵکو تەنها بەخۆت بڵێ لەپێناوی پەروەردگاردا و لەترسی خوای گەورە و له خۆشەویستیم بۆ ئەمری خوای گەورە ئەو کارە حەرامە ئەنجام نادەم ، ئەگەر زۆر زۆر خۆت نەگرت و شەیتان و نەفس زاڵ بوو بەسەرتدا و تاوانەکەت ئەنجامدا دەستبەجێ تەوبە بکەو خێرو چاکەیەک ئەنجام بدە چونکە پەروەردگار دەفەرمووێ ئەی عەبدەکەم ئەگەر ١٠٠ جار تاوان بکەیت بەڵام بگەڕێیتەوە بۆلای من و داوای لێخۆش بوونم لێ بکەیت ئەوا من هەر لێت خۆش دەبم

تکایە خەڵکان بێ ئومێد مەکەن لەو ڕەحمەتە فراوانەی پەروەردگار که ٩٩ یانی داناوە بۆ ئەو ڕۆژە چونکە ئەوەی خەڵکی بێ ئومێد بکات له سۆزو ڕەحمی پەروەردگار بەجۆرێک وایان لێبکات که خوا لێیان خۆش نابێت و تیادەچن ئەوا خوای گەورە لەو ڕۆژەدا ئەو کەسانە بێ ئومێد دەکات له ڕەحمی خۆی ، بۆچی ؟

چونکە پیاوێک هەبوو لەگەلانی پێشودا که زۆر کارابوو له عیبادەتدا زیاد له پێویست ئاینی لەسەر خۆی گران کردبوو ، خەڵکانی تەواو بێ ئومێد کردبوو له بەزەیی خوا ، پاشان مردو گەیشت بەخوای گەورە و وتی : خوای گەورە پاداشتم دەبێت چی بێت لای تۆ . فەرمووی : ئاگر ، پیاوەکە وتی : ئەی کوا پاداشتی ئەو هەموو کۆشش و عیبادەتەکانم ؟ خوای گەورە دەفەرموویت : تۆ له دنیادا خەڵکانت بێ ئومێد دەکرد لەبەزەیی من ، ئەمڕۆش من تۆ بێ ئومێدەکەم لەبەزەیی خۆم .

بەداخەوە لەم ڕۆژەدا کەسانێک هەن بەڕاست و چەپ خەڵکان بێ ئومێد دەکەن له بەزەیی خوای گەورە بەجۆرێک وەک قەناس بەدەستێک میلیان هێناوەتەوە هەرچی یەک هەڵەی کرد یەکسەر تەکفیری دەکەن و ڕەوانەی جەهەنەمی دەکەن

بە هەتاهەتایی ، ئەی ئەوانەی ئەم سیفەتەتان هەیە لەخوا بترسن چونکە بە بەڵگەی فەرموودەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) لەو ڕۆژەدا ڕووتان ڕەش دەکرێت و دەخرێنە دۆزەخەوە .

لەو ڕۆژەدا تەنانەت پێغەمبەرانیش (علیهم سلام) بەکردەوەی خۆیان ناتوانن بچنە بەهەشتەوە ئیلا بەڕەحمی پەروەردگار نەبێت ! بۆچی ؟ با نمونەیەکی بچوکتان بدەمێ ، پێغەمبەرێک وەک محمد (ﷺ) هەموو ئەو کردەوانەی کە کردوویەتی لەژیاندا کە هەمووی ڕەحمەت و چاکەو خێرو بەرەکەت بووە بەڵام ئایا جێگای نیعمەتی یەک چاوی بۆ دەگرێتەوە ؟ کە خوای گەورە پێی بەخشیوە ! نەخێر هەرگیز هەموو کارو کردەوەکانی ناگاتە نیعمەتی چاوێک کە خوای گەورە بەتۆو بەو پێغەمبەرەیشی بەخشیوە ،

بۆچی ؟ چونکە

ئایا ئەزانیت خوای گەورە لە دامەزراندنی چاوێکدا چ تێچوویەکی کردووە بەجۆرێک چەندین دەزگای خستۆتە کار ، دەزگای ڕوناکی و دەزگای کارەباو وزە ، دەزگای میکانیکی ، کارگەو بەرهەمهێنانی وزەو خۆراک و گۆڕینی هۆرمۆن و ئەنزیم و پرۆتین ، ڕوبارێکی لەئاوی تفت ...هتد

بۆیە هەموو مرۆڤێک بەپێغەمبەرانیشەوە هیچمان کردەوەی خۆمان نامانکاتە بەهەشتەوە ئیلا ڕەحم و بەزەیی پەروەردگار نەبێت

لەو ڕۆژەدا لەناو ئومەتاندا ئومەتی محمد (ﷺ) ئومەتێکی ڕەحم پێکراوە و سزای لەسەرنیە چونکە سزای ئەم ئومەتە لەدنیایە کە بریتیە لە ئاژاوەو بومەلەرزەو بڕین و کوشتن

تۆی مسوڵمان لە ئومەتی محمد (ﷺ) ئەبیت و ڕەحمت پێ دەکرێت لەو ڕۆژەدا ئەگەر هاتوو کارو کردەوەکانت بەگوێرەی تواناو دوور لە هەواو ئارەزوو ڕێکخستبێت و نزیک کردبێتەوە بەگوێرەی قورئان و سونەتی پێغەمبەری خوا (ﷺ)

پەروەردگار هێندە بەڕەحم و بەزەییە بەو یەک بەشەی کە دایبەزاندۆتە سەر زەوی پێغەمبەرێکی بۆ ناردین کە زۆر بەڕەحمە بەجۆرێک کاتێک ئەم پێغەمبەرە

نازدارە (ﷺ) ئەم ئایەتەی دەخوێندەوە { رب إنهن أضللن كثيرا من الناس } هەردوو دەستی بەرز کردەوەو دوو جار فەرمووی ( خوایە ئومەتەکەم ) ئینجا گریا (( خوای پەروەردگار فەرمووی : ئەی جبریل بچۆ بۆلای موحەمەد و پێی بڵێ : ئێمە ڕازیت دەکەین لە ئومەتەکەتدا و نارەحەتت ناکەین ))

بۆیە هەرچۆنێک هەوڵتداوە بەڕاستی ببەرە یەکێک لە شوێنکەوتووانی ئەو ئومەتە ڕەحم پێکراوە چونکە لەو ڕۆژەدا ئەو ئومەتە سەرفرازو براوەیە و ٩٩ ڕەحمی خوای گەورەی پێ بەخشراوە

**تێبینی** / ئەم ٩٩ ڕەحمەی الله تعالى تەنها شمولی ئەوانە دەکات کە شەریکیان بۆ خوا بڕیارنەداوە بەهەموو جۆرەکانیەوە هەر (لە دارو بەردو بت و ئاژەڵ و خۆرو مانگ و مرۆڤ و سەرکردە پەرستی ...هتد ) و ژیانی خۆیان تەرخانی مرۆڤێک یان بت و داروبەردێک نەکردووەو تاغوت پەرست نەبوون و مەیل و خۆشەویستیان بۆ زاڵم و زۆردارو ستەمکاران نەبووە بەڵکو بۆ خوا ژیاون و کارو عیبادەت و گشت ساتەکانی تەمەنیان تەنها بۆ خواو لەپێناوی خوای گەورەدا تەرخان کردووە ...هتد

بەڕاستی تیاچوو ئەو کەسەیە لەو ڕۆژەدا ئەو هەموو ڕەحمە فراوانەی پەروەردگار شمولی نەکات کە هێندە بەبەزەییە کە تیایدا (شەیتانی یەکەم کافرو دەرچوو) لەئەمری خوای گەورە لەو ڕۆژەدا ملی درێژ دەکات لەدۆزەخەوە بەهیوای ئەوەی کە بەر ڕەحمی پەروەردگار بکەوێت بەڵام شمولی ناکات

( شەیتان کاتێک دەبینێ پەروەردگار لێخۆش بوونێک خۆش دەبێت لە باوەڕداران ملی درێژ دەکات بەهیوای ئەوەی ئەویش بەر ئەو حەملەی لێخۆش بوونە بکەوێت بەڵام ئەو ڕۆژە ڕەحمی پەروەردگار تەنها بۆ مسوڵمانی یەک خوا پەرستی باوەڕدارە )

لەو ڕۆژەدا خوای گەورە زۆر لە دایکێک بۆ جگەر گۆشەکەی بەڕەحمترە بۆ بەندەکانی خۆی

وەک چۆن دایکێک مناڵەکەی خۆی هەرگیز ناکاتە ئاگرەوە پەروەردگار زۆر لەو دایکە بەڕەحمترەو خۆشەویستانی خۆی ناخاتە ئاگرەوە بەڵکو پاداشتی گەورەو فراوانیان دەداتەوەو لێیان خۆش دەبێت بە لێخۆشبوونێکی زۆر فراوان

لەو ڕۆژەدا خەڵکانێک هەن کە بەزەیی خوای گەورەیان بۆ مسۆگەر بووە چونکە ئەمانە :

١/ بەزەییان بە خەڵکان و ئاژەڵان و باڵندەکاندا هاتۆتەوە لە زەوی و ئاسمانەکاندا ، ئەوانە بەبەزەیی بوون تەنانەت بۆ سەربڕینی چۆلەکەیەکیش بۆیە بەهۆی ئەو ڕەحم و بەزەییەیانەوە خوای گەورە ڕەحم و بەزەیی خۆی پێیان دەبەخشێت و بەزەیی دەبێت بۆیان

٢/ لەو ڕۆژەدا خەڵکانێک هەن دەبنە دراوسێی پەروەردگار چونکە ئەمانە مزگەوت و ماڵەکانی پەروەردگاریان کردووە بەماڵی خۆیان (واتە بەردەوام نوێژەکانیان لەماڵەکانی پەروەردگاردا ئەنجام داوە و هاتوچۆکاری بەردەوامی ماڵەکانی خوای گەورە بوون ) ئەمانە خوای گەورە کەفیلی بەڕەحم و بەزەیی خۆی کردووە بۆیان

٣/ کەسانێک هەن بەر ڕەحم و بەزەیی خوای پەروەردگار دەکەون لەو ڕۆژەدا چونکە ئەمانە ڕقی خۆیان خواردۆتەوە لەکاتێکا توانای دەربڕینیان هەبووە ، ئەم کەسانە خوای گەورە دڵیان پڕدەکات لەهیوا لەو ڕۆژەدا

٤/ لەو ڕۆژەدا خەڵکانێک هەن کە لەژیانی دنیایاندا بەردەوام لەهەوڵی ئەوەدا بوون ڕازیبوونی خوای گەورە بەدەست بێنن کە هەموو ڕێگەیەکیان گرتۆتە بەر بۆ گەیشتن بەو پلەیەو تا خوای گەورە بەجبریل علیە سلام دەفەرمووێت فلان کەسی بەندەم لەهەوڵی ئەوەدایە من ڕازی بکات لەخۆی ئێستا ڕەحمەتی منی لەسەر بێت ( واتە بەزەیی منی بۆ مسۆگەرە) جبریل دەفەرموێت : ڕەحمەت و بەزەیی خوا لەسەر فلانەکەس بێت ، پاشان هەڵگرانی عەرش ئەو وتەیە دووبارە دەکەنەوە ، لەپاش ئەوان ئەوانەی چواردەوری ئەوان ئەو وتەیە دووبارە دەکەنەوە تا هەموو نیشتەجێیان لەئاسمانەکان ئەوە دووبارە دەکەنەوە ، پاشان ئەو مژدەیەی بۆ دادەبەزێتە سەر زەوی ).

ئەم بەندانە بەزەیی و خۆشەویستی پەروەردگاریان بەدەست هێناوە بەهۆی دڵسۆزی و نیەت پاکی و بۆخوابوون و تەقواو و شوێن کەوتنی سوننەتی پێغەمبەر(ﷺ) ، تەوبەکردن ، پاک و خاوێنی ڕاگرتن ، پشت بەستن بەخوا ، دادپەروەری ، ئارام گرتن ، چاکەکردن ، تێکۆشان لەپێناوی خوای گەورەدا

... هتد ئەمانە بوونەتە خۆشەویستی پەروەردگار و خوای گەورەش هەرگیز خۆشەویستانی خۆی ناخاتە ئاگرەوە چونکە پەروەردگار بۆ باوەڕداران زۆر بەڕەحم و بەبەزەییە

پەروەردگار ١٠٠ ڕەحمی هەیە تەنها یەک ڕەحمی بەش کردووە لەنێوان خەڵکی دونیادا کە بەشی کردوون تا تەواوبوونی ئەجەلەکانیان و ٩٩ کەی تری هەڵگرتووە بۆ پیاوچاکانی خۆی لە ڕۆژی قیامەتدا

ئایا پیاو چاکان و ئەولیاکان کێن لەو ڕۆژەدا ؟

نوێژخوێنان ئەوانەی پێنج نوێژە فەرزەکانیان ئەنجامداوە بەدڵسۆزی کە خوای گەورە فەرزی کردووە لەسەریان ، ئەوانەی ڕۆژووی مانگی ڕەمەزانیان گرتووە و چاوەڕێی پاداشتی ڕۆژووەکانیان کردووە ، ئەوانەی خۆیان لەگوناهە گەورەکان پاراستووە کە خوای گەورە داوای دوورکەوتنەوەی لێ کردوون ، ئەوانەی کە زۆر موتەقی بوون لەدنیادا و خۆیان لە تاوان و گوناە پاراستووە لە شەرم و شکۆو پێگەی الله تعالی دا

موتەقیەکان ئەوانەن کە باوەڕی تەواویان بە پەروەردگار و بەو ڕۆژی قیامەتە هەبووە (کە ئێستا ئێوە دەیخوێننەوە) باوەڕیان بە مەلائیکەتان و کتێبەکان و پێغەمبەران هەبووە ئەمانە کەسانێکی تا بڵێی چاکەکار بوون و ماڵ و سامانیان بەخشیوە بە خزمان و هەتیوان و هەژاران و ڕێبواران و داواکاران لەپێناوی ئازادکردنی بەندەکاندا ، ئەمانە نوێژەکانیان زۆر بەچاکی و ڕێک و پێکی ئەنجام داوە و زەکاتی ماڵەکانیان دەرکردووە ، ئەمانە کەسانێکی زۆر بەوەفا بوون بۆ پەیمانەکانیان کاتێک بەڵێن و پەیمانیان داوە ، ئەو کەسانەش لە موتەقیەکانن کە لەکاتی جەنگ و شەڕو شۆڕدا ئارامگربوون ، ئا هەموو ئەوانە کەسانێکن کە ڕاستیان کردووە و هەر ئەوانیش موتەقی و خواناسن

هەر کەسێک بیەوێ ئەو پلەی موتەقیانە بەدەست بێنێت ئەبێ زۆر خۆی بپارێزێت لەوانەی قەدەغە کراون و ئەوانەش کە شوبهەیان لەسەرە نەوەک ببێتە هۆی کەوتنە ناو ئەو شتانەی کە حەرامکراو و قەدەغەکراون ، پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەفەرموێت : دیوارێک لەحەڵاڵ دابنێن لەنێوان خۆتان و کارە حەرام کراوەکان .

بۆیە تۆ دەتوانی ئەو پلەی تەقوایە بەدەست بێنیت ئەگەر کەسێکی ژیرو عاقڵ بیت و چالاک بیت و سستی نەکەیت لەکاری چاکەدا وە پێویستە نەفەس درێژبیت هەمیشە بەردەوام بیت لە کارە چاکەکاندا چونکە ئەگەر وانەبیت ئەوا بەڵگەت پێ نەدراوە کە خوا ڕەحمت پێدەکات یان نا چونکە ڕەحم و بەزەیی خوای گەورە لەو ڕۆژەدا تایبەتە بەکەسانێک کە خۆی بیەوێت و وە شایستەی ئەو ڕەحم و بەزەییە ببن ، بۆیە بێ گومان ئەو کەسانەی کە زۆر نزیکن لەم ڕەحمەتەی پەروەردگار ئەوانەن کە موتەقین چونکە پەروەردگار خۆی دەفەرمووێت ڕەحمەت و میهرەبانیم هەموو شتێکی گرتۆتەوە ، جا ئەو ڕەحمەت و میهرەبانیەم تۆمار دەکەم بۆ ئەو کەسانەی کە تەقوا (پارێزگاری لە تاوان و حەرامکراوەکان) دەکەن و زەکات دەدەن و ئەوانەش کە باوەڕی تەواو بەئایەت وفەرمانەکانی ئێمە دەهێنن .

لەو ڕۆژەدا کەسانێک هەن (پەروەردگار رەحمیان پێ دەکات ) ڕوویان دووردەخرێتەوە لە ئاگری دۆزەخ چونکە ئەمانە پارێزگاریان لەکەسایەتی براکانیان کردووە ( کاتێک لە کۆڕو مەجلیسەکاندا هەوڵی ئابڕووبردنیان براوە ئەمانە بەرهەڵستیان کردووەو پارێزگاریان لەکەسایەتی براکانیان کردووە )

هەر کەسێک ڕۆژێک بەڕۆژوو بێت لەپێناوی خوادا خوای گەورە ڕووی دووردەخات لەئاگر ٧٠ پایز لە ڕیوایەتێکی تردا ١٠٠ساڵ .

## مۆڵەتدان بە موحەمەد (ﷺ) بۆ تکاکردن لەچەند شوێنێکدا !

لەو ڕۆژەدا پێغەمبەری خوا (ﷺ) هەر جارێک لە مەوقیعێکدا دادەنرێت ئیزنی پێ دەدرێ و ڕێگەی پێ دەدرێ بۆئەوەی شەفاعەت بکات بۆ کەسانێک کە خوای گەورە خۆی بڕیاری لەسەردەدات کە شەفاعەتی بۆ بکرێت ، واتە پێغەمبەری خوا لەلایەن خوای گەورەوە تەنها لە چەند شوێنێکی دیاریکراودا بۆی هەیە شەفاعەت بکات وە تەنها بۆی هەیە شەفاعەت بۆ ئەو کەسانە بکات کە خوای گەورە بڕیاریان لەسەر دەدات

ئەو دیمەنەش بریتیە لەوەی کە خوای گەورە ئیزن دەدات بە پێغەمبەری خوا (ﷺ) تا تکاو داوا بکات بۆ مسوڵمانان لە ئومەتەکەی خۆی ، واتە هیچ کەسێک بەبێ ئیزنی خوا ناتوانێ تکا بکات لەو ڕۆژەدا

تکاکردنی ڕاستەقینە ئەوەیە کە داوا دەکرێت لە خوای گەورە و تکا کارەکەش ڕێزلێگیراو بێت و تکا بۆکراویش لەوانە بێت کە خوای گەورە ڕازیە لە قسەو کرداری دوای ڕێگەپێدان ، ئەم تکاکردنەش تەنها بۆ خەڵکی یەک خواپەرستی دڵسۆز دەبێت

خوای پەروەردگار دەفەرمووێت { ئەوانە خاوەنی تکا نین و کەس تکایان بۆناکات مەگەر ئەو کەسەی لەکاتی خۆیدا خوای میهرەبان بەڵێنی پێداوە کە تکا بکات یان تکای بۆ بکرێت } (مریم ٨٧)

وە دەفەرمووێت { لەو ڕۆژەدا تکاو شەفاعەت بێ سوودە و وەرناگیرێت مەگەر کەسێک خوای میهرەبان مۆڵەتی بدات و ڕازی بێت بەوەی قسەی بۆ بکرێت و قسەی لێوەربگیرێت } (طە ١٠٩)

وە دەفەرمووێت { هەر خوا دەزانێت ئەو خەڵکە لە ڕابردوودا چیان ئەنجام داوە و لە داهاتووشدا چی ئەنجام دەدەن فریشتەکانیش تکاکار نابن مەگەر خوا پێی ڕازی بێت ئەو فریشتانەش لەترسی ئەو زاتە ناوێرن هیچ سەرپێچیەک ئەنجام بدەن } ( الانبیاء ٢٨)

وە دەفەرموویت { زۆر فریشتەش لەئاسمانەکاندا هەن کە تکاو پاڕانەوەیان بێ سودە مەگەر خوا مۆڵەت بدات بۆهەرکەسێک کە شایستەیەو ڕازی بێت کە تکا بکات یان تکای بۆ بکرێت } (النجم ٢٦)

لە مەفهومی ئەم ئایەتانەی پەروەردگارەوە تێگەیشتین کە تکاو شەفاعەت لەلایەن پێغەمبەرەوە یان فریشتەکانەوە بەبێ مۆڵەت و ئیزنی پەروەردگار نابێت وە پەروەردگار تەنها خۆی ئیزن دەدات کە تکا بۆ کێ بکرێت و کێ شایەنی ئەوە دەبێت کە فریشتەکان یان پێغەمبەری خوا (ﷺ) داوای تکاو شەفاعەتی بۆ بکەن واللە اعلم

لەو ڕۆژەدا لەناو هەموو پێغەمبەراندا کە نێردراون بۆ سەر زەوی لەلایەن خوای گەورەوە تەنها پێغەمبەر محمد(ﷺ) مافی تکاو داواو پاڕانەوەی دەبێت لە پەروەردگار بۆ ئومەتەکەی چونکە هەموو پێغەمبەران (علیهم سلام) بۆیان هەبووە دوعایەکیان هەبێت هەموویان دوعاکانیان لەدنیادا پێ بەخشراوەو بۆیان هاتۆتە دی تەنها پێغەمبەری ئیسلام نەبێت کە داوای کرد دوعاکەی بکرێتە ڕۆژی قیامەت تیایدا تکا بکات بۆ ئومەتەکەی

پێغەمبەری خوا (ﷺ) لە ژیانی خۆیدا یەکێک لای پەروەردگارەوە هات بۆلای سەرپشکی کرد لەنێوان ئەوەی نیوەی ئومەتەکەی بچێتە بەهەشتەوە یان تکاو شەفاعەتیان بۆ بکات لە قیامەتدا ، ئەو خۆشەویستەش شەفاعەت و تکاکردنی بۆ سەرجەم ئومەتەکەی هەڵبژارد لەقیامەتدا ، وە هۆکاری هەڵبژاردنی تکاکردن و شەفاعەتیش بۆئەوە دەگەڕێتەوە کە پێغەمبەری نازدار (ﷺ) لەلایەن خوای گەورەوە پیشانی دراوە لەدوای خۆی چی ڕوودەدات لە ئومەتەکەیدا لە خوێن ڕشتن وئاژاوەو بەڵای گەورە بەهۆی ئەمەوە پێغەمبەری خوا(ﷺ) داوای لە پەروەردگار کرد کە شەفاعەت و تکاکردنی پێ ببەخشێت بۆیان لە ڕۆژی قیامەتدا و خوای گەورەش بۆی جێبەجێ کرد

لەو ڕۆژەدا دوای دانانی پردەکە ئینجا مۆڵەتی تکاکردن دەدرێ بە پێغەمبەری خوا (ﷺ) و ئەویش تکا دەکات بۆ ئەو مسوڵمانانەی کە شەریک و هاوتایان بۆ خوای گەورە بڕیارنەداوە بەڵام تاوانی گەورەیان ئەنجام داوە واتە مەرجی شایستە بوون بە شەفاعەت و تکاکردنی پێغەمبەر (ﷺ) دەبێ شەریک و هاوتات بۆ

خوای پەروەردگار بڕیارنەدابێت هەتا مردوویت هەرچەنە تاوانی زۆر گەورەشت ئەنجام دابێت

تکاکردن شەفاعەت کردن لەو ڕۆژەدا بۆ مسوڵمانە تاوانبارەکان دەبێت ئەوانەی تاوانی گەورەیان ئەنجام داوە بەڵام شەریکیان بۆخوای گەورە بڕیارنەداوە لەژیانیاندا وە شایەتیان دابێت کە هیچ پەرستراوێک نەبووە بە حەق کە شایستەی پەرستن بێت تەنها الله تعالی نەبێت کە تەنها ئەو شایستەی پەرستنە

لەو ڕۆژەدا ئەو مسوڵمانە تاوانبارانەی کە زۆر بەدڵسۆزی شاهیدیان داوە کە هیچ پەرستراوێک نیە تەنها الله نەبێت و وە محمد (ﷺ) نێردراوی خوایە بەدڵسۆزانە ، زمانیان دڵیانی بەڕاست خستبێتەوە وە دڵیشیان زمانیانی بەڕاست خستبێتەوە ) ئەمانە شەفاعەت و تکاکردنی پێغەمبەری خوایان (ﷺ) بۆ دەبێت

لەو ڕۆژەدا شەفاعەتی پێغەمبەری خوا (علیە صلاة والسلام) بۆ ئەو کەسانەشە کە لەسەرەمەرگدا شایەتمانیان هێناوە هەر لەبەرئەوەش بوو کاتێک مامی لەسەرە مەرگدابوو پێی فەرموو مامە بڵێ لا الە الاالله هەتا بتوانم شەفاعەتت بۆ بکەم لەو ڕۆژەدا بەڵام ئەوەبوو مامی نەیوت بۆیە مامی بەکافری مردو لەو ڕۆژەدا پێغەمبەری خوا (ﷺ) ناتوانێت شەفاعەتی بۆ بکات لای پەروەردگار تا ڕزگاری بێت لە سزا

پێغەمبەری خوا (ﷺ) سەردانی ماڵە جولەکەیەکی کرد کە کوڕێکیان هەبوو خزمەتی پێغەمبەری خوای دەکرد ، کاتێک ئەم کوڕە نەخۆش کەوت پێغەمبەری خوا (ﷺ) بەهاوەڵانی فەرموو با بچین بۆلای و سەری لێبدەین ، دەفەرمووێت چووین بۆلای و باوکی لای سەری کوڕەکەیەوە دانیشتبوو ، پێغەمبەری خوا پێی فەرموو (واتە بەکوڕەکەی فەرموو) بڵێ ( لا الە الا الله ) تا تکای پێبکەم بۆت لە ڕۆژی کۆتاییدا )) کوڕەکە وتی ( اشهد ان لا الە الا الله وان محمد رسول الله ) ئینجا پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی ( سوپاس بۆ ئەو خوایەی کە ڕزگاری کرد لە ئاگری دۆزەخ )

لەو ڕۆژەدا پێغەمبەری خوا (ﷺ) تکا بۆ ئەو هاوەڵە بەڕێزانەی خۆی دەکات کە توشی کوشتن و کوشتار و ئاژاوە هاتوون لەدوای خۆی هەرچەنە خوای گەورە لەهەموو هاوەڵان خۆش بووە (ئایەتی ١٠٠ سورەتی تەوبە) ،

ئەم تکاکردنەش بەهۆی داواکردنی هەندێ لەهاوەڵان بوو ئەویش لەکاتێکا بوو کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) مژدەی تکاکردنی بە هاوەڵانی ڕاگەیاند ئەوانیش فەرموویان ئەی پێغەمبەری خوا دەلاڵێینەوە لێت بەخوا و هاوەڵایەتیمان بۆت کە بمانکەیت بەئەهلی تکاکردنت ، پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی ئێوە لە ئەهلی تکاکردنی منن واتە ئێوە لەو کەسانە دەبن کە تکاکردنی من دەتانگرێتەوە

لەو ڕۆژەدا هەرکەسێک یەکێک بووبێت لە ئارامگرتووەکانی (سەختی و نارەحەتی ژیان بەسەربردن ) لە مەدینەدا یان لەوێ وەفاتی کردبێ ئەوا ئەو کەسە پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەبێت بەشایەت و تکاکار بۆی لە ڕۆژی قیامەتدا ئەگەر مسوڵمان بووبێت

هەر کەسێک لەدوای بانگەکان داواو پاڕانەوەی لە خوای گەورە کردبێت بەبەخشینی (الوسیله و الفضیلة) ( جێگەیەکە لەبەهەشتدایە ) بە پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئەوا ئەو کەسە پێغەمبەری خوا تکاو شفاعەتی بۆ دەکات لەو ڕۆژەدا

**تێبینی** / داواکردنەکە هەمووتان دەیزانن ئەو دوعایەیە کە دوای تەواوبوونی بانگ ئەیڵێیت ( اللهم رب هذه الدعوة التامة والصلاة القائمة ات محمدا الوسيلة والفضيلة و ابعثه مقاما محمودا الذي وعدته )

پێغەمبەری خوا (ﷺ) لەناو خزمانی خۆیدا تەنها بۆی هەیە شەفاعەت بۆ ئەوانە بکات کە بەمسوڵمانی وەفاتیان کردووە بۆیە لەو ڕۆژەدا هیچ نەژادو خزمایەتیەک نامێنێ و ئەپچڕێت تەنها نەژادو خزمایەتی پێغەمبەری خوا (ﷺ) نەبێت ئەویش ئەوانەن کە بە مسوڵمانی وەفاتیان کردووە و پێغەمبەری خوا (ﷺ) لەو ڕۆژەدا تکایان بۆ دەکات

ئایا شێوازی تکاکردن و شەفاعەت کردنی پێغەمبەری خوا (ﷺ) چۆنە ؟ ئایا پێغەمبەری خوا (ﷺ) چی دەفەرموێت لەو تکاو داوایەدا ؟

پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەفەرمێ کاتێ کە ڕۆژی کۆتایی دەبێت تکا دەکەم و دەڵێم ئەی پەروەردگارم بیکەرە بەهەشتەوە ئەو کەسەی بەئەندازەی دەنکە خەرتەلەیەک باوەڕی لەدڵدا هەبووە ، ئینجا دەچنە ناو بەهەشت ، پاشان دەڵێم بیکەرە ناو بەهەشتەوە ئەوانەی کەمترین شت لەباوەڕ لەدڵیاندا هەبووە

هەروەها پێغەمبەری خوا (ﷺ) داوادەکات و دەڵێت خوایە خۆش بیت لەهەموو بەندەیەکی مسوڵمان کە پێت گەیشتووە و باوەڕی بەمن بووە و هاوتای بۆ تۆ بڕیار نەداوە

لەو ڕۆژەدا تکاکردنی پێغەمبەری خوا (ﷺ) بۆدوو کۆمەڵ و تاقم نابن و نایانگرێتەوە ئەوانیش (سەرۆکە زاڵم و ستەم کارە خوێنڕێژەکان) و ( گروپە سەرلێشێواوەکان و خاوەن داهێنراوەکان و بیدعەکاران کە دەرچوون لە ئیسلام ) ( واتە دەرچوون لە ئەهلی سونەت و جەماعەت ) .

هەروەها ئەوانەش کە تکاو شەفاعەتی پێغەمبەری خوا (ﷺ) بەدرۆ بزانێت لەو ڕۆژەدا شەفاعەتی پێغەمبەری خوا نایگرێتەوە

ئەوانەی شەریک و هاوبەشیان بۆخوا بڕیاردابێت بەهەموو جۆرەکانیەوە ئەوا شمولی شەفاعەتی پێغەمبەری خوا ناکەن لەو ڕۆژەدا

**تێبینی** / ئەگەر تۆ شەریکت بڕیاردابێت یان یەکێک بووبیت لەو تاقمە گومڕاو داهێنراو و سەرلێشێواوانە یان زاڵم و ستەمکارو خوێن ڕێژ بووبیت ئەگەر تەوبەی ڕاستەقینەی لێبکەیت و بەیەکجاری وازیان لێبێنیت و ببیتە بەندەیەکی یەک خواپەرست و چاکەکارو تەوبەکار لەبەرخوا ئەوا لەو ڕۆژەدا ان شاءالله یەکێک لەوانە دەبیت کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) شەفاعەتت بۆ بکات تا ڕزگارت بێت لە سزای سەختی الله تعالی و دۆزەخەکەی

ژمارەی ئەوانەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) شەفاعەتیان بۆ دەکات لە ڕۆژی دواییدا ئێجگار زۆرە و لەناویشیاندا بەختەوەرترین خەڵکان کە بەر تکاکردنی پێغەمبەری خوا دەکەون (ﷺ) بریتین لە دڵسۆزەکان لەو ڕۆژەدا واتە ئەو کەسەی لە دنیادا زۆر بەدڵسۆزی لەناخی دڵیەوە وتوویەتی لا اله الا الله )

**تێبینی** / وتنی لا اله الا الله تەنها بەوەنیە کە بەزمان بیڵێیت و دووبارەی بکەیتەوە بەڵکو دەبێ کردەوەی پێ بکەیت ، چۆن ؟ کە وتت لا اله الا الله دەبێ خۆت بەری بکەیت لە هەموو بت و دارو بەردو تاغوتێک وە هەموو بەرنامەو دینێک و فکرو گروپ و ڕێچکەو ڕێگەیەک بێجگە لەئاینی تەوحیدی ئیسلام ، دەبێ تەنها خوا و بەرنامەو دینی خوای گەورە بەحەق بزانیت شوێنی هیچ دین و بەرنامەو فکرێکی

غەیری یەک خواپەرستی و قورئان و سونەتی پێغەمبەرەکەی (ﷺ) نەکەویت ، ئەمە پێی دەڵێن ئەوپەڕی دڵسۆزی لە وتنی لا الە الا اللە دا ئیتر ئەگەر تۆ بەم شێوەیە بوویت و تەنانەت ئەگەر تاوانی زۆر گەورەشت ئەنجام دابێت (تەوبەت لێکردبێت و ڕووت کردبێتەوە اللە ) ئەوکات شمولی شەفاعەت و تکا دەکەیت .

## مۆڵەتدان بە هەندێک دروستکراو و ئەندامی لاشە بۆ تکاکردن !

لەو ڕۆژەدا چەندین جۆر تکاکاری تر هەن هەر ئەوەش نا بەڵکو لەو ڕۆژەدا هەموو نەفسێک دەمەقاڵەیەتی و بەرگری لەخۆی دەکات بۆئەوەی ڕزگاری ببێت

لەو ڕۆژەدا خەڵکانێک هەن کە بانگیان داوە بەدەنگی بەرز بۆ نوێژو نوێژیان ئەنجامداوە لە چۆڵەوانیدا یان لەناو مەڕوماڵات و لادێکانیاندا بەهۆیەوە هەر شتێک گوێی لەدەنگی بانگ بێژ بێت لە جنۆکەو مرۆڤ و شتانی تر ئەوانە هەموو شایەتیان بۆ دەدەن لە ڕۆژی کۆتاییدا

**تێبینی** / ئەو کەسانەی کە بەتەنهان بەنمونە شوانێکە لەو دەشتەدا و مزگەوتی لێوە نزیک نیە ئەوانە ئەگەر خۆیان بانگ بدەن و قامەت بکەن و پاشان نوێژەکانیان بکەن ئەجریان ئێجگار گەورەیە یان ڕێیان کەوتبێتە هەر شوێنێکی تر دوور بێت لە مزگەوت و دوور لەخەڵکان و دوور لە ئاوەدانی بووبن ئەوا پاداشتی ٥٠ نوێژی بۆ دەنوسرێت ئەگەر بەتەنیا بانگ بدات و قامەت بکات و نوێژ ئەنجام بدات والله اعلم

لەو ڕۆژەدا کەسانێک هەن سەرە پەنجەکانی دەستیان دێنە زمان و پرسیاریان لێ دەکرێت و تکایان بۆ دەکەن چونکە ئەو کەسانە زیکرو یادی پەروەردگاریان زۆر پێکردووە

**تێبینی** / وەک پێشتر ئاماژەی پێدرا زۆر ئاساییە لەڕووی پزیشکیەوە ئەگەر جینی ناو (DNA) ی تایبەت بە زمان و ئاخافتن لەناو خانەکانی پەنجەکاندا چالاک بکرێت ئەوا پەنجەکان دێنە زمان و قسەکردن

لەو ڕۆژەدا کەسانێک هەن قورئانی پیرۆز دەبێتە تکاکار بۆیان و قورئان دەڵێت : خوایە من خەوتنم لێ قەدەغەکردبوو بەشەو بمکە بەتکاکار بۆی ) چونکە ئەم کەسانە هاوڕێی قورئان بوون و هەمیشە خوێندوویانەتەوەو کاریان پێکردووە ، وەهیچ کەسێک بەهیچ کارێک زیاتر هێندەی خوێندنەوەی قورئانی پیرۆز نزیک نابێتەوە لە پەروەردگار

بۆیە خۆت نزیک بکەرەوە لەخوای گەورە و هەموو هەوڵێکت بخەرەکار و باش بزانە تۆ بەهیچ کارێک نزیکتر نابیتەوە لە خوای گەورە کە خۆشەویستر بێت لای بەوێنەی خوێندنەوەی وتەکانی پەروەردگار ( واتە قورئانی پیرۆز )

لەو ڕۆژەدا قورئان و قورئان خوێنەکان دێن کە کاریان پێکردووە لە دونیادا وە سورەتی ( البقرة و ال عمران ) وەک دوو پەڵە هەور پێشیان دەکەون ( واتە پێش سورەتەکانی قورئان دەکەون ) . ، ئەو دوو سورەتە بەتایبەت بەڵگە دەهێننەوە بۆ خاوەنەکەیان ( تکا دەکەن بۆ خاوەنەکانیان ) ، ئەو دوو سورەتە ( البقرەو ال عمران ) بە دوو سورەتە گولاوییەکە ناسراوە و زۆر بیانخوێنن دەبنە سێبەر بەسەرتانەوە لەشێوەی پەڵە هەور یاخود پۆلی باڵندە لەو ڕۆژەدا تکاتان بۆ دەکەن

سورەتی تبارک (الملک) کە ٣٠ ئایەتە لەو ڕۆژەدا تکا دەکات بۆ خاوەنەکەی ئەوانەی زۆر خوێندوویانە ، هەر کەسێکیش شەوان پێش خەوتن بیخوێنێت سزای گۆڕی لەسەر هەڵدەگیرێت

لە ڕۆژی قیامەتدا بەردە ڕەشەکە دەهێنرێت کە دوو چاوی هەیە تەماشای پێدەکات و زمانێکی هەیە قسەی پێدەکات و شایەتی دەدات بۆ ئەو کەسەی کە دەستی لێداوە بەڕاستی

**تێبینی** / بەزمانی ئەمڕۆ تەنها بۆ تێگەیشتن دەتوانین بڵێین بەردە ڕەشەکە دەکرێتە نمونەی ڕۆبۆتێکی کۆمپیوتەری و ناوی هەموو ئەوانەی تیا تۆماردەکرێت کە بەدڵسۆزی دەستیان لێداوە لەپێناوی خوای پەروەردگاردا ( دەست لێدان بەمانای پەرستنی بەردەکە نایەت بەڵکو دروشمێکەو هیچی تر )

لەو ڕۆژەدا ڕۆژوو لەگەڵ قورئاندا تکادەکەن بۆ بەندە ، ڕۆژوو دەڵێت ئەی پەروەردگار من خواردن و خواردنەوەم لێ قەدەغە کردبوو بەڕۆژداو تکام لێ وەرگرە بۆی ، قورئانیش دەڵێت ئەی پەروەردگار خەوتنم لەبەندەکەت قەدەغەکردبوو بەشەودا تکام لێ وەرگرە بۆی ، ئینجا هەردووکیان تکایان لێ وەردەگیرێت

لەو ڕۆژەدا باوەڕداران هەندێکیان ڕێگەیان پێ دەدرێت کە تکا بۆ هەندێکی تریان بکەن :

لەو ڕۆژەدا ئەو کەسەی شەهید بووە لەپێناوی بەرزڕاگرتن و گەیاندنی دینی خوای گەورەدا بەدەرچوونی یەکەم دڵۆپی خوێنی ، خوای گەورە لەهەموو تاوانەکانی خۆش دەبێت ، هەروەها شەهید دەتوانێ لەو ڕۆژەدا تکا بۆ ٧٠ کەس لە خزمانی خۆی بکات

لەو ڕۆژەدا پیاوانی زۆر ڕاستگۆ (الصديقين ) بانگ دەکرێن بۆ تکاکردن و وەک مەلائیکەتە بەڕێزەکان تکادەکەن بۆ مسوڵمانان ئەویش بەگوێرەی پلەی ڕاستگۆیی و باوەڕیان دەبێت هەتا ڕاستگۆی وا هەیە تکا بۆ سەرجەم عەشیرەتێک دەکات ( بەنمونە پیاوی وا ڕاستگۆو پلەبەرز هەیە کە دەتوانێ تکا بۆ عەشیرەتێکی گەورە بکات و بچنە بەهەشت بەنمونە (وەک عەشیرەتی بەنی تمیم بکات) کە یەکێکە لە هۆزە گەورەکانی عەرەب ) ، لەو ڕۆژەدا بڕواداران تکا بۆ یەکتر دەکەن تەنها ئەوانە نەبێت کە وشەی لەعنەت و نەفرەتیان زۆر بەکارهێناوە لە دونیادا چونکە لەعنەتکاران نابن بەتکاکارو شایەتی دەر لەو ڕۆژەدا

تکاکردنێک هەیە کە باوەڕداران هەر لەدونیادا کردوویانە بۆ برایانی مردووی خۆیان لەکاتی نوێژکردن لەسەریان لە دونیادا بەهۆیەوە خوای گەورە تکاکردنەکەیان لێ وەردەگرێت چونکە پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەفەرمووێت ( هەر مسوڵمانێک بمرێت و ٤٠ پیاو (لەڕیوایەتێکی تردا ١٠٠ کەس) نوێژ بکەن بەسەر تەرمەکەیەوە و ئەو کەسانە هاوتاو شەریکیان بۆخوا بڕیار نەدابێت ئەوانە چی داوابکەن بۆ مردووەکە خوای گەورە تکاکردنەکەیان لێ وەردەگرێت ).

لەو ڕۆژەدا کەسانێک دێن و پارەیان وەرگرتووە کە مافی خۆیان نەبووە ئەمانە وەک ئەو کەسە وان کە دەخۆن و تێرنابن ، لەو ڕۆژەدا ئەو پارە ناحەقیە دەبێت بەشاهید بەسەریانەوە کە بەناحەق وەریان گرتووە

لەو ڕۆژەدا زەوی شایەتی دەدات لەسەرئەوانەی لەسەر پشتی ژیاون وە چ کارێکیان ئەنجام داوە

سەبارەت بەشایەتی دانی زەوی ( ئیمامی عەلی خوای گەورە لێی ڕازی بێت (بیت المال) ی گسک دەدا و کردبوویە شوێن نوێژو نوێژی تیادەکرد بەوهیوایەی ئەو جێگەیە شایەتی بۆ بدات لە ڕۆژی قیامەتدا )

هەر بەندەیەک لەهەر جێگەیەک لە جێگەکانی زەویدا سوجدەو کڕنوشی بۆ خوا تیادا بردبێت ، ئەو جێگەیە شایەتی بۆ دەدات لە ڕۆژی کۆتاییدا ، لەو ڕۆژەشدا کە ئەو بەندەیە دەمرێت زەوییەکە بۆی دەگری .

## وەرگرتنەوەی بڕوانامەکان لە گۆڕەپانی مەحشەردا !

لێرەدا باسەکانی لێپێچینەوە کۆتایی هات، ئیتر لە ئێستا بەدواوە نامەی کردەوەکان دابەش دەکرێت بەسەر باوەڕداران و بێ باوەڕان ( دوو ڕووەکان )

لەساتی دابەشکردنی ئەم نامەی کردەوانەدا ئەگەر بەندەکان پێویستیان بەتەرازوو هەبوو بۆ پێوانی کردەوەکانیان ئەوا تەرازوویان بۆ دەهێنرێت و چاکەو خراپەکانیان پێوانە دەکرێت ( دواتر بە وردەکاری باسی دەکەین )

لەو ڕۆژەدا نامەی کردەوەکان دابەش دەکرێت بەسەر باوەڕداران و بێ باوەڕان (دووڕووەکان) ، خوای پەروەردگار لە ڕۆژی کۆتاییدا هەموو کردەوەکانی مرۆڤی لە کتێبێکدا کۆکردۆتەوە و نیشانی بەندەکەی خۆی دەدات تا هەموو شتێکی لێ ڕوون و ئاشکرا بێت کە خوای گەورە لەهەموو کردەوەکانی ئاگاداربووە

وە لەو ڕۆژەدا پاداشت و سزا بەپێی کردەوەکانی دەبێت و وە نامەی کردەوەکان هەموو کارەکانی ئەو کەسەی تیایە لە بچوک و گەورە کە ئەنجامی داون لە ژیانی دنیایدا

لەو ڕۆژەدا کە نامەی کردەوەکان دادەنرێت و تاوانباران دەبینرێن دڵەڕاوکێیانە لە کارو کردەوەی ناپەسەندی تۆمارکراویان ، بۆیە لەوێدا بێ باوەڕان دەڵێن هاوار بۆ ئێمە ئەم نامەو دۆسیەیە چیە ! کە هیچ گوناهێکی وردو درشت جێناهێڵدرێت ئیلا هەمووی تیادا تۆمارکراوە ، ئەو خەڵکە هەرچیەکیان کردبێ (لەدنیادا) ئامادەیە (تیایدا) ، بێگومان پەروەردگار ستەم لە هیچ یەکێک ناکات .

**تێبینی** / لەو ڕۆژەدا پەروەردگار زۆر دادپەروەرەو تەنانەت یەک زوڵمیش لەهیچ کەسێک ناکات هەمووی بە ئەنجامی کردەوەکانی خۆی پاداشت و سزا وەردەگرێت و ئەگەر بیشیکاتە بەهەشتەوە بەگەورەیی ڕەحمەتی خۆی دەیکاتە بەهەشتەوە ، ئەگەر بشکرێتە دۆزەخەوە بەگەورەیی تاوان و کوفرو کردەوەکانی مرۆڤەکان خۆیان دەکرێنە دۆزەخەوە .

{هەرچی کارو کردەوەیەک کە ئەنجامیان داوە لە (لوح المحفوظ) و لای فریشتە چاودێرەکان تۆمارکراوە *هەرچی وردو درشت هەیە لەکاروکردەوەیان نوسراوەو تۆمارکراوە }

لەو ڕۆژەدا هەموو یەکێک نامەی کردەوەکانی خۆی پێ دەدرێت لە نوسراوێکدا و وەخوای گەورە ستەم لەکەس ناکات بەنوسینی خراپەیەک کە نەیکردبێت بەڵکو تەنها ئەو کردەوانە نوسراوەتەوە تیایدا کە خودی بەندەکان خۆیان ئەنجامیان داوە لە ژیانی دنیایاندا

{لەو ڕۆژەدا هەموو خەڵکان بانگ دەکرێن بەناوی پێشەواکانیانەوە جا ئەوانەی نامەی کردەوەکانی بدرێتە دەستی ڕاستی ئەوانە سەیری نامەی کردەوەکانی خۆیان دەکەن و دەیخوێننەوە و (دەبینن) هێندەی تاڵی دەزووی ناوکی خورما ستەمیان لێ ناکرێت (لێ نەکراوە) }

لەو ڕۆژەدا داوا لەهەموو کەس دەکرێت کە نامەی کردەوەکانی خۆی بخوێنێتەوەو خۆی حوکمی خۆی بدات ، هەموو کەسێک دەتوانێت نامەی کردەوەکانی خۆی بخوێنێتەوە هەرچەندە نەخوێندەواریش بێت

لەو ڕۆژەدا لە کردەوە چاکەکانی باوەڕداران تەنها ئەو کردەوانەی تیادا تۆمار کراوە کە تەنها لەبەر ڕەزامەندی خوا ئەنجام دراوە

**تێبینی** / لەو ڕۆژەدا هەر مرۆڤێک نامەیەک دەدرێتە دەستی کە کردەوەکانی تێکڕای ژیانی خۆی تیادا تۆمارکراوە بەجۆرێک هیچ کردەوەیەکی بچوک و گەورەی تیا بەجێنەهێڵدراوە ئیلا هەمووی تۆمارکراوە و نوسراوە پاشان داوایان لێدەکرێت کە خۆیان نامەی کردەوەکانیان بخوێننەوە و خۆیان حوکمی خۆیان بدەن ، لەو ڕۆژەدا هەموو دەتوانن نامەی کردەوەکانیان بخوێننەوە بەخوێنەوارو نەخوێنەوارەوە چونکە بێجگە لەوەش کردەوەکانیان بەدەنگ و ڕەنگ پیشان دەدرێتەوە لەوڕۆژدا ( چونکە وزە لە دنیادا لەناو ناچێت و دەمێنێتەوە )

وەرگرتنەوەی نامەی کردەوەکانیش بۆ ئەوەیە کە هەموو تاکێک بزانێت کە خوای پەروەردگار ئاگاداری وردو درشتی کارو کردەوەکانی بووە بۆچی ؟ چونکە خەڵک ئەمڕۆ وەکو دەبینین هیچ حسابێک بۆ پەروەردگار ناکەن زوڵم و کوفرو

تاوان دەکەن بەجۆرێک وادەزانن و وا گومان دەبەن کە خوای پەروەردگار ئاگای لێ نیە بۆیە لەو ڕۆژەدا خوای گەورە پیشانیان دەداتەوە کە چۆن هیچ کردەوەیەک جێنەهێڵدراوە بەوردەکاری هەموو شتێک تۆمارکراوە

**لەو ڕۆژەدا وەرگرتنەوەی نامەکان بە دوو شێوەیە:**

**یەکەم** / باوەڕداران نامەی کردەوەکانیان بەدەستی ڕاست وەردەگرنەوە ، چۆن ؟ خوای گەورە لەو ڕۆژەدا هەموو بەندەیەکی خاوەن باوەڕ نزیک دەکاتەوەو لە خەڵکانی دەشارێتەوە و وایلێدەکات کە دان بە هەموو گوناهەکانیدا بنێت تا دەگاتە ئەوەی کە باوەڕدارەکە دان بەهەموو تاوانەکانیدا دەنێت و ئینجا وا گومان دەبات کە تەواو ئیتر ڕزگاربوونی نیەو دەخرێتە دۆزەخەوە بەڵام خوای پەروەردگار پێی دەفەرمووێت من لەدنیادا بۆم پۆشی بوویت ئەمڕۆش لێت دەبوورم پاشان نامەی کردەوەکانی پێدەدرێت (بەدەستی ڕاستی )و خاوەن باوەڕەکە تەماشا دەکات کە هەموو تاوانەکانی تیادا سڕاوەتەوە و تەنها کردەوە چاکەکانی تیایە ، ئەم بەندەیە کە بەوشێوەیەی لەگەڵ کرا پێدەچێت بەهۆی ئەوەوە بێت کە نهێنی و تاوان و کەم و کوڕی براو خوشکە مسوڵمانەکانی خۆی لەدنیادا پۆشی بێت لەبەر خوا چونکە پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەفەرمووێت ( هەرکەسێک نهێنی و کەم و کوری برا مسوڵمانەکەی بپۆشێت ( لەدنیادا) ئەو کەسە خوای گەورە نهێنی و کەم و کوڕیەکانی بۆ دەپۆشێت لەڕۆژی قیامەتدا ) ،

**تێبینی** / ئەم لێپرسینەوەیە پێی دەڵێن لێپرسینەوەی سوک و ئاسان کە خوای گەورە لە بەندە خاوەن باوەڕەکانی خۆی دەپرسێتەوە و تەماشای نامەی کردەوەکانیان دەکات و لێیان خۆش دەبێت

دوای ئەم لێپرسینەوە ئەو باوەڕدارە بەوەرگرتنی نامەی کردەوەکانی (بروانامەکەی) بەدەستی ڕاست کە تاوانەکانی تیادا سڕاوەتەوەو هەمووی بووە بە چاکە بۆی ئیتر زۆر بەخۆشحاڵیەوە دەگەڕێتەوە ناو خزم و کەسەکانی لەو گۆرەپانەی مەحشەرەدا و نامەی کردەوەکانی پیشانی خزمانی دەدات و لەخۆشیدا بیریان دەهێنێتەوە کە هەر ئەو لە دنیادا باوەڕی بەزیندووبوونەوە و پێدانی نامەی کردەوەکانی هەبووە مژدەیان پێدەدات (کە بەهەشتی بەدەستهێناوە)

بیهێنە پێش چاوی خۆت لەو ساتەی لە گۆڕەکەت زیندوو دەکرێیتەوەو بەناو ئەو هەموو نارەحەتی و سەختیەی قیامەتدا تێئەپەڕی و ئەو هەموو ساڵە چاوەڕێ دەکەیت و ئەو هەموو ترس و خەم و خەفەت و چاوەڕوانیەت بەسەرا دێت کە نازانی چارەنووست چیە و مەسیرت چی دەبێت ئایا (دواڕۆژت خۆشی و بەهەشتی هەتا هەتاییە) یاخود (سزاو دۆزەخ و سوتانی هەتاهەتایە کە مردن نیەو بەبەردەوامی لاشەت دەسوتێت و بۆت دروست دەکرێتەوە) ، لەدوای هەموو ئەمانە بانگت بکەن و پەروەردگار لێپرسینەوەت لەگەڵ بکات و ڕەحمت پێ بکات و نامەی کردەوەکانت بەدەستی ڕاست وەربگریت و خوای گەورە خۆی مژدەی بەهەشتت بداتێ و لەتاوان و گوناهەکانت خۆش بێت و تۆش بەو بڕوانامەیەوە بێیتەوە ناو خزمانت هاواربکەیت بەگریانەوە لەخۆشیدا بڵێی دەرچووم و بەهەشتی هەتا هەتاییم بەدەست هێنا !

دەبێ خۆشی هەبێ لەوە خۆشتر بێت !؟ دەبێ لەدوای ئەو ساتە زێڕینەو وەرگرتنی ئەو نامەو بڕوانامەیە لەو ڕۆژەدا ئیتر دڵمان بە چ بڕوانامەیەکی دنیامان خۆش بێت !!! ئا ئەوە پێی دەڵێن بردنەوەی ڕاستەقینە ..هتد یاڕەبی پێمانی ببەخشیت

**دووەم/** ئەگەر کەسەکان دووڕوو و منافقە کافرەکان بوون ئەوا نامەکانیان هەمووی پڕە لە کوفرو تاوان و ...هتد بۆیە ئەمانە ڕێزی ئەوەیان پێنادرێت کە نامەی کردەوەکانیان بەدەستی ڕاست وەربگرن بەڵکو بەدەستی چەپ و لەپشتەوە دەدرێتە دەستیان لەبەردەمی هەموو خەڵکاندا واتە نابرێنە شوێنکی شاراوە تا لەپێش چاوی خەڵکیدا ونبکرێن بەڵکو لەو ڕۆژەدا بێباوەڕان و دووڕوان بانگیان لێدەکرێت و دەستنیشان دەکرێن و لەپێش چاوی ئامادەبووان (کە ژمارەیان ملیۆنەها و ملیارەها کەسن) ئابڕوویان دەبرێت ، ئامادەبووان دەڵێن (واتە خەڵکان دەڵێن) ئا ئەوانە بوون کە درۆیان بەناوی خواوە دەکرد ، هەی نەفرەتی خوا لە ستەمکاران بێت ، لەو ڕۆژەدا ئەمانە نامەی کردەوەکانیان بەدەستی چەپ لە پشتیانەوە پێیان دەدرێت (چونکە دەستی ڕاستیان کۆت و زنجیر کراوە و بەستراوەتەوە بە گەردنیانەوە لەبەرئەوە دەدرێتە دەستی چەپیان لە پشتەوە) ، ئەم بێ باوەڕو دووڕوانە کە بەم جۆرە نامەی کردەوەکانیان پێدەدرێت (ئەوانە بوون باوەڕیان بەخواو پێغەمبەران (علیهم سلام) نەبوو شوێن هەواو ئارەزووی خۆیان کەوتبوون لە دنیادا) ،

ئەم بێ دینانە بەوەرگرتنی نامەی کردەوەکانیان دەترسێن (چونکە باش دەزانن چ زاڵم و کافرو بێدینێک بوون ) و نامەکانیان دەبینن کە هەموو تاوانێکی بچوک و گەورەو (زوڵم و ستەم) کە لە دنیادا ئەنجامیان داوە تیایدا تۆمارکراوە وە پاشان بەهۆیەوە دەست بەشیوەن و هاوار دەکەن و دوعای تیاچوون و لەناوچوون دەکەن و (هەریەکێکیان) دەڵێ خوایە بمکوژە ( بەڵام مردن نیە ) ئینجا خۆزگە دەخوازن و دەڵێن خۆزگە لەناوچووینایەو زیندوو نەبووینایەتەوە و هەر خۆڵ بووینایە پاشان دەخرێنە ناو دۆزەخی سوتێنەرەوە ، ئەمانە لە دونیادا لەناو کەسوکاری خۆیاندا دڵخۆش بوون بە (کوفرو) تاوانەکانیان و سەرپێچی فەرمانی خوای گەورەیان دەکرد بیریان لەسەرەنجامەکەی نەدەکردەوە (بەخوڕافات و درۆیان دەزانی و پێکەنینیان بەم ڕۆژە دەهات) ، وە زۆر دڵخۆش و کەیف خۆش بوون لەو کاتانەی کە بە کوفرو تاوان و سەرپێچی بەسەریان دەبرد، (بەڵام ئەو دڵخۆشییە کەمەی دنیا توشی خەفەتی درێژو بەردەوامی قیامەت و سەرەنجامی دۆزەخی کردن).

ئەوان گومانیان وابوو کە لە ڕۆژی قیامەتدا ناگەڕێنەوەو وایان دانابوو زیندوو بوونەوەو لێپرسینەوەو گەڕاندنەوە نیە. (گاڵتەیان پێ دەهات بە درۆو دەلەسەیان دەزانی وەک بێدینەکانی ئەمڕۆ کە بۆیان باس دەکەیت پێکەنینیان دێت بەخوڕافاتی دەزانن و وادەزانن دنیا هەر بەهەوانتە دروست بووەو ئەم هەموو سیستەمە گەورەو سەرسوڕهێنەرەی زەوی و ئاسمانەکان و خۆرو مانگ و ئەستێرەکان و شەو و ڕۆژ و زیندەوەران لەخۆڕا دروست بوون و ئیتر تەواو هیچ حساب و کتابێک نیە و لێپرسینەوەو زیندووبوونەوە نیە ( لەخەیاڵدا دەژین ئا ئەم بێ باوەڕو کافرو مولحیدانە) !!؟ )

بەڵام بەدڵنیاییەوە بەڵێ لێپرسینەوەو زیندوو کردنەوە هەیە [إِنَّ رَبَّهُ كَانَ بِهِ بَصِيرًا (١٥)] بە دڵنیایی پەروەردگار زۆر بینەرەو هەموو کردەوەکانی بینیوەو ئاگای لە هەموویەتی و هەمووی نووسراوەو پارێزراوە (تۆمارکراوە) ، وە لەسەر هەمووی لێپرسینەوەی لەگەڵدا دەکرێت.

لەو ڕۆژەدا ئەم بێدین و بێ باوەڕانە خۆزگە دەخوازن کە هەرگیز نامەی کردەوەکانیان پێ نەدرایەو حسابی خۆیان نەزانیایە وە خۆزگە دەخوازن کە

مردنەکەی دنیایان یەکجاری بووایە و زیندوو نەبوونایەتەوە و خۆڵ بوونایە ، پاشان خوای گەورە کۆت و زنجیر دەخاتە گەردنیان و فەرمان دەکات کە بخرێنە ناو دۆزەخەوە ، پێش خستنە ناو دۆزەخەوە ئەم کافرو بێدینانە هەریەکەیان بەو کۆت و زنجیرەوە لەلایەن فریشتەیەکەوە دەبرێن بۆلای باوەڕدارێک و پێی دەوترێت (بەباوەردارەکە دەوترێت) ئا ئەم بێ باوەڕە (ئەم بێدینە) لە جێگەی تۆ دەخرێتە دۆزەخ و شوێنەکەی تۆی پێ پڕدەکرێتەوە لە دۆزەخ ( واتە هەموو فریشتەیەک لەو ڕۆژەدا کافرێکی لەگەڵدایە کە کۆت و زنجیر کراوەو فریشتەکە بە باوەڕدارەکە دەڵێت ئەی خاوەن باوەڕ ئەو کافرە لەجێی تۆ دەبێت لە دۆزەخ و لەوێ دادەنرێت

**تێبینی** / هەموو مرۆڤێک دوو جێگەی هەیە یەکیان لەدۆزەخە و ئەوی تریان لەبەهەشتە ئەم مرۆڤانە بەپێی (تەوحیدو باوەڕبوونیان بەخوای گەورەو پێغەمبەران و ) پاشان دڵسۆزیان لە عیبادەتەکانیان جێگەی بەهەشتیان بەدەست دێنن بەپێچەوانەشەوە بەهۆی کافربوونیان و زوڵم و ستەم و نوێژنەکردن و بێ باوەڕییان جێگەی دۆزەخیان پێ دەدرێت دەکرێنە ناوییەوەو سزا دەدرێن .

ئەم حاڵەی بێدین و کافران پێی دەڵێن دۆڕان و لەناوچوونی هەتاهەتایی و گەیشتن بە سزای هەتاهەتایی ناو بەندینخانەکانی دۆزەخ

## گۆڕانکاری بەسەر روخسارەکاندا لەو رۆژەدا بۆ دوو شێوە !

لەو ڕۆژەدا ڕووداوێکی گرنگ ڕوودەدات ئەویش بریتیە لە ڕوو سپی بوون و ڕوو ڕەش بوون

لەو ڕۆژەدا خاوەن باوەڕانی دڵسۆزی یەکخوا پەرست لە شوێنکەوتووان و پەیڕەوانی ئەهلی سونەت و جەماعەت کە ڕێنموویی ڕێبازی پێغەمبەرەکەی خۆیان کردووە وە ڕێنموویی هەڵسوکەوتی هاوەڵە بەڕێزەکانی پێغەمبەری خوایان کردووە (ﷺ) و لایان نەداوە لەو ڕۆژەدا ئەمانە ڕوویان گەش وسپی دەبێت

لەو ڕۆژەدا بێ باوەڕان و مونافیقەکان و ئەوانەی باوەڕیان بەو ڕۆژە نەبووە هەر لەسەرەتاوە ڕوویان ڕەش دەبێت

لەو ڕۆژەدا کۆمەڵانێک لە مسوڵمانان ڕوویان ڕەش دەکرێت چونکە بیدعەچی و لادەر بوون لەو بەرنامە پاک و پوختەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) و هاوەڵان (خەلیفە ڕاشیدینە هیدایەت دراوەکان) لەسەری بوون

ئەوان (مسوڵمانە ڕووڕەشکراوەکان) هاتبوون لەسەر هەواو ئارەزووە خراپەکانی خۆیان و گۆڕینە نارەواکانیان بۆ دین و گومانە گومڕاکانیان بەردەوام بوون و چەندین کارو کردەوەیان (مەبەست لە کرداری عیبادەتیە) زیاد کرد بۆناو دینەکە بەبێ ئەوەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) کردبێتی ، ئەوانە لەو ڕۆژەدا ڕوویان ڕەش دەکریت.

لەو ڕۆژەدا ئەم مسوڵمانە بیدعەچیانە ڕوویان ڕەش دەبێت بەهۆی لادانیان لە ڕێگەی ڕاست و شوێن ئەو ڕێچکانە کەوتوون کە ڕازاندوویانەتەوە بەو بیرو بۆچوونە گومڕاکارانەی خۆیان ، لەو ڕۆژەدا ڕووی هەموو ئەوانە ڕەش دەبێت کە دەهاتن بەرنامە پاکەکەی ئیسلامیان تێکەڵ دەکرد بەبەرنامە گومڕاو دەستکردەکانی خۆیان و خەڵکان ، وە بەناوی ڕیفۆرم و نوێخوازیەوە خەڵکانیان پێ لە خشتە دەبرد

لەو ڕۆژەدا هاوشێوەی ئەمانەی باسکران حاڵیان بەم شێوەیەی لێدێت { لەو ڕۆژەدا ڕوخسارانێک هەن کە گرژو تاڵ وتۆزاوی وپەست و غەمگینن * دێزی و ڕەشی و تاریکی داپۆشیون * ئا ئەوانە بێ باوەڕەکان و تاوانبارە گوناهبارەکانن} عبس ٣٨-٤٢

بۆچی بیدعەچی و گروپە گومڕاکەرەکان ڕوویان ڕەش دەکرێت ؟

چونکە خوای گەورە لە سورەتی ال عمران دا فەرمان بەباوەڕداران دەکات کە لانەدەن لە ڕێنموویی پێغەمبەرەکەیان هەتاوەکو وەک ئومەتە پێشووەکان نەبن کە لایاندا لە ڕێنموویی پێغەمبەرەکانیان وە لایاندا لە کتێبەکەی خوای گەورە کە بوو بەهۆی ئەوەی کافر ببن دوای باوەڕهێنانیان

{وَلَا تَكُونُوا كَالَّذِينَ تَفَرَّقُوا وَاخْتَلَفُوا مِنْ بَعْدِ مَا جَاءَهُمُ الْبَيِّنَاتُ وَأُولَئِكَ لَهُمْ عَذَابٌ عَظِيمٌ (١٠٥) يَوْمَ تَبْيَضُّ وُجُوهٌ وَتَسْوَدُّ وُجُوهٌ فَأَمَّا الَّذِينَ اسْوَدَّتْ وُجُوهُهُمْ أَكَفَرْتُمْ بَعْدَ إِيمَانِكُمْ فَذُوقُوا الْعَذَابَ بِمَا كُنْتُمْ تَكْفُرُونَ (١٠٦)}

ابن عباس (ڕەزاو ڕەحمەتی خوای گەورەی لێبێ) لە تەفسیری ئەم ئایەتەدا دەفەرمووێ ( ڕووی ئەهلی سوننەو جەماعەت سپی دەبێت وە ڕووی کۆمەڵانی ئەهلی بیدعەچی و جیاوازخواز و ئاژاوەگێڕ ڕەش دەبێت )

ئیمامی ابن کثیر (ڕەحمەتی خوای لێبێ) لە تەفسیری ئەم ئایەتەدا دەفەرمووێ { ئەمەش لەڕۆژی کۆتاییدا دەبیت (واتە ڕوو ڕەش بوون و سپی بوون) کە ڕووی ئەهلی سوننەو جەماعە سپی دەبێت و ڕووی کۆمەڵی بیدعەچی و جیاوازکارو (خۆجیاکەرەوە) ڕەش دەبێت }

لەم ئایەتەوە تێگەیشتین ئەگەر هەرکەسێک لەو بەرنامەیە لابدات و ڕێچکەو ڕێگەی تر بگرێتە ڕێ و شتی نوێ زیادبکات بۆناو دین ئەوا سەرەنجام سەردەکێشێ بۆ بێ باوەڕبوون و شرک و کوفرو گومڕایی بوون و ئەمانەش لەو ڕۆژەدا ڕوویان ڕەش دەکرێت چونکە زیادو کەمیان کردووە شتیان داهێناوە لە دیندا

لەو ڕۆژەدا ئەوانەی کە دینەکەیان پارچە پارچە کردو چەندین گروپ و تاقم و کۆمەڵیان دروستکردو خۆیان جیاکردەوە لە مسوڵمانان ڕوویان ڕەش

دەکرێت لەناویشیانا بەتایبەت خەواریجەکان کە بوونە تاقمێکی جیاوازو کەوتنە کوشتنی مسوڵمانان و مسوڵمانانیان پەرتەوازە کردو کردیاننە چەندین گروپ و تاقمی جیاواز و ناکۆک ، بۆچی ؟ چونکە دەرچوون لە ڕاستە ڕێیەکەی ئیسلام و خۆیان جیاکردەوە هەستان بە دروستکردنی ڕێچکەو ڕێگەی جیاوازو ناکۆک کە خاوەنەکەی بەرەو دەرەوەی بازنەی ئیسلام و بەرەوکوفری دەبات و پەرتەوازەیی لەنێو مسوڵمانان دروست دەکات و ئەم کەسەش لە ڕۆژی قیامەتدا ڕووی ڕەش دەکرێت و کارەکانی وەک خۆڵەمێش پەرش و بڵاودەبێتەوە لەکاتێکدا بایەکی زۆر بەهێز لێی دەدات

ئەم خەواریجانە پێغەمبەری خوا (ﷺ) وەسفی کردوون بە سەگەکانی ئاگر کە لە ئاین دەرچوون : ئەوانەی لەشەودا شەونوێژیان دەکرد و لە ڕۆژیشدا بەڕۆژوو دەبوون و ئەوانەی کە مسوڵمانانیان دەکوشت بت پەرستانیان وازلێدەهێنا و ئەوانەی کە ئایەتەکانی خوای گەورەیان دەخوێندەوەو لە قورقوڕاگەیان بەرەو ژوورتر نەئەچوو ، ئەمانە لە ئیسلام دەرچوون وەک چۆن تیر لە نیشانەو نێچیر دەردەچێت ، ئەمانە ڕوویان ڕەش دەکرێت چونکە قورئان و فەرموودەی پێغەمبەریان (ﷺ) ڕوون دەکردەوە بە بۆچوون و هەواو ئارەزووی خۆیان وبەخەڵکانیان ڕادەگەیاند کە ئەو بۆچوونانە ڕاستەو جگە لەخۆیان کەسی تریان بەڕاست نەدەزانی و دڵخۆش بوون بە بەرنامەکانی خۆیان لەژێر ناوی ئیسلامەوە وە دڵخۆش بوون بە جیاوازی و بەتاقم و گروپ و کۆمەڵەکانیان ، ئەم ڕەفتارانەیان هەمووی درۆکردن بوو بەناوی خواو پێغەمبەرەکەیەوە (ﷺ)

ئەم خەواریجانە خراپترین کوژراوانن کە کوژرابن لەژێر پەردەی ئاسماندا و چاکترین کوژراوانیش ئەوانەن کە ئەمانە کوشتوویانن ، ئەمانە سەگەکانی دۆزەخن چونکە ئەمانە مسوڵمان بوون و ئێستاش کافربوون

( ئەوانە یەکەم تاقم بوون کە تەفرەقەیان لە ئیسلامدا دروست کردو خۆیان لەهاوەڵان جیاکردەوەو تەفرەقەو دووبەرەکیان نایەوە خوێنی مسوڵمانانیان ڕشت)

## روخساری تاقم و فرقە گومڕاکارەکان و بیدعەچیەکان !

خوای گەورە دەفەرموویێت { لە ڕۆژی هەستانەوەدا دەبینیت ئەوانەی درۆیان بەناوی خواوە دەکرد (شتی نارەوایان تێکەڵ بەدین دەکرد) ڕوخساریان ڕەش و تاریکە ئایا شوێن و جێگەی ئەو خۆبەزل زانانە دۆزەخ نیە ؟ } الزمر ٦٠

بۆیە ئیمامی مالک (رەحمەتی خوای لێبێ) دەفەرموویێت هیچ ئایەتێک نیە سەختتربێت لای تاقمە گومڕاکەرەکان وەک ئەم ئایەتە { یوم تبیض وجوە وتسود وجوە ...}

ابن کثیر (ڕەحمەتی خوای لێبێ) لەتەفسیری ئەم ئایەتەدا دەفەرمێ ( خوای گەورە پێمان ڕادەگەیەنێت کە لە ڕۆژی دواییدا هەندێ لە ڕووەکان سپی دەبێت و هەندێکی تریان ڕەش دەبێت و ڕووی کۆمەڵی جیاوازکار (تفرقە) ڕەش دەبێت و ڕووی ئەهلی سوننەو جەماعە سپی دەبێت ئەمانە هەمووی لەڕێگەی بیدعەچێتیەوە گەیشتنە کوفر وەک ابن تەیمیە (ڕەحمەتی خوای لێبێ) دەفەرموێ (بیدعە پۆستەو گەیەنەرە بۆ کوفر) ، کەواتە بیدعەکاران بەهۆی زیادکردنیان لەئاینی ئیسلام و بەگژداچوونەوەی ڕێنماییەکانی پێغەمبەری خوا (ﷺ) بەتایبەتی و وە لادان لە قورئان و سونەت بەگشتی وایلێکردن کە (لەقیامەتدا) ڕووڕەش بن

چونکە بیدعەکاران ئەگەر وازیان لێ بهێنرێت هەموو بەندەکان و خەڵکانی تر گومرا دەکەن و کەسیشیان (لەنەوەی تازە) لێ نابێت مەگەر خراپەکارو تاوانبار نەبێت

وەک خوای پەروەردگار لەسورەتی نوح ئایەتی ٢٧ لەسەر زمانی نوح علیە سلام دەفەرموویێت : { بەڕاستی ئەگەر تۆ وازیان لێ بهێنیت هەموو بەندەکانی تۆ گومرا دەکەن و کەسیشیان لێ نابێت (لەنەوەی تازە) مەگەر خراپەکارو تاوانبار نەبێت }

**بەکورتی/** خەواریجەکان (سەگەکانی دۆزەخ) و هەروەها بیدعەچیەکان کە گروپ و کۆمەڵی جیاواز جیاوازیان دروستکردووەو خۆیان جیاکردۆتەوە لە عامی مسوڵمانان

و هەر گروپ و کۆمەڵێکیشیان دڵیان بە خۆیان و بەرنامەی گروپەکانیان و ڕێچکەو ڕێبازەکانیان خۆشەو خۆیان بەڕاست و حەق دەزانن لەو ڕۆژەدا ڕوویان ڕەش و غەمگین و پەست و گرژ دەکرێت و ڕەشی و تاریکی دایدەپۆشێت .

لەکۆتاییدا چارەنوسی ئەمانە تەنها لای پەروەردگارە

ئەمانە ئەگەر یەکخواپەرست بووبن و هاوبەشیان بۆخوا پەیدا نەکردبێت بەنمونە وەک خەواریجەکان ئەوا لە کۆتاییدا لە دۆزەخ دەردەهێرێنەوەو دەکرێنە بەهەشتەوە بەهۆی تەوحیدەکەیانەوە والله اعلم

لەکۆتاییدا خۆشی و سەرفرازی و بردنەوە بۆ ئەوانەی کە لایان نەداوە لە ڕێگە ڕاستەکەی پێغەمبەری خوا علیە صلاة والسلام وە هیچ بیدعەو داهێنانێکیان نەکردووە لە دینداو خۆیان نەبەستۆتەوە بەهیچ گروپ و کۆمەڵ وفرقەیەکەوە و هەروەها وەک خەواریجەکان دەستیان لەڕشتنی خوێنی مسوڵماناندا نەبووە ئەوانە لە ڕۆژی قیامەتدا ڕوخساریان سپی و گەش دەکرێت ڕێزی گەورەو تایبەتیان لێ دەگیرێت و بەهەشتیان بەنسیب دەکرێت .

## تەرازووە سەرنج ڕاکێش و پێشکەوتووەکان !

دوای لێپرسینەوەو تکاکردنی پێغەمبەری خوا علیه صلاة والسلام لەگەڵ تکاکردنی تکاکارانداو دوای بەخشینی نامەی کردەوەکان و ڕووسپی کردن و ڕوو ڕەشکردن ئینجا باسەکەمان دەگاتە ساتی تەرازووکردنی کردەوەکان

زانایان فەرموویانە ئەگەر لێپرسینەوە کۆتایی پێ هات تەرازووکردنی کردەوەکان بەدوایدا دێت چونکە لێپێچینەوە بۆ جێگیرکردنی کردەوەکانە و تەرازووکردن بۆ پاداشت وەرگرتنەوەو بۆ ئاشکراکردنی ئەندازەکانیانە بۆئەوەی پاداشتەکان بەگوێرەی ئەندازەی کردەوەکانیان بێت

خوای پەروەردگار دەفەرموێ { والوزن یومئذ الحق ...} واتە (تەرازووکردن لەو ڕۆژەدا حەق و ڕاستیە ...) باوەڕبوون بەتەرازووکردنی کردەوەکان یەکێکە لە پایەکانی باوەڕبوون بەڕۆژی کۆتایی وە بریتیە لە باوەڕبوون بە بەهەشت و دۆزەخ و میزان (تەرازوو) ی کردەوەکان

### ئایا ئەم تەرازووە چیە و شێوەی چۆنە ؟

تەرازووی کردەوەکان دوو تای هەیەو هەستی پێدەکرێت و دەبینرێت و نامەی کردەوەکانی پێ دەپێورێت (لەکردەوەی چاک و خراپ) ، پێدەچێت لەو ڕۆژەدا چەندین تەرازووی جۆراوجۆر هەبێت هەروەک پەروەردگار دەفەرمووێت {ونضع الموازین القسط } ، لەوەش دەچێت مەبەست پێی جۆری کردەوەکان بێت نەک جۆراو جۆری تەرازووەکان (خوای گەورە خۆی زاناترە )

مەشهورە کە تەرازووی کردەوەکان یەک تەرازووە بۆ سەرجەم ئومەتەکان و بۆ سەرجەم کردەوەکان و دوو تایەکەشی بەئەندازەی زەوی و ئاسمانەکانن بەجۆرێک ئەگەر ئاسمان و زەوی تیا بکێشرێت جێگایان تیادەبێتەوە ، فریشتەکان دەڵێن ئەی پەروەردگار ئەمە بۆ کێشانی کێیە ( واتە کێ دەتوانێ ئەوەندە کردەوەی چاکی هەبێت کە ئەم تەرازووەی پێ پڕ بکاتەوە ) خوای گەورەش دەفەرمووێت

بۆئەوانەیە کە خۆم دەمەویێت لە دروست کراوانم ، مەلائیکەتەکان دەڵێن : پاکی بۆ تۆیە ئێمە نەمان پەرستوویت بەپەرستنێک کە تەواو شایستەی تۆ بێت .

**تێبینی** / پێشکەوتوویی ئەو تەرازووە مەگەر خوای گەورە بۆخۆی بزانێت چۆنە، ئەبێت چ تەرازوویەک بێت کە هەرچی کارو کردەوەی مەعنەوی و جەستەیی و وتەیی هەیە بیخوێنێتەوە ! ، ئێمە لە دنیای خۆماندا لەم سەردەمەدا چەندین ئامێرمان هەیە کە زۆر شت دەخوێنێتەوە بەتایبەتی لەبواری پزیشکیدا کە (CT scan) و (MRI) و (RAY-X) و (Ultrasound) و ... هتد کە ئەمانە هەمووی پشکنینی ناو لەشی مرۆڤەکانی پێدەکرێت ئەمە تەنها بۆ ئەندامەکانی ناو لاشەیە لەبواری پزیشکیدا ، ئەی لەبوارەکانی ترا کە چەندین ئامێر هەیە فەحس و پشکنینی ئامێرە ئەلکترۆنیەکان و کارگەکانی پێ دەکرێت ...هتد ، ئێستا تۆ بیهێنە پێش چاوی خۆت ئەبێ ئەو تەرازووەی پەروەردگار چەنێ پێشکەوتوو بێت کە فەحس و پشکنینی هەرچی کارو کردەوە و وتەو مەعنەوی و جەستەیی هەیە پێی دەکرێت و هەمووی دەخوێنێتەوەو پێوانەو حساب و کتابی دەکات

**تێبینی** / وەک پێشتر باسم کرد پێغەمبەری خوا (ﷺ) هەمیشە بۆ ئەو بابەتە غەیبیانە بڕگەو وشەیەکی بەکارهێناوە کە ئەوەندە هاوەڵان لێی تێبگەن ، هاوەڵان پێویستیان بە وردەکاری چۆنێتی ئەو تەرازووە نەبووە بۆیە پێغەمبەری خوا (ﷺ) هەرئەوەندە دەربارەی تەرازووەکەی فەرمووە کە پێویست بووە

لەو ڕۆژەدا خەڵکان دەهێنرێن بۆلای تەرازووەکەو لەوێشدا جیدال و دەمەقاڵەیان دەبێت بەتوندترین جۆری دەمەقاڵە

لەو ڕۆژەدا خوای گەورە هەموو کردەوەکانی مرۆڤ بە بچوک و گەورەوە تەرازوو دەکات بەدادپەروەرانە و ستەم لەهیچ کەسێک ناکات و هیچ خراپەو چاکەیەک ون ناکات و پاداشت و سزای لەسەر دەداتەوە

دوای دانانی کردەوەکان لە دووتای تەرازووەکەدا سەنگی کردەوەی خاوەن باوەڕ قورس دەبێت بە کردەوە چاکەکانی، وە سەنگی کردەوەکانی سوک دەبێت بە کردەوە خراپەکانی، وە هەرکەسێک تای تەرازووەکەی قورس بێت ئەوە سەرفرازدەبێت و هەرکەسێک تای تەرازووەکەی سوک بێت ئەوا ڕەوانەی جەهەنەم دەکرێت

لەو ڕۆژەدا تەرازوو دادەنرێت و پیاوێک دەهێنن دەیخەنە تایەکی تەرازووەکەوە و کردەوەکانیشی کە لەسەری ژمێردراوە دەخرێتە تایەکەی تریەوە ئینجا کردەوە خراپەکانی قورستر دەبێت و دەنێردرێت بۆ دۆزەخ ، کە کاتێ پشتی پێ هەڵدەکرێت و دەبرێت بەرەو دۆزەخ بانگ کارێک لەلایەن خواوە بانگ دەکات و دەڵێت : پەلەمەکەن پەلەمەکەن چونکە ئەوە شتی تری ماوە ئینجا بیطاقەیەک دێنن کە (لا اله الا الله) ی تێدایە لەگەڵ پیاوەکەدا دەخرێتە تای تەرازووەکەوە قورسی دەکات و بەجۆرێک قورستر دەبێت لەهەموو کردەوە خراپەکانی پیاوەکە )

لەو ڕۆژەدا حەمدو سەناو ستایشی پەروەردگار (زیکرەکان بەتایبەتی) تەرازوو پڕدەکات .

پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەفەرموویت : خوای گەورە پیاوێک لە ئومەتەکەم ڕزگار دەکات لە پێش چاوی دروستکراوان لەڕۆژی کۆتاییدا ٩٩ کتێبی گەورەی بۆ دەکاتەوە هەموو کتێبێک مەودای چاوبینینێک دەبێت (واتە هەتا دوورترین شوێن کەچاو ببینێت) ئینجا خوای گەورە پێی دەفەرموویت : ئایا نکوڵی لە هیچ شتێ لەمانە دەکەیت (کارەکانی کەلەناو کتێبەکان تۆمارکراوە) ، (ئایا مەلائیکەی نوسەری کردەوەکان ستەمیان لێکردوویت ؟)

دەڵێت : نەخێر ئەی پەروەردگار ، خوای گەورە دەفەرموویت : ئایا هیچ پاساوێکت هەیە یاخود هیچ چاکەیەکت هەیە ؟ پیاوەکە لە زمان دەکەوێت و دەڵێت : نەخێر ئەی پەروەردگار ، خوای گەورە پێی دەفەرموویت : بەڵێ تۆ لای ئێمە چاکەیەکت هەیە ئەمڕۆ ستەمت لێ ناکرێت ، بیتاقەیەکی بۆ دەردەکات کە تیایدایە (اشهد ان لا اله الا الله وان محمدا رسول الله ) دەفەرموێت : (ئامادەی بکەن) و تۆش ئامادەی کێشانەکەت ببە ، ئەویش دەڵێت ئەی پەروەرگار دەبێت ئەم پارچە کاغەزە (بیتاقەیە) چی بێت بەرانبەر ئەو هەموو پەرتووکە گەورانە ؟ خوای گەورە دەفەرموویت : تۆ ئەمڕۆ ستەمت لێ ناکرێت ، دواتر پەرتووکە گەورەکان دەکرێنە تایەکی تەرازووەکەوەو پارچە کاغەزەکەش دەکرێتە تاکەی ترەوە ، ئینجا (بیتاقەکە یاخود پارچە کاغەزەکە) پەرتووکە گەورەکان بەئاسماندا دەبات وپارچە کاغەزەکەش قورس دەبێت و هیچ شتێک قورس نابێت بەرامبەر ناوی خوا ) .

بەڵێ لا اله الا الله تەرازوو قورس دەکات چونکە ئەگەر ئاسمانەکان و زەوی بکرێنە تایەکیەوە (لا اله الا الله)ش بکرێتە تاکەی دیکەیەوە ئەوا (لا اله الا الله) لەهەموویان قورستر دەبێت

پێغەمبەر نوح (علیه سلام) پێش ئەوەی وەفات بکات بە کوڕەکەی فەرموو : من وەسێتەکەت بۆ دەگێڕمەوە.......فەرمانت پێ دەکەم بە (لا اله الا الله) چونکە گەر هەر ٧ ئاسمان و هەر ٧ زەوییەکە بکرێتە تایەکیەوە و ( لا اله الا الله )ش بکرێتە تاکەی تر ئەوا ( لا اله الا الله) قورستر دەبێت لەهەموویان و ئەگەر هەر ٧ ئاسمان و هەر ٧ زەوییەکە کە ئەڵقەیەکی داخراوبن (لا اله الا الله) تێکیان دەشکێنێت ) ،

هەر لەبەرئەمەش بوو پێغەمبەری خوا (ﷺ) ناڕازی بوو لە ئوسامەی کوڕی زەید کاتێک کە ئەو بێ باوەڕەی کوشت کە هەڵهاتبوو لەشەڕەکەدا و بەدوایدا ڕای کردوو کە پێی گەیشت وتی ( لا اله الا الله) و ئوسامەش کوشتی ، ئەوەبو کە ئەمەیان گێڕایەوە بۆ پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئەویش بەئوسامەی فەرموو : کێ هەیە بتپارێزێ لە ( لا اله الا الله ) لە ڕۆژی کۆتاییدا ).

لە ڕیوایەتێکی تردا پێغەمبەری خوا (ﷺ) سێ جار (دووبارەی کردەوە) پێی فەرموو : چی دەکەیت بەرامبەر (لا اله الا الله) ئەگەر ڕۆژی کۆتایی هات .

تێبینی / لەو ڕۆژەدا ( لا اله الا الله ) بەو مەرجانەی کە لە بواری بیروباوەڕدا (عەقیدەدا) ڕوونکراوەتەوەو هەیە ئەگەر پەیڕەوی بکەیت و زۆر بە ڕاستگۆیی و بەئیخلاس و بەدڵسۆزی جێبەجێی بکەیت واتە هیچ (کەسێک و شتێک و ڕۆح لەبەرێک و بەرنامەو فکرەو دینێک ...هتد) نەکەیتە بت و خواوەند و بیپەرستی بەڵکو تەنها الله تعالی ببپەرستی وە شوێنی بەرنامەکەی لە (قورئان و سونەتی نێردراوەکەی) بکەویت و مەیل و خۆشەویستی و وەلائت بۆ هیچ بەرنامەو گروپ و لایەنێک و دینێک و زاڵم و ستەمکارو زۆردارێک نەبێت و سەرخەری شوێنکەوتەکانیان نەبیت لەغەیری دینی ئیسلامی تەوحیدی الله تعالی ئەوا ئەو ( لا اله الا الله) یە لەو ڕۆژەدا تەرازووەکەت قورس دەکات ئەگەر چی لە تایەکیاندا تاوانەکانت هێندەی ئاسمانەکان و زەوی قورس بێت ئەوا ئەو تایەی تر کە (لا اله الا الله) بەراستی و دڵسۆزی تیایە تای پڕ لەتاوانەکان دەبات بە ئاسماندا والله تعالی اعلم

لەو ڕۆژەدا کەسانێک دێن تای تەرازووەکانیان زۆر قورس دەبێت چونکە زۆر بەڕەوشت بوون لە ژیانیاندا بەجۆرێک پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەفەرمووێ ( قورسترین شتێک کرابێتە ناو تەرازووی باوەڕدار لە ڕۆژی کۆتاییدا خورەوشتی جوانە ....)

لەو ڕۆژەدا دوو کەلیمە هەن کە زۆر ئاسانن لەسەر زمان قورسن لە تەرازوودا وە زۆر خۆشەویستن لای خوای گەورە بریتین لە (سبحان الله بحمده سبحان الله العظیم )

پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەفەرمووێ دەست نوێژ نیوەی باوەڕە (الحمدلله) تەرازوو پڕدەکات و (سبحان الله و الحمدلله) تەرازووی کارەکان تەواو پڕدەکات یاخود نێوان ئاسمان و زەوی پڕدەکات

پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەفەرمووێت ( دوو شت هەن گەر هەر مسوڵمانێک پارێزگاریان بکات ئەوا دەچێتە بەهەشتەوە ئەو دوو شتە ئاسانن و ئەوانەی کاری پێدەکەن کەمن : ئەو کارەش وتنی (سبحان الله) لەدوای هەموو نوێژێکەوە ١٠ جار لەگەڵ (الحمدلله) ١٠ جار وە (الله اکبر) بڵێت ١٠ جار .....ئەوا سەدو پەنجایە بەزمان و پێنج سەدە لە تەرازوودا وە هەر کاتێک چووە سەر جێگا بۆ نوستن ( سبحان الله ، الحمدلله ، الله اکبر) سەدجار بڵێت ئەو کارە سەدە بەزمان و ١٠٠٠ بە تەرازوو ...)

لەو ڕۆژەدا (سبحان الله ، الحمدلله ، لا اله الا الله ، الله اکبر) زۆر قورسن لە تەرازوودا

لەو ڕۆژەدا زیکرێک هەیە کە زۆر ئاسانەو تەرازوو قورس دەکات و کێشانەکەی و پاداشتەکەی هاوتای ئەوەیە کە کەسێک لەدوای نوێژی بەیانیەوە دانیشتبێت تا کاتی نوێژی چێشتەنگاو لەشوێنی خۆیدا ، ئەو زیکرەش تەنها ٤ وشەیە ( سبحان الله وبحمده عدد خلقه ورضاء نفسه وزنة عرشه و مداد کلماته )

لەو ڕۆژەدا کەسانێک هەن ملیۆنێک چاکەیان بۆ دەنوسرێت و دەکرێتە تەرازووەوە چونکە ئەم کەسانە کاتێک چوونەتە بازاڕەوە وتوویانە ( لا اله الا الله وحده لا شریک له له الملک و له الحمد یحي ویمیت وهو حي لا یموت بیده الخیر وهو علی کل شيء قدیر ) ، ئەم زیکرە یەک ملیۆن چاکە بۆ خاوەنەکەی دەنوسرێت

و یەک ملیۆن خراپەی بۆ دەسڕدرێتەوە و یەک ملیۆن پلە بەرزی دەکاتەوە وە خانوویەکی پێشکەش دەکرێت بەهۆیەوە لە بەهەشتدا

لەو ڕۆژەدا کەسانێک هەن کە تەرازووەکانیان قورس دەبێت چونکە ئەمانە منالّ و کوڕو کچی چاکیان جێ هێشتووە لەدوای خۆیان کاتێک مردوون (ئەوانە چی کارێکی چاکە ئەنجام بدەن ئەجری دایک و باوکیشیان دەنوسرێت بەهەمان شێوە بەبێ ئەوەی لەهی خۆیان کەم بکات )

**تێبینی** / مندالّەکانت لەسەر تەوحیدو ئیسلام پەروەردە بکە سبەینێ تەرازووی کردەوە چاکەکانت قورس دەکەن

خاوەن باوەڕ لەسەر هەموو کردەوەکانی پاداشتی دەدرێتەوە هەتا دڕکێکیش بچێت بەپێیدا بەلّکو هەتا لەسەر نان خواردن و خواردنەوە و نوستنیش ، بەلّکو هەتا لەسەر تێری ئەو ئەسپەش کە ئامادەی کردووە بۆ جیهادکردن لەپێناوی خوادا ، واتە لە تەرازووی کردەوەکانیا بۆی هەژماردەکرێت

لەو ڕۆژەدا مرۆڤ تەرازووی چاکەی بە کارە چاکەکانی قورس دەبێت نەک بە قەبارە و کێشی جەستەی ، لەو ڕۆژەدا پیاوی زۆر قەلّەو گەورەو زەبەلاح دەهێنن و دەیخەنە تای تەرازوویەکەوە بەلاّم کێشی هێندەی بالّە مێشولەیەک وەزنی نابێت ، چونکە لەڕاستیدا تەرازووەکان بەدەستی خوای گەورەیە کەسانێک بەرزدەکاتەوەو کەسانێکیش نزم دەکاتەوە

لەو ڕۆژەدا تەنها کردەوە گرنگە بۆ تەرازوو نەک کێشی جەستە چونکە مسولّمانی وا هەیە لەڕو لاوازو قاچ باریکە بەلاّم لای خوای گەورە (بەهۆی کردەوەکانیەوە) تەنها یەکێک لە قاچە باریکەکانی لە کێوی ئوحود قورسترە

هەرکەسێک ڕووکەشی باشتربێت لە ناوەڕۆکی تەرازووی سوک دەبێت لە ڕۆژی کۆتاییدا ، وە هەرکەسێکیش ناوەڕۆکی باشتربێت لە ڕووکەشی تەرازووی قورس دەبێت لە ڕۆژی کۆتاییدا

لەو ڕۆژەدا کەسانێک دێن هەر مسولّمانن و برای مسولّمانانن و شەو نوێژیش دەکەن و چاکەکانیان هێندەی شاخەکان و چیاکانی توهامە گەورەو سپین خوای

گەورەش دەیكات بەتۆزی با بردوو لەو ڕۆژەدا چونكە ئەمانە كاتێك بەپەنامەكی شتە حەرامەكانیان بۆ ڕێكەوتووە ئەنجامیان داوەو خۆیان لێ نەپاراستووە

هەروەها پێویستە باش بزانین كە ئێمە گەرچی هەر كارێكی چاكە ئەنجام بدەین بۆئەوەی تەرازووی كارەكانمانی پێ قورس بكەین ئەوا ئێمە ناتوانین ئەوە ئەنجام بدەین تەنها ئەوە نەبێت كە خوای گەورە سۆزو میهرەبانی خۆی بڕژێنێت بەسەرمانداو كارەكانمانی پێ قورس بكات كەواتە پێویستە زۆر بپاڕێینەوەو داوا لە خوای گەورە بكەین كە بەڕەحمی خۆی تەرازووی كردەوەكانمان قورس بكات لەو ڕۆژەدا بەشێوازێک كە پێغەمبەری خوا (ﷺ) داوای كردووە و فەرموویەتی ( خوایە لێم خۆش ببەو شەیتانەكەم بچوک و لاڵ بكە و كۆت وزنجیرەكانمان لێ بكەرەوە (واتە ئەو كارە خراپانەی ڕێگەدەگرێت لەو كارە چاكانەی كە ئادەمیزاد دەیەوێت پێی هەڵبستێت) و تەرازووی كارەكانم قورس بكەو بمخەرە ناو هاوەڵانی ژوورەوە (واتە: جبریل و میكایل و .....)

قورسترین كارە چاكەكان لە تەرازووی بەندەكاندا ئەو كارانەن كە قورسترین كاربوون لەسەر جەستە ، هەركەسێكیش كاری سەرشانی بەتەواوەتی ئەنجام دابێت بۆخوای گەورە پاداشتی تەواوی دەدرێتەوە

**بەكورتی** / لەو ڕۆژەدا كردەوەكانت و دڵسۆزیت لە كردەوە چاكەكانتدا تەرازووەكەت قورس دەكەن ، لەو ڕۆژەدا ئەوەی تەقوای خوای گەورەی نەبووبێت هەرچەنە كاری چاكەی زۆر بووبێت بەڵام لە پەنامەكیدا كاری حەرامی بۆ ڕێكەوتبێ خۆی لێ نەپاراستبێ ئەوا سەرجەمی كردەوە چاكەكانی ئەبێتە تۆزی بابردوو و هیچ وەزنێكیان نابێت ، بۆیە پێویستە هەمیشە داوا لە خوای گەورە بكەین كە لێمان خۆش بێت و بەرەكەت بخاتە تەمەن و كارو كردەوە چاكەكانمانەوەو لەهەمووی گرنگتر دڵسۆزی و تەقوامان پێ ببەخشێت بەجۆرێک بمانگەیەنێتە ئاستێک كاتێک فرسەتی حەرامێک هاتە بەردەممان و بەردەستمان لەڕێزو شكۆو گەورەیی و خۆشەویستی پەروەردگاردا جورئەتی ئەنجامدانی نەكەین

لێرەدا باسی تەرازوو كۆتایی پێ هات ، ئینجا گەشتی باوەڕداران و پاشماوەی دووڕووەكان دەست پێ دەكات بۆ ناوچە تاریكاییەكان و ڕێگا ترسناكەكان .

## گەشتکردن بۆ ناوچە تاریکاییە سەختە ترسناکەکان !

بیرخستنەوەیەکی کورت/ڕۆژی قیامەت بەرپابوو بەهۆی ئامێرێکی پێشکەوتووەوە دەنگێکی گەورە دەرچوو کاری لە دەزگای بیستن کردو سەرجەم زیندەوەران هەموو بەیەکجار ڕۆحیان لەلاشەیان جیابۆوە ، نیزامی ئاسمانەکان و زەوی تێکچوو شاخ و چیا گەورەکان هەموو چوون بەئاسمانا هەروەکو خوری شیکراوەی ڕەنگاوڕەنگیان لێهات ، وە سەقفی ئاسمان شەقبوو درزی تێ بوو توایەوە ، ئامێرەکە جارێکی تر فوی پێداکرایەوەو سەرجەم زیندەوەران بەهۆی بارانێکی تایبەتەوە لاشەکانیان لە چەند خانەیەکەوە دروستکرایەوەو دەستی بەدابەشبوون کردەوە پاشان ڕۆحەکان گەڕێندرانەوە بۆ ناو لاشەکان ، حاڵی بێ باوەڕان و باوەڕداران باسکرا ، فریشتەکان دابەزین و دادگای خوایی دامەزرێندرا و لێپێچینەوە دەستی پێکرد ، چارەنووسی خەڵکان دیاریکرا ، نامەی کردەوەکان دابەشکرا ، ڕووی خەڵکانێک سپی کراو ڕووی خەڵکانێکی تریش ڕەش کرا ، تەرازوو هێنراو کردەوەکان پێوانە کرا ... هتد.

خەڵکان لە مەیدانی مەحشەرەوە دەڕۆن بەرەو پردی صراط و ئەو تاریکاییەی کە لەپێش پردەکەدایە :

پاش هەموو ئەو ڕووداوانەی ڕوویاندا کە وەجبە وەجبە خەڵکان بەناو قۆناغە جیاوازەکانی قیامەتدا تێدەپەڕن واتە وەجبەیەک سەرەی نەهاتووە بۆ لێپێچینەوەو هێشتا لەناڕەحەتی گۆڕەپانەکەدایە وەجبەیەکی تر لەبەردەم لێپێچینەوەیایە وەجبەیەکی تر لای تەرازوون بۆ پێوانەکردن ... هتد

پاش هەموو ئەم رووداوانە خەڵکان لە جێگایەکن کە تاریکاییەکی تەواو دێت بەسەریاندا لە پێش پردی سیڕات و هیچ کەسێک ناتوانێت هیچ کەسێکی تیا ببینێت، دواتر نورو ڕوناکی دابەش دەکرێت بەسەر خەڵکاندا !

باوەڕداران لەدوای سوجدە بردن بۆ خوای گەورە لەو ڕۆژەدا (وەک پێشتر باسمان کرد) پەروەردگار پێیان دەفەرمووێ سەرتان بەرزبکەنەوە ، سەریان بەرزدەکەنەوە و ڕووناکی و نوریان پێ دەدرێت .

لەو ڕۆژەدا بێ باوەڕان و (زۆرێک) لە دووڕووەکان نورو ڕوناکیان پێ نادرێت

بەڵام هەندێک لە دووڕووەکان نوریان پێ دەدرێت !؟ ئەم مونافیقانە کاتێک دەگەنە پردی سیڕات خوای گەورە نورەکەیان دەکوژێنێتەوە !

لەو ڕۆژەدا بڕواداران نوریان پێ دەدرێت بەگوێرەی کردەوەو پلەکانیان بەجۆرێک هی وایان هەیە نورەکەی (ڕوناکیەکەی) کە پێی دەدرێت وەک شاخێکی گەورە لە پێشیەوە دەڕوات ، و هی وایان هەیە نورەکەی دەدرێتێ لەوە بچوکترە و هی وایان هەیە نورەکەی پێدەدرێت وەک دارخورما بەدەستی ڕاستیەوەیەتی و هی وایان هەیە نوری پێ دەدرێت لەوە بچوکترە هەتاکو پیاو هەیە نوری پێدەدرێت لەسەر پەنجە گەورەی قاچی جارێک ڕووناک دەبێتەوەو جارێک دەکوژێتەوە ، کە ڕووناک دەبێتەوە قاچی پێش دەخات و دەڕوات و ئەگەر کوژایەوە دەوەستێت ...)

ئا لەو جێگایەدا و لەو بارودۆخە تاریک و ناهەموارەدا باوەڕداران بەنوری خۆیان پێش دەکەون وکافران و دوو ڕووەکانیش دوادەکەون و ئا لەوێدا بەربەستێک (سد) دادەنرێت

واتە لە تاریکی پێش پردی سیڕات مونافیقەکان (نورەکانیان دەکوژێتەوە) و جیادەکرێنەوە لە خاوەن باوەڕان و بەجێ دەمێنن لێیان و خاوەن باوەڕانیش پێشیان دەدەنەوە و شورایەک (بەربەستێک یاخود سەدێک) لێکیان جیادەکاتەوە و بەهۆیەوە (دووڕووەکان) ناتوانن خۆیان بگەیەننە ناو ڕیزی مسوڵمانان ، خاوەن باوەڕان کاتێک دەگەنە بەردەم ئەو شورایە دەرگاکەی دەکرێتەوە و لەو دەرگایەوە دەچنە ژوورەوە کاتێک هەموویان چوونە ژوورەوە دەرگاکە دادەخرێت، مونافیقەکانیش لە پشتی شوراکەوە لەتاریکی و ترس و سزادا دەمێننەوە ، وەک چۆن لەدنیادا لە بێ باوەڕی و نەزانین و گوماندا مابوونەوە

وە مونافیقەکان هاواردەکەن لە باوەڕداران و دەڵێن : ئایا لەگەڵتاندا نەبووین لە نوێژە جەماعەتەکاندا و لەگەڵتاندا نەدەوەستاین لە عەرەفاتدا ؟ ئامادەنەبووین لەغەزاکاندا ؟ و لەگەڵتاندا پێویستیەکانی ترمان ئەنجام نەدەدا ؟ ، خاوەن باوەڕانیش لەوەڵامی مونافیقەکاندا دەڵێن : بەڵێ ئێوە لەگەڵماندا بوون بەڵام خۆتان بەهیلاک بردوو (فەوتان) و چاوەڕێی نەمانی حەق و لایەنگرانی حەقتان دەکرد و بەگومان

بوون لە زیندووبوونەوە لەدوای مردن و ئاواتەکانتان هەڵی دەخەڵەتاندن کە دەتانوت خوا لێمان خۆش دەبێت بەم جۆرە بەردەوام بوون تاوەکو مردنتان پێگەیشت و شەیتان فریوی دان و فێڵی لێکردن و هەڵی خەڵەتاندن وە لەسەر فێڵی شەیتان بەردەوام بوون تا خوا فڕێی دانە ناو ئاگرەوە و مانای وتەی خاوەن باوەڕان بۆ مونافیقەکان ئەوەیە کە ئێوە لەگەڵماندا بوون ، بەڵام بەلاشەیەکی بێ نیەت وبێ دڵ (لاشەو نیەتی دڵیان خزمەتکردن بوو بە دوژمنانی خواو پێغەمبەران) . بەڵکو لە سەرسوڕمان وگوماندا بوون و ڕیابازیتان دەکرد لەگەڵ خەڵکان و زۆر بەکەمی یادی خواتان دەکرد .

**تێبینی** / کە دەوترێ ئەم مونافیقانە شوێن فێڵ وپلانی شەیتان کەوتبوون زۆر ئاسایی وەریگرە چونکە لەمڕۆدا بەواقعی زۆر ڕێکخراو لایەن و گروپ هەن بە ئاشکرا ئیش و خزمەت بە (لۆسفیر یاخود ئیبلیس) دەکەن و خزمەت و ڕێخۆش دەکەن بۆ هاتنی دەجال و خۆشیان دەرناخەن کە سەر بەو سیستەمەن بەڵکو وەک مسوڵمانی عەیارە ٢٤ خۆیان نیشان دەدەن ئیلا مەگەر خوای گەورە لە چەند نیشانەو تاقیکردنەوەو فیتەنێکدا ڕووی هەندێکیان دەربخات بۆ مسوڵمانان ...هتد ئیتر لە بچوکترین یەکێکیانەوە کە گێل و نەزانەو هەڵ خەڵەتاوەو جاسوسی و ڕاپۆرت دەکات لەسەر مسوڵمانێکی نوێژخوێنی لەخواترسی ناو مزگەوت تا دەگاتە گەورەترین عەبدی دەجال و ئیبلیس ... هتد

لەو ڕۆژەدا هەر کەسێک خوای گەورە نوری پێ نەدابێت ئەوا نوری نیە و بێ باوەڕو مونافیق سوود لە ڕووناکی و نووری خاوەن باوەڕان وەرناگرن وەک چۆن کوێر سوود لەڕوناکی چاوی چاوساغ وەناگرێت ، لەوێدا دوو ڕووەکان بە خاوەن باوەڕان دەڵێن لەسەرمان بوەستن تا لەسایەی ڕووناکیتاندا ئێمەش ببین ، پێیان دەوترێت : بگەڕێنەوە دواوە بەدوای نوردا بگەڕێن ، ئەوەش ئەو فێڵەیە کە خوای گەورە دەیکات لە مونافیق لەو ڕۆژەدا ، چونکە لە دنیادا (ئەوان دەیانەوێ (یاخود ویستیان) فێڵ لەخودا بکەن بەڵام فێڵیان بەسەر خۆیاندا دەشکێتەوە (شکایەوە))، ئینجا دەگەڕێنەوە بۆ ئەو جێگەیەی کە نوری تیادا دابەشکراوە و هیچیان دەستناکەوێت و دەگەڕێنەوە بۆلای خاوەن باوەڕان و لەوکاتەدا شورایەک دروست دروستکراوەو(خاوەن باوەڕان لەدەرگاکەیەوە چوونەتە ژوورەوە) لەنێوان ئەمان وئەواندا .

**تێبینی** / ئەم مونافیقانە فێڵ و پیلانیان لە مسوڵمانان دەکرد دەهاتنە مزگەوتەکان نوێژیان دەکرد و کە مسوڵمانانیان دەبینی خۆیان وەک مسوڵمان نیشان دەدا بەڵام لەئەساسدا دۆست و خۆشەویستی بێ باوەڕو مرۆڤە شەیتان ئاساکان بوون و کاریان بۆ دەکردن و عەزێت و ئازاری مسوڵمانانیان دەدا ، بەم جۆرەش لەو ڕۆژەدا خوای گەورە فێڵیان لێ دەکاتەوە و نورەکانیان دەکوژێنێتەوە و لەترس و تاریکی دا دەبن و پاشان دەخرێنە شوێنە هەرە قوڵەکانی بەندینخانەکانی جەهەنەم و ئاگرەکەیەوە

لەو کاتەدا کە نوری مونافیقەکان دەکوژێتەوە و نووریان دەست ناکەوێت و دەمێننەوە لە تاریکی و ترس دا ، ئا لەو کاتەدا خاوەن باوەڕانیش دەترسن کە نورەکانیان کز ببێت یاخود لەدەستی بدەن بۆیە داوادەکەن لەخوای گەورە و دەپاڕێنەوە کە نورەکانیان بۆ بەردەوام بکات پەروەردگاریش لەو ڕۆژەدا باوەڕداران سەرشۆڕ ناکات بەڵکو سەربەرزیان دەکات نوورو ڕووناکیان لەبەر دەست و لەلای ڕاستیشیانەوە دەڕوات و ڕێگای سەر پردی (سیراط) و ساحەی مەحشەریان بۆ ڕووناک دەکاتەوە

**تێبینی** / بەخشینی نور لەڕووی تیۆری پزیشکیەوە زۆر لۆژیکیە چونکە لەناو لەشی مرۆڤەکاندا سیستەمێکی کارەبایی بەهێز هەیە کە سەرچاوەکەی لەناو مێشکدایەو بەهۆیەوە هەرچی ئامێرو ئەندامەکانی لاشەی مرۆڤەکانە خستوویاننتە ئیش و چالاکبوون و بەردەوام بەدوو ئاڕاستە نیشانەی کارەبایی دەنێرن ، وە تەنانەت خودی دڵی مرۆڤیش بە نیشانەی کارەبایی (SAnode) ئایۆنەکانی پۆتاسیۆم و کالسیۆم و سۆدیۆم ..هتد ...ئیش دەکەن .. بۆیە خوای خالقی لاشەی مرۆڤەکان لەو ڕۆژەدا بۆ باوەڕداران نوری تەواویان پێدەبەخشێت و ڕزگاریان دەبێت لەتاریکاییەکانی پێش و پاشی پردی سیڕات .

ئایا دەتەوێ لەو ڕۆژەدا لەناو ئەو تاریکاییە سەختەی پێش پردی سیڕاتدا ببیتە خاوەنی نورو ڕووناکیەکی گەورەو بەهێز ؟ ئایا چۆن بتوانم بەدەستی بهێنم ؟ خوێنەربن :

١/ لەو ڕۆژەدا هاتووچۆکارانی مزگەوت لەتاریکاییەکاندا (نوێژی عیشاو بەیانی بەتایبەتی) نوری تەواویان پێ دەدرێت ( لەتاریکیدا بچۆ بۆ مزگەوت خوای گەورە

لەبەرامبەردا نوری تەواوت پێ دەبەخشێ لەو ڕۆژەداو لەو ساتە سەخت و تاریکیە توندەی پێش پردی سیڕات و سەر پردی سیڕات چونکە ڕوناکیت پێ نەبێ سەختە بتوانی بەسەر پردەکەدا تێپەڕیت و ڕزگارت بێت الا من رحم ربي

٢/لەو ڕۆژەدا کەسانێک هەن خوای گەورە تاڵە مووە سپیەکانیانی بۆکردووە بە نورو ڕوناکی چونکە ئەمانە موویان سپی کردووە لە ئیسلامەتی و خزمەتکردن بەدینی خوای گەورەدا (بەهۆی هەر تاڵێک لەم مووە سپیانە چاکەیەکی بۆ دەنوسرێت و خراپەیەکی بۆلادەبرێت و پلەیەک بەرزدەکرێتەوە ) ئینجا هەرتاڵێکیشی بۆ دەکرێت بەنورو ڕوناکی لەو ڕۆژەدا ،

بەڵام کەسانێک هەن لەدنیادا تاڵە مووە سپیەکانیان دەردەهێنن ئەمانە بەو کارەیان ڕووناکیەکەی خۆیان ناهێڵن .

٣/ پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەفەرمووێت (هەرکەسێک تیرێک بهاوێژێت لەپێناوی خوادا دەبێت بەنوور بۆی لە ڕۆژی قیامەتدا )

٤/ لەو ڕۆژەدا کەسانێک هەن وشەیەکیان وتووە لەکاتی سەرەمەرگ و مردنیاندا کە بووە بە نور بۆ نامەی کردەوەکانیان و نور بۆ جەستەو ڕۆحیان و حەوانەوەیان لەکاتی مردنیاندا ، ڕوخساریانی پێ ڕوناک کردۆتەوە و خوای گەورە بەهۆیەوە ناڕەحەتی لەسەریان لابردووە ئەویش بریتیە لە وتنی ( لا اله الا الله لەکاتی سەرەمەرگدا )

**تێبینی** / وتنی ئەو لا اله الا الله یە ئەوەندە ئاسان نیە لەکاتی سەرەمەرگدا ئیلا مەگەر خوای گەورە خۆی ئاسانی بکات بۆ کەسانێک کە خۆی بیەوێ، هەروەها بۆ کەسێک کە باوەڕدارێکی بەحەق یەک خوا پەرست (موەحید) بووبێت بەدڵسۆزی و ڕاستگۆیی .

٥/ هەرکەسێک لەدوای هەموو نوێژێک و پێش خەوتن سێ جار بڵێت: ( اللهُ أَكْبَرُ كَبِيرًا , عَدَدَ الشَّفْعِ وَالْوِتْرِ , وَكَلِمَاتِ اللهِ التَّامَّاتِ , الطَّيِّبَاتِ الْمُبَارَكَاتِ ، وَلا إِلَهَ إِلاَّ اللهُ ) ئەوا ئەو کارە دەبێتە نور بۆی لەناو گۆڕەکەی و دەبێتە نور بۆ سەر پردی سیڕات تا دەگاتە ناو بەهەشت

٦/ هەرکەسێک ئاگاداری (نوێژە فەرزەکانی) بووبێت و (بەڕێک و پێکی و لەکاتی خۆیدا ئەنجامیدابن) ئەو کارەی دەبێتە نورو ڕوناکی و بەڵگە و ڕزگاربوون بۆی لەو ڕۆژەدا

٧/ لەو ڕۆژەدا کەسانێک هەن نورو ڕوناکیان پێ دەبەخشرێت چونکە ئەمانە لەدنیایاندا زۆر داوایان لەخوای گەورە کردووە کە نوریان پێ ببەخشێت بەتایبەتی لەکاتی شەونوێژ وچوون بۆ نوێژی بەیانی

پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەیفەرموو ( خوای گەورە نور بکەرە دڵمەوە، وە بیکەرە زمانمەوە و نوور بکەرە ناو گوێمەوە ، نوور بکەرە ناو چاومەوە ، نوور بکەرە لای سەرمەوە ، نوور بکەرە لای خوارمەوە ، نوور بکەرە لای ڕاستمەوە ، نوور بکەرە لای چەپمەوە ، نوور بکەرە لای پێشمەوە و نوور بکەرە لای پاشمەوە ، نوور بکەرە ناو نەفسمەوە ، نوورم بۆ گەورە بکە ، نوورم بۆ دابنێ و بمکە بەنوور ، خوایە نوورم پێ ببەخشە ، وە نوور بکەرە ناو دەمارەکانمەوە و بیکەرە ناو گۆشتمەوە و بیکەرە ناو خوێنمەوە بیکەرە ناو پێست و مووەکانمەوە )

٨/ لەو ڕۆژەدا کەسانێک هەن نوریان پێدراوە کە بەم شێوەیەیە ( هەر کەسێک سورەتی (الکهف) بخوێنێتەوە وەک چۆن هاتۆتە خوارەوە نورێکی پێدەدرێت لە ڕۆژی کۆتاییدا لەجێگەکەیەوە بۆ مەککە ....)

٩/ لەو ڕۆژەدا بەردە وردەکانی ڕەجمکردنی شەیتان دەبێتە نور بۆ خاوەنەکانیان .

لێرەدا هاتینە کۆتایی باسەکانی دوای تەرازووکردن و تاریکاییەکانی پێش پردی سیراط و جیاکردنەوەی خاوەن باوەڕان لە بێ باوەڕە دووڕووەکان و فڕێدانیان بۆناو دۆزەخ .

## گۆڕانی گەورەی دووەمی ئاسمانەکان و زەوییەکان !

لەم کاتەدا دوای دەرچوونی خاوەن باوەڕان لەتاریکیەکەدا و بەڕێکەوتنیان بەرەو پردی سیڕات سەرەتاکانیان دەگاتە سەر پردەکەو کۆتاییەکانیشیان لەتاریکیەکەوە بەڕێکەوتوون بەرەو پردی سیڕات ئا لەوکاتەدا ئاسمانەکان و زەوییەکان دەگۆڕێن

دەتوانرێت بوترێت کە سەرەتای گۆڕینی ئاسمانەکان و زەوی لەکاتێکدا دەست پێدەکات کە خەڵکان لەتاریکیەکەوە بەرەو پردەکە کەوتوونەتە ڕێ ، و کۆتایی گۆڕینی ئاسمانەکان و زەوی لەکاتی گەیشتنی سەرجەم خەڵکان بۆ سەر پردی سیڕات وپەڕینەوەیان لەسەری دەبێت یان پێدەچێت دوو گۆڕانکاری هەبێت (یەکەمیان کاتێک خەڵکان کە لەتاریکیەکەدان) ، ( دووەمیان کاتێک خەڵکان لەسەر پردی سیڕات دەبن) .

تەنها خوای گەورە دەزانێت کە ئەو گۆڕانکارییە چۆنە ، وە لەو ڕۆژەدا پەروەردگار ئاسمان دەپێچێتەوە وەک چۆن پەڕە نوسراوەکانی ناو خۆی دەپێچێتەوە . خوای گەورە زەوی دەگرێت لە ڕۆژی کۆتاییدا و ئاسمانەکان دەپێچێتەوە بەدەستی ڕاستی

تێبینی/ (دەستگرتنێک کە شایستە بێت بەزاتی گەورەیی خۆی چونکە ئێمە چۆنیەتەکەی نازانین و باوەڕمان پێی هەیە ، هەروەها ئێمە لە جیهانێک و دنیایەکی ماددیدا دەژین ناتوانین ئەمڕۆمان کە هەمووی ماددەیە بشوبهێنین بە جیهانەکانی تری وەک بەرزەخ و ڕۆژی کۆتایی (جیهانی قیامەت) و جیهانەکانی بەهەشت و دۆزەخ ، ئیلا ئەوەندە نەبێت دەتوانین باسی بکەین بەوشێوەیەی کە هەواڵمان پێدراوە لە وتەو کەلام و کیتابەکانی پەروەردگار خۆی وەک (قورئانی پیرۆز) و وتەو فەرموودەکانی نێردراوەکەی (محمد) (ﷺ) .

## ئایا پردی سیڕات لە دەمی شمشێر تیژترە ؟ بەڵێ چۆن ؟

**زۆر بەزانستی و لۆژیکی :**

خوێنەربن :

باسەکەمان گەیشتە ئەو شوێنەی کە خەڵکان لەسەر پردی سیڕاتن و لە تاریکاییە سەختەکەی پێش پردەکە تێپەربوون

پردی سیڕات / ئەو پردەیە کە دادەنرێت لەسەر دۆزەخ و هەموو کەسێک دەبێت بەسەریدا بڕوات و لەوێشەوە خوای گەورە باوەڕداران ڕزگار دەکات و ستەمکاران و دووڕووەکان بەردەدرێنەوە خوارەوە بۆناو دۆزەخ

پردی سیڕات کەی دادەنرێت ؟ پردی سیڕات داندراوە لەسەر دۆزەخ و لەکاتێکدا کە خەڵکان مەحشەر جێ دەهێڵن و بەرەو دۆزەخ دەڕۆن ئا لەوکاتەدا پردی سیڕات دەهێنرێت و دادەنرێت لەسەر ئەملاو ئەولای دۆزەخ لەسەری .

پردی سیڕات پردێکی زۆر باریک و زۆر تیژە و خەڵکان بەگوێرەی کردەوەکانی خۆیان دەتوانن بەسەریدا تێپەڕبن ، ئەم پردە باریکە وەک تیژی شمشێر ، بەهۆی باریکی و تیژیەوە فریشتەکان سەریان سوڕدەمێنێت و دەڵێن کێ دەتوانێت بەسەریدا بڕوات ؟ خوای گەورە دەفەرمووێت : ئەوانەی کە خۆم دەمەوێت لە دروستکراوەکانمدا ، مەلائیکەتەکانیش دەفەرموون : پاکی شایەنی تۆیە : نەمان پەرستوویت بەپەرستنێکی تەواو و شایستە بەتۆ

**تێبینی** / دیمەنی پێشکەوتووی ئەو جیهانەو ئەو ڕۆژە زۆر جیاوازە لە جیهانی ماددی دنیای ئەمڕۆمان کە خۆمانی تیادا دەژین ، ئەوێ جیهانێکە کە پەروەردگارو فریشتەکان تیایدا دادەبەزن بۆ ناوی ، ئینجا بیهێنە پێش چاوی خۆت جیهانێک بەدیهێنەری هەموو ئاسمانەکان و زەوی زیندەوەران خۆی بەزاتی گەورەی خۆی دابەزێت بۆناوی دەبێت چۆن جیهانێک بێت لەڕووی پێشکەوتوویی و تەکنەلۆژیای ئیلاهیەوە ، بۆیە زۆر لەلات ئاسایی بێت کە پردی سیڕات هێندە باریک بێت و

وەک دەمی موس تیژ بێت .( ئەبێ چ سیستەمێکی پێشکەوتووی تیادا دامەزرابێت لە بەدیهێنانیدا !!؟)

(پێ دەچێت ئەو پردە سیستەمێکی پێشکەوتووی وای تیا بەدیهێنرابێت کە باریک ببێتەوەو تیژ ببێتەوە تا وەک دەمی موس یان شمشێری لێدێت بۆ بێ باوەڕان و دووڕووەکان ، وە فراوان بێتەوە بەڕەحمی پەروەردگار بۆ خاوەن باوەڕان و ئەوانەی کە خۆی دەیەوێ ڕزگاریان بکات ) والله اعلم .

پەروەردگار بتوانێت لەناو خانەکان و ئەندامەکانی لەشی مرۆڤەکان و گیانەوەراندا (بواری هیستۆلۆجی) لەڕووی پزیشکیەوە هەزاران جۆر پردی ئەلیکترۆنی و ئایۆنی و کیمیایی و کارەبایی ...هتد دروست بکات و بەدی بهێنێت بەجۆرێک ئەم پردو گەیتانە بەبێ وەستان کاربکەن و هەزاران جۆر پرۆتین و ئەنزیم و هۆرۆمۆن هاتووچۆی تیابکەن و بەسەریدا تێ بپەڕن ئەوا زۆر ئاسانەو ئاساییە کە پەروەردگار پردێکی پێشکەوتووی ئەو جیهانە دروست بکات بەجۆرێک زانیاری دەربارەی گشت بوونەوەران تیایدا تۆمارکرابێت و تەنها ئەوانە بگرێت کە فەرمانی پێکراوە !

بیهێنە پێش چاوی خۆت لەم دنیایەدا خوای گەورە زانیاری ئەخاتە دڵ و مێشکی مرۆڤێکی (ئەندازیارو میکانیک) ی کە بتوانێت پردێکی پێشکەوتووی کارەبایی و ئەلکترۆنی دروست بکات بەهۆیەوە ئۆتۆمبێل و شەمەندەفەر بتوانن بەسەریدا بڕۆن ، ئیتر زۆر ئاساییە پەروەردگاری خالقی هەموو (مرۆڤەکان وجیهانە پێشکەوتووەکەیان) پردێکی پێشکەوتووی وەک سیڕات دروست بکات کە بتوانرێت باریک و تیژبێتەوە وەک موس و فراوان بێتەوە بەویست و فەرمانی خۆی جل جلالە والله تعالی اعلم

پردی سیڕات پردێکی خلیسکە و خەڵکان خۆیان ناگرن لەسەری و چەندین ئامێری پێشکەوتووی قولاپی هەیە کە خەڵکان دەگرێت و فڕێیان دەداتە ناو دۆزەخەوە بەپێی کارەکانیان (بەگوێرەی ئەو زانیاریانەی تیایدا تۆمارکراوە واتە فەرمانی پێکراوە ) ئەم ئامێرانە دڕکاوی و زبرن !

**تێبینی** / ئەو پردە هێندە پێشکەوتووە و تایبەتە بە دیمەنە پێشکەوتووییەکانی ئەو ڕۆژە ، ئەو قولاپانەی کە هەیەتی (ئامێرێکی ئاگرینن) و لەشێوەی دڕکدان،

وە کەسیش ئەندازەیی و گەورەیی (پێشکەوتوویی) ئەو قولاپانە نازانێت تەنها خوای گەورە نەبێت ، ئەم ئامێری قولاپانە چەند (ئامێرە) دڕکێکی پان و تیژیان لەسەرەو دڕکەکانی چەماونەتەوە و خەڵکان دەگرێت و فڕێیان دەدات بەگوێرەی کردەوەکانیان و ئەوانەش دەگرێت کە فەرمانی پێکراوە بیگرێت (بەزمانی ئەمڕۆ کە سەرجەم وزەو زانیاریەکانی گوناهباران ودووڕوان وبێباوەڕانی تیا تۆمارکراوە )

واتە تەنها ئەوانە دەگرێت کە پێشتر زانیاریان تۆمارکراوەو بێدین و دووڕوو مونافیق بوون ، ئەو قولاپانە خەڵکان بەگوێرەی کارەکانیان دەگرێت و دەیان خاتە خوارەوە (هەروەک بڵێی ئەم پردە پردێکی کۆمپیوتەری و ڕۆبۆتی زۆر پێشکەوتوو بێت و زانیاری گشت کافرو بێدینانی تیادا تۆمارکرابێت و کاتێک دێنە سەر پردەکە دەستنیشانیان بکات وفڕێیان بداتە خوارەوە )

یان مسوڵمانی ئێجگار تاوانبارو گوناە گەورە هەن دەیانگرێت کە تا ئەم ساتەش بەهۆی گەورەیی تاوانەکانیانەوە پاک نەبوونەتەوە بەتەواوی بەڵکو پێویستی بە ماوەیەک مانەوە هەیە لەناو دۆزەخدا تا بەتەواوی پاک دەبێتەوە

ئەبێ ئەو نیزام و سیستەمەی ئەوێ چەند پێشکەوتوو بێت کە ئاوا بەوردەکاری هەرکەسێک دەگەیەنێت بەسەرەنجامی کارو کردەوەکانی ، بەبێ ئەوەی هێندەی گەردێک زوڵم لە یەک کەس بکرێت !!!

ئەم پردە ستەمکاران و بێ باوەڕان ناتوانن بەسەریدا بپەڕنەوە و قولاپەکانی (ئامێرە تایبەتیەکانی) دەیانگرێت وفڕێیان دەداتە ناو دۆزەخەوە ، مسوڵمانانیش بەگوێرەی کردەوەکانیان بەسەریدا دەپەڕنەوە کە هی وایان هەیە خێرایەو ، هی وایان هەیە هێواشە ، و هی وایان هەیە بەسەلامەتی دەپەڕێتەوە ، هی وایان هەیە بەبریندارى دەپەڕێتەوە

تێپەڕبوونی خەڵکان بەسەر پردی سیڕاتدا بەگوێرەی ئەو نوورو ڕوناکیە دەبێت کە لە پێش تاریکاییەکە پێیان دەدرێت وە هەروەها بەگوێرەی کردەوەکانیان، بەشێکیان ڕزگاریان دەبێت وبەشێکی تریان دەکەونە خوارەوە

لەو ڕۆژەدا باوەڕدار هەیە دەپەڕێتەوە بەسەریدا وەک چاوتروکانێک ، هەیە وەک بریسکەی هەور ، هەیە وەکو بای بەهێز ، هەیە وەک ئەستێرە ، هەیە وەک

ڕۆیشتنی باڵندە ، هەیە وەک خێرایی هەور ، هەیە وەک خێرایی ڕاکردنی ئەسپ و وشتری چالاک و هی وایان هەیە تێدەپەڕێت وەک ڕاکردنی پیاو ، هی وایان هەیە بەخێرا دەڕوات و هی وایان هەیە بەڕۆیشتن دەڕوات و هی وایان هەیە بەگاڵگۆڵکێ دەڕوات و هی وایان هەیە لەسەر سنگ دەخشێت ، ..... هەتا کۆتاییەکەیان دەپەڕێتەوە بەسەریدا خۆی ڕادەکێشێت بەچۆن ڕاکێشانێک ... وە هی وایان هەیە بەسەلامەتی ڕزگاری بووە ، هی وایان هەیە بەبرینداری ڕزگاری بووە ، هی وا هەیە کەڵەکە بووە لەناو ئاگری دۆزەخ و .... هی وایان هەیە تیادەچێت و هی وایان هەیە پارچە پارچە دەبێت و دەکەوێتە خوارەوە .... هەتا کۆتاییەکەیان ئەوە دەبێت کە نورەکەی (ڕوناکیەکەی پێیدراوە) لەسەر پەنجە گەورەکەی قاچی دەبێت بەدەم و دەست و قاچدا دەکەوێت و (ڕادەکێشرێت چۆن ڕاکێشانێک) و قاچێکی بەردەبێتەوە و قاچێکی تری پێوە دەبێت و ئەملاو ئەولای ئاگری بەردەکەوێت و بەردەوام دەبێت هەتا ڕزگاری دەبێت ، کە ڕزگاری بوو دەوەستێت لەسەری ئینجا دەڵێت : سوپاس بۆ خوا بەڕاستی ئەوەی خوا بەمنی بەخشیوە بەهیچ کەسێکی نەبەخشیوە کە ڕزگاری کردم لێی دوای ئەوەی کەبینیم .

سەر ئەو پردە هێندە سەخت و ناڕەحەت و ترسناکە کاتێک باوەڕداران ڕزگاریان دەبێت دەڵێن سوپاس بۆ ئەو خوایەی کە ئێمەی ڕزگار کرد لەدوای ئەوەی کە تۆمان بینی (واتە پردەکەیان بینی) ، خوای گەورە ئەوەی بەئێمەی بەخشیوە (بەخشینی ڕزگاربوون لەو پردە) بەهیچ کەسێکی تری نەبەخشیوە .

بەم شێوەیە باوەڕداران خوای گەورە ڕزگاریان دەکات لەپەڕینەوەی پردی سیڕات وتووشی هیچ زیانێک نابن .

ئایا ئەوانە کێن سەرەتا دەپەڕێنەوە ؟ چۆن دەپەڕێنەوە ؟ چیان کردووە کە توانیویانە بەئاسانی بپەڕێنەوە ؟

**تێبینی** / لەبەشەکانی پێشودا باسکرا کە خوای گەورە فەرمان بەخەڵکان دەکات هەر کەسێک دوای پەرستراوی خۆی بکەوێت کە پەرستوویەتی لەژیانی دونیادا و لەوێدا هەموو کەسێک دوای پەرستراوی خۆی دەکەوێت و تەنها باوەڕداران دەمێننەوە کە خوای گەورەیان بەتاک و تەنها پەرستووە و موەحید بوون و (مەیل وخۆشەویستی ولایەنگیریان بۆ هیچ گروپ ولایەن و ڕێچکەو ڕێگەو بەرنامەو

کەسایەتی و فکرو دینێکی تر نەبووە جگە لە خوای گەورەو ئیسلامەکەی) ئەمانە چاوەڕوانی پەروەردگار دەکەن و دێت بۆلایان پاشان بۆ پردی سیڕات و دواتر بۆ بەهەشت

وەک باسکرا لەبەشەکانی پێشوودا ( خوای گەورە دێت بۆلایان بەوشێوەیەی کە ئەوان دەیناسنەوە و دەفەرموویت : ( من خواتانم ، بڕۆن ) ئەوانیش دەڵێن : ( تۆ خوای ئێمەی ، بەدوایدا دەڕۆن ) ، لە ڕیوایەتێکی تردا هاتووە (خوای باڵادەست لە پێشیانەوەیە تاکو بەناو دۆزەخدا تێدەپەڕن )

یەکەم کەس کە تێدەپەڕێت بەسەر پردی سیڕاتدا پێغەمبەری خۆشەویستمانە (ﷺ) بەخۆی و ئومەتەکەیەوە ئینجا پێغەمبەرانی تر علیهم سلام، لەنێوان ئومەتی پێغەمبەردا (ﷺ) یەکەم کەس کە دوای پێغەمبەر دەپەڕێتەوە بەسەر پردی سیڕاتدا کۆچکارە هەژارەکانی هاوەڵانی پێغەمبەری خوان (ﷺ)

لەو ڕۆژەدا بانگکارێک بانگ دەکات : ئەحمەد و ئومەتەکەی لەکوێن ؟ ئینجا پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەڕوات بەسەریدا و ئومەتەکەیشی بەدوایدا دەڕوات و لەوێدا خوای گەورە چاوی دوژمنەکانی و خراپکارانی ئومەتەکەی کوێر دەکات و بەلای ڕاست و چەپدا لە پردەکەوە دەکەونە خوارەوە ، پێغەمبەر (ﷺ) لەگەڵ چاکەکارانی ئومەتەکەی بەسەریدا دەپەڕنەوە ، و دواتریش سەرجەم پێغەمبەران (علیهم سلام) و ئومەتەکانیان بەسەریدا دەپەڕنەوە و کۆتا هەمینیشیان پێغەمبەر نوح (علیه سلام) دەبێت .

لەو ڕۆژەدا خەڵکان نوریان (ڕوناکیان) پێدەدرێت بەگوێرەی کردەوەکانیان و پاشان تێدەپەڕن بەسەر پردەکەدا بەئەندازەی نورەکانیان ، بەشێکیان ڕزگاریان دەبێت و بەشێکی تریان دەکەونە خوارەوە

لەو ڕۆژەدا بەهۆی ناخۆشی و نارەحەتی پەڕینەوەی مسوڵمانان بەسەر پردی سیڕاتدا خوای گەورە مۆڵەت دەدات و ڕێگەدەدات بەپێغەمبەری خوا (ﷺ) و مەلائیکەتەکان و پێغەمبەران (علیهم سلام) و مسوڵمانان بە تکا کردن ، بەمەش پێغەمبەری خوا (ﷺ) ڕێی پێدەدرێت وە ئەمانەت و ڕەحمی لەگەڵدا دەنێردرێت بۆ ئەملاو ئەولای سیڕات (چەپ و ڕاستی پردەکە) بەمەش لای چەپ و ڕاستی پردەکە دەوەستن

پێغەمبەران (علیهم سلام) ئەو ڕۆژە لە هەردوو لای پردەکەوە وەستاون و ئەو ڕۆژە هیچ کەس قسەناکات تەنها پێغەمبەران نەبێت و دەپاڕێنەوەو دەفەرموون خوایە سەلامەتیان بکە خوایە سەلامەتیان بکە

هەروەها بەلای ڕاست و چەپی سیڕاتدا فریشتە هەیە قولاپیان پێیە دەڵێن : خوایە سەلامەتیان بکە خوایە سەلامەتیان بکە

پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەوەستێت لەسەر پردەکە و تکا دەکات بۆ مسوڵمانان بۆئەوەی بەسەلامەتی بەسەریدا بپەڕنەوە و دەفەرمووێت پەروەردگارم بیانپارێزە بیانپارێزە (واتە : سەلامەتیانکە سەلامەتیانکە ..)

هەروەها پاڕانەوەی مسوڵمانانیش کە کاتێک تێ دەپەڕن بەسەر پردی سیڕاتدا ئەوەیە دەڵێن : (خوایە سەلامەتمان بکە خوایە سەلامەتمان بکە )

لەو ڕۆژەدا ( پردی سیڕات دادەنرێت و تێدەپەڕن بەسەریدا وەک خێرایی ئەسپی چاک و وشتری چاک و قسەشیان لەسەری ، سەلامەتمان کە سەلامەتمان کە)

**تێبینی** / باوەڕو کردەوەی چاک لە دونیادا ئەو ڕێگە ڕاستەیە کە خوای گەورە فەرمانی بە بەندەکانی کردووە بەسەریدا بڕۆن و بەردەوام بن و لانەدەن و وە داوای ڕێنوێنی زیاتر بکەن بۆ ڕۆیشتن بەسەر ڕێگە ڕاستەکەی ئیسلامدا ، وە هەر کەسێک لە دونیادا ڕۆیشتنی بەسەر ئەو ڕێگە ڕاستەدا ڕێک بوو لە ناوەڕۆک و ئاشکرادا ئەو کەسە لە قیامەتدا ڕۆیشتنی ڕێک و بێ کێشە دەبێت بەسەر پردی سیڕاتدا کە لەسەر دۆزەخە ، وە هەر کەسێک لە دونیادا ڕێک نەڕۆیشت بێت لەسەر ڕێگەی ڕاست و لای دابێت بۆ هەڵدێرەکانی ئارەزوو گومان ، ئەو کەسە قولاپەکانی دۆزەخ لای دەدەن لەسەر پردەکەو هەڵی دەدەنە دۆزەخەوە بەهۆی کردەوەکانیانەوە

لەو ڕۆژەدا کەسانێک هەن کە قاچیان جێگر و ڕاگیر دەکرێت لەسەر پردەکە چونکە ئەمانە ( ... هەر کەسێک بۆ پێویستی برایەکی مسوڵمانی بڕوات تا بۆی جێگیر بکات خوای گەورە قاچی ڕاگیر دەکات (لەسەر پردەکە) لەو ڕۆژەدا کە قاچەکان هەڵدەخلیسکێن ...)

لەو ڕۆژەدا کەسانێک دەهێنرێن و بەند دەکرێن لەسەر پردی دۆزەخ چونکە ( هەرکەسێک توانجێک بگرێتە مسوڵمانێک و تاوانباری بکات بە شتێک تا لەکەداری بکات و ناوی بزڕێنێت خوای گەورە بەندی دەکات لەسەر پردی دۆزەخ هەتا بەڵگە دێنێت لەسەر ئەو وتەیەی (بوهتانەی) کە وتوویەتی .

ئینجا تۆ لە ئێستاوە خۆت ئامادە بکە کە قسەیەک یان بوهتانێک یان تۆمەتت بۆ کەسێک کردووە و هەڵبەستووە لەئێستاوە خۆت ئامادە بکە کە لەسەر ئەو پردە ڕادەگیرێی هەتا بەڵگە دێنیت بۆ تۆمەتەکەت ، پاشان ئایا بەڵگەت چۆن پێ دێت ؟ لەکاتێکا خۆت ڕووت و بێ جل و بەرگ و پۆشاکیت !!!؟ بۆیە لەخوا بترسن زمانتان بپارێزن لە غەیبەت و تۆمەت و بوهتان و لەکەدارکردنی خوشک و برایانی مسوڵمانانتان و وە خەڵکان بەگشتی ، بۆیە تەوبە بکەن و واز لە خووە پیسە بێنن و لەئێستاوە گەردنی خۆتان بە هەمووکەس ئازادبکەن .

پردی دووەم : پردی قەنتەڕە (قنطرة) پردەکەی دوای پردی سیڕات !

مسوڵمانان کە دەپەڕێنەوە لەسەر پردی سیڕات دەگەنە پردێکی تر پێی دەوترێت (قەنتەڕە) و لەم پردەدا کەس ناکەوێتە خوارەوە و لەنێوان بەهەشت و دۆزەخدایە، ئەم پردە بەشێکی تری پردی سیڕاتە کە لەلای بەهەشتدایە

کاتێک خاوەن باوەڕان ڕزگاریان دەبێت لە ئاگرەکە ئینجا ڕادەوەستێنرێن لەسەر قەنتەڕەکەی نێوان بەهەشت و دۆزەخ لەوێدا تۆڵە لە هەندێکیان دەسەندرێت بۆ هەندێکیان لەو ستەمانەی کە لەنێوانیاندا بووە لە دونیادا هەتا بەتەواوەتی پاک دەکرێنەوە ، ئینجا ڕێگەیان پێدەدرێت بۆ چوونە ناو بەهەشت

لەم قەنتەڕەیەدا تۆڵە سەندنەوە بەکارە چاکەکان دەبێت کە لەدونیادا کراوە پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەفەرمووێت ( هەر کەسێک ستەمێکی لایە کە کردوویەتی بەرامبەر براکەی لەبواری کەسایەتی و ساماندا با ئەمڕۆ بیداتەوە و گەردنی خۆی پێ ئازاد بکات پێش ئەوەی دینارو درهەم نەمێنێت ، ئەگەر کارێکی چاکەی هەبێت لێی وەردەگیرێت بەئەندازەی ستەمەکەی کە کردوویەتی و ئەگەر چاکەکانی نەما خراپەکانی بەرامبەرەکەی هەڵدەگیرێت ودەخرێتە سەری ).

ئەم تۆڵە سەندنەوەیە قەرزاریش دەگرێتەوە كە قەرزەكەی نەدابێتەوە بەخاوەنەكەی لە دنیادا ( ... هەركەسێک بمرێت و قەرزی لەسەر بێت لەوێ دینار نیەو درهەمیش نیە ، بەڵكو دانەوەی لەوێ بە چاكەكان و خراپەكانە ) .

لەو ڕۆژەدا ئا لەو جێگەیەدا (لەسەر قەنتەڕە) خوای گەورە ڕق و كینەو بوغز وحەسوودی بردن و دووبەرەكی لەسنگی باوەڕداراندا دەردەهێنێت و هەموو وەک برایان لێ دێت بۆئەوەی باش ئامادەبن بۆ چوونە ناو بەهەشت

بۆیە لەو ڕۆژەداو لەو جێگەیەدا باوەڕدار ناچێتە ناو بەهەشتەوە تا خوای گەورە چی ڕق و كینەیەک لە سنگیدا هەیە دەری نەهێنێت كە وەک ئاژەڵێكی دڕندە وایە

ڕەحمەتی خواتان لێبێ ئاگاداری كارو كردەوەو مەیل و خۆشەویستی و وتەكانتان بن تا لە دوو پردەكەی سەر دۆزەخ ڕزگارتان بێت و بچنە بەهەشتەوە

## گەشتەکەی باوەڕداران دوای پردی قەنتەڕە !

خەڵکان هەر لەدنیادا زۆر ماندووبوون بە چەند قۆناغێکی سەخت و دژواردا تێپەڕین هەر لە ڕۆژی لەدایک بوونیانەوە و بەناو سێ قۆناغی منالّی و گەنجی و پیری و سەختیەکانی ژیان و نەخۆشی و نەهامەتی و نەبوونی و کێشەو مەشاکیلەکانی ژیانی دنیاو بژێوی و خوێندن و هەوڵدان بۆی و تیایدا گوزەران ...هتد

دواتر خەڵکان نەقڵ بوون و گوێزرانەوە لە دنیاوە بۆ جیهانی بەرزەخ و ناڕەحەتیەکانی ناو ئەو جیهانە ( لە کتێبی جیهانی بەرزەخ چۆنێتی ئەو جیهانە باسکراوە )

دواتر خەڵکان زیندوو بوونەوەو ڕۆح گەڕێندرایەوە بۆ ناو لاشەکانیان و هەستانەوە لە گۆڕەپانی مەحشەردا و سەختی و ناڕەحەتیەکانی ئەو ڕۆژەو ڕاوەستانی زۆرو هەروەها سزاو ناڕەحەتی زۆری ئەو ساحەیە و برسێتی و تینوێتی و گەرمای ئەو ڕۆژەو هەروەها لێپێچینەوەو لێپرسینەوەو پێدانی نامەی کردەوەکان و ڕۆیشتن بۆ ناوچەو جێگە تاریکاییەکان پاشان بۆ سەر پردی سیڕات و تێپەڕبوون بەسەر ئەو پردە سەخت و ناڕەحەتەداو زۆر نارەحەتی تر ...هتد

بیهێنە پێش چاوی خۆت تۆ لە سێ جیهاندا (دنیا ، بەرزەخ ، قیامەت) ڕووبەڕووی هەموو ئەم ڕووداوانە بوویتەتەوە ، لەکۆتایی هەموو ئەم قۆناغانەدا خوا ڕەحمی پێکردیت و ڕزگارت بوو لە دۆزەخ ، ئیتر کاتی ئەوەیە بەیەکجاری کۆتایی بە ناڕەحەتی بێت و ژیانی ڕاستەقینەو هەتا هەتایی دەست پێ بکات ، ئیتر کاتی ئەوەیە بەس لە خۆشیدا بژیت ، چونکە تۆ تامی هەموو ناڕەحەتی و سەختیەکانی ژیانی دنیات کرد لە پێناوی تەنها خواپەرستی و دینی خوای گەورەدا ، بۆیە مادام تۆ مسوڵمانیت و موەحیدیت خوای گەورەت بەتەنها پەرستووەو هیچ شەریک وهاوتایەکت بۆ بڕیارنەداوەو لەگەڵ پەروەررگاردا داوات لەکەسی تر نەکردووەو لەغەیری بەرنامەو دینەکەی ئەو شوێن هیچ ڕێچکەو بەرنامەو فکرو دینێکی ترو

بەرنامەی دەستکردی مرۆڤەکان نەکەوتوویت و خۆشەویستی و مەیلت بۆ زاڵم و ستەمکاران نەبووەو سەرخەرو شوێنکەوتەیان نەبوویت تەنها لەسەر ڕاستە ڕێیەکەی ئیسلام بوویت لەکۆتاییدا پەروەرێن مژدەی ژیانە هەتا هەتاییەکەی ناو بەهەشتت پێ دەدات و پێت دەبەخشێ و دەچیتە ناو بەهەشتانێکەوە کە هێندەی نیعمەت تیایە نە چاوەکان بینیویانە نە گوێیەکان بیستوویانە نە دڵەکانیش ئەتوانن وێنای بکەن هێندە خۆشن ئەو بەهەشتانە شوێنی ئارامی و ئاسودەیی هەتا هەتایین

ئیتر لێرەوە بۆتان باس دەکەم چۆن خەڵکان بەڕێ دەکەون بەرەو ئەو بەهەشتە لەدوای پردی سیڕات و پردی قەنتەڕەوە

خەڵکان لەسەر پردی قەنتەڕە بەکردەوە چاکەکانیان تۆڵەیان بۆ لەیەکتر دەسێندرێتەوە بەجۆرێک هەرچی ڕق و کینەو حەسودی و زبری هەیە لە دڵەکانیاندا دەردەکرێت و ئیتر لەوێدا مرۆڤێک نابینی هێندەی گەردێک ڕقێک یان کینەیەک لەدڵیدا بمێنێ بەرامبەر برایەکی یان خوشکێکی مسوڵمانی دڵیان پاک پاک دەکرێتەوە بەتەواوەتی ، چونکە ئەوانەی دەچنە بەهەشتەوە دەبێ پاک بن و هیچ خەوش و گەردێک نەمێنێ لە ناخ و دەروون و دڵیاندا .

## گەشتی خەڵکان بۆ سەر کانیاوەکانی پێش دەرگاکانی بەهەشت !

پێش گەیشتن بەبەهەشت چەند حەوزێک هەیە کە هەریەکەیان تایبەتە بە پێغەمبەرێک واتە هەموو پێغەمبەران حەوزی تایبەت بەخۆیان هەیەو بانگی شوێنکەوتووانی خۆیان دەکەن تا بێن لێی بخۆنەوەو کۆتایی بەتینویەتی و برسێتیەکەیان بێت بۆ هەتا هەتایە کە بەهۆی نارەحەتی مەحشەرەوە توشیان بووە

لەو ڕۆژەداو لەو ساتەدا خوای گەورە ڕێز دەبەخشێت بەپێغەمبەران (علیهم سلام) بەوەی کە بە هەموو پێغەمبەرێک حەوزێک دەبەخشێت لەبەردەم بەهەشتدا تاکو ئومەتی ئەو پێغەمبەرە لێی بخواتەوە و بەتایبەت لەنێوانیاندا پێغەمبەری خۆمان (ﷺ) کە خوای گەورە ڕێزی لەوانی تر زیاتر پێ دەبەخشێت بەوەی حەوزی کەوثەری تایبەتی پێ دەبەخشێت

حەوزی کەوثەر لەدوای پردی سیراتەوەیەو لەپێش چوونە ناو بەهەشتە یاخود لە تەنیشت بەهەشتدایەو لە ڕووباری کەوثەری بەهەشتەوە ئاوەکەی دەڕژێتە ناو حەوزەکە

ئەم حەوزە زۆر گەورەیە و جێگەیەکی زۆر بەڕێزەو لە ڕووباری کەوثەری بەهەشتەوە ئاوی بۆ دێتە ناوی و حەوزێکی زۆر فراوانەو درێژی و پانیەکەی وەک یەکە ، ئەوەش خەڵاتێکی هەرە گەورەو بەڕێزە کە بەخشیویەتی بە پێغەمبەری خوا (ﷺ)

پێغەمبەری خوا (ﷺ) باسی درێژی و پانی (ڕووبەری) حەوزەکەی کردووە بۆ چەند خەڵکانێکی جیاواز لەچەند شارو وڵات وشوێنێکی جیاواز بەگوێرەی ئەو شوێنانەی لێی ژیاون تا بەئاسانی خەڵکە جیاوازەکان لێی تێبگەن بەم شێوەیە :-

درێژی و پانی ئەم حەوزە هێندەی نێوان ( ئیلاو سەنعایە ، مەدینەو سەنعایە، مەدینەو عەممانە ، ئیلاو مەککەیە ، عەدەن بۆ عەممانە ، کەعبە بۆ قودسە ، جەربائو ئەزرەحە )

واتە ماوەی ڕێ ڕۆیشتنی مانگێکە ، ماوەی نێوان سەنعا بۆ مەدینە ڕێ ڕۆیشتنی مانگێکە بۆ کەسێک پەلەی نەبێت و لە ئیلەوە بۆ مەککەش بەهەمان شێوە ، لە مەدینەوە بۆ عەممانی شامیش هەروەها

پێغەمبەری خوا (ﷺ) لەباسی وەسفی حەوزەکەیدا لەڕووی ڕووبەرەوە بۆ هەر کۆمەڵێک بەگوێرەی زانینی قسەکارەکە بووە و بەشێوەیەک وەڵامی داوەتەوە کە پرسیارکاری پێ تێ بگەیەنرێت

بەکورتی ماوەی حەوزی کەوثەر دیاریدەکرێت بەوەی درێژی و پانیەکەی ماوەی ڕێ ڕۆیشتنی مانگێکە هەموو لایەکانیشی وەک یەک وان و گۆشەکانی یەکسانن و درێژی و پانیەکەی وەک یەکە

ئاوی حەوزی کەوثەر ( ئاوێکە سپی ترە لە شیر (یاخود بەفر) و ساردترە لە سەهۆڵ و شیرینترە لە هەنگوین و نەرمترە لە پەنیر (کەرە) و بۆنخۆشترە لە میسک ، هەر کەسێک قومێکی لێ بخواتەوە دوای ئەوە هەرگیز تینووی نابێت و هەرگیز ڕووی ڕەش نابێت

لە قەراغەکانی ئەم حەوزەدا زیاتر لە ژمارەی ئەستێرەکانی ئاسمان سوراحی و جام و کوپ و پەرداخی ئاڵتوون و زیو دەبینرێت

ئاوی ئەم حەوزە وەرگیراوە لە ڕووبارێکی ناو بەهەشت کە بەهەمان شێوە ئەو ڕووبارەش ناوی کەوثەرە و خوای پەروەردگار بەخشیویەتی بەپێغەمبەری خوا (ﷺ) ، ئەو ڕووبارەیە کە لە میعراجدا چاوی پێ کەوت

ڕووباری کەوثەر ڕووبارێکە لەبەهەشتدا دەڕوات بەسەر ڕووی زەوییەکەیدا بەبێ ئەوەی پێویستی بەچاڵ وجۆگە بێت و جێگە ڕۆیشتنەکەی هیچ درزیەکی تیانیە و لێوارەکانی ئاڵتوونە و هەروەها قوبەی دوڕی ناو بۆشە یاخود قوبەی مرواری ناوبۆشە، واتە ڕۆیشتنی ڕوبارەکەی بەسەر مرواری و دوڕو یاقوتدایە ، چەو و زیخەکانی هەمووی مرواریە و بۆنی خاکەکەی خۆشترە لە میسک ( لە میسکی ئیذفەڕ...)

ئاوەکەی سپی ترە لە شیر (یاخود بەفر) و ساردترە لە سەهۆڵ و شیرینترە لە هەنگوین و نەرمترە لە پەنیر (کەرە) و بۆنخۆشترە لە میسک ، چەند باڵندەیەکی

تێدایە ملیان وەک ملی حوشتر وایە ( ئیمامی عومەر ((خوای گەورە لێی رازی بێت)) فەرمووی بەڕاستی ئەوانە زۆر لە خۆشیدان (واتە باڵندەکان ) ، پێغەمبەری خواش (ﷺ) فەرمووی ( بخۆرەکەی چاکترەو نیعمەت پێدراوترە زیاتر لە خۆشیدایە ) .

ئاوی ڕووباری کەوثەر دەڕژێتە ناو دوو پلوسکەوە (دوو شیوەوە) یەکیان ئاڵتوونەو ئەوی تریان زیوە کە دوڕی بەسەردا کراوە و هەردووکیان دەڕژێنە ناو حەوزی کەوثەرەوە

لەو ڕۆژەدا پێغەمبەران (علیهم سلام) شانازی بەوەوە دەکەن کە کێیان زیاتر ژمارەی هاتووانی سەر حەوزەکەی زیاتر بێت و پێغەمبەری خۆشمان (ﷺ) دەفەرموویت من هیوام وایە کە هاتوانی سەر حەوزەکەم لەهەموویان زیاتر بێت

لەو ڕۆژەدا پێغەمبەران (علیهم سلام) هەموو یەکێک لەوان گۆچانێکی بەدەستەوەیەو ئەوەی بیناسێت لە ئومەتەکەی بانگی دەکات بۆلای حەوزەکەی

لەو ڕۆژەدا پیاوان و ئافرەتانی ئومەتەکانی تر دێنە لای حەوزی کەوثەر و گۆزەو قاپیان پێیە و دەیانەوێت ئاوی حەوزەکەی تێبکەن و ماوەیان نادرێت کە لێی بەرن و بیخۆنەوە

لەو ڕۆژەدا پێغەمبەری خوا (ﷺ) گۆچانێکی بەدەستەوە دەبێت بۆ دوورخستنەوەی ئەو کەسانەی لە ئومەتەکەی خۆی نین وەک دوورخستنەوەی وشترێکی نامۆ خۆی دەفەرموویت ( ... من لای حەوزەکەمدام ، خەڵکانی تری لێ دووردەخەمەوە و بەدارەکەم لێیان دەدەم (واتە لە کوپ وسوراحیەکانیان دەدات) تا ئاوەکە تەواو لێی بڕژێت بۆ ئومەتتەکەم ).

لەو ڕۆژەدا یەکەم کەس کە دەگاتە سەر حەوزەکە بریتیە لە پێغەمبەری خوا (ﷺ) کە دەفەرموویت ( من پێشتان دەکەوم بۆ سەر حەوزەکەم )

لەدوای پێغەمبەری خوا (ﷺ) لەو ڕۆژەدا یەکەم خەڵکان و (زۆرینەیان) کە دەچنە سەر حەوزی کەوثەر هەژارانی ناو کۆچ کردووەکانە کە قژ بژبوون و پۆشاک چڵکن بوون ((... و زەرد هەڵگەڕابوون (واتە لەبرساو لە هیلاک بوون و لاوازیدا )) ... ئەوانەی کە هاوسەری خاوەن نیعمەتیان پێ نەئەدرا و کە دەرگای

بەختەوەریان لێ نەکراوەتەوە ، ئەوانەی کە هەموو ئەو مافانەی لەسەریان بوو دەیاندا و ئەو مافانەی کە هەیان بوو (حەقیان بوو) پێیان نەدەدرا .

لەپاش ئەمانیش واتە لە پاش هەژارە کۆچکارەکان خەڵکی یەمەنی یەک خواپەرست (دەگەنە سەر حەوزەکە) کە لەکاتی ژیانی پێغەمبەر (ﷺ) و بەدوای ئەواندا ئەوانەی کە شوێنیان کەوتوون بە چاکە لە خەڵکانی یەمەن تاکو ئێستا ،

پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەفەرمووێت من لەناوەڕاستی حەوزەکەمدام خەڵکانی لێ دووردەخەمەوە بۆ خەڵکی یەمەن و لێی دەدەم بە گۆچانەکەم تا بڕژێت بۆئەوان

دوابەدوای ئەوان هاوەڵانی پێغەمبەر بەتایبەتی وە شوێن کەوتووانی بەگشتی و پاشان یەکخوا پەرستان دەگەنە سەر حەوزەکە

لەو ڕۆژەدا ژمارەی ئەوانەی دەگەنە سەر حەوزی کەوثەر بریتین لە ١٠٠ هەزار بەش ( خوای گەورە تەنها خۆی دەزانێت هەر بەشێک چەنێک کەسە )

لەو ڕۆژەدا خەڵکانی مسوڵمان پۆل پۆل دەگەنە لای حەوزەکە بۆلای پێغەمبەری خوا (ﷺ) و ئەویش لەلای مینبەرەکەیەوە وەستاوە کە مینەبەرەکەی لەسەر حەوزەکەیەتی

لەو ڕۆژەدا پێغەمبەری خوا (ﷺ) لەسەر حەوزەکەیەتی و تەماشا دەکات کە کێ دەگاتە لای

لەو ڕۆژەدا سەر ئەو حەوزە هێندە قەرەباڵغ دەبێت و خەڵکان کۆدەبنەوە لە ئومەتی ئیسلام بەوێنەی قەرەباڵغی کۆمەڵە وشترێک کە پێنج ڕۆژ ئاوییان نەخواردبێتەوە ، هەروەها قەرەباڵغیەکە بەوێنەی زیاتر لە مەوداو دووری لەنێوان ( سەنعاو ئیلەیە )

لەو ڕۆژەدا و لەوێدا (لای حەوزەکە) پیاوان و ئافرەتانی ئومەتەکانی تر دێن بە گۆزەو جامەوە و قاپیان پێیە و دەیانەوێت ئاوی حەوزەکەی (کەوثەر) تێبکەن و ماوەیان نادرێت کە لێی بەرن و بیخۆنەوە .

**ئــايــا لەو ڕۆژەدا پێغەمبەران چۆن ئومەتەکانیان دەناسنەوە ؟**

هەموو ئومەتێک لە ئومەتەکانی پێغەمبەران ( علیهم سلام) نیشانەیەکی تایبەتیان هەیە و پێغەمبەرەکەیان ئومەتەکەی خۆی پێ دەناسێتەوە و بانگیان دەکەن بۆ سەر حەوزەکانیان ، هەموو پیاوێک لە پێغەمبەران وەستاوە لای حەوزێکی پڕەوەو گۆچانێکی پێیە و ئەوانە بانگ دەکات کە دەیناسێت لە ئومەتەکەی ، و هەموو ئومەتێک نیشانەیەکی تایبەت بەخۆی هەیە کە پێی دەناسرێتەوە .

ئایا پێغەمبەری خۆمان (ﷺ) چۆن ئومەتەکەی خۆی دەناسێتەوە ؟

لەو ڕۆژەدا پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئومەتەکەی خۆی باش دەناسێتەوە بە ڕواڵەت و ناوەکانیاندا و بانگیان دەکات بۆ سەر حەوزەکەی، پێغەمبەری خوا ئومەتەکەی خۆی دەناسێتەوە بەدرەوشانەوەی شوێنەکانی دەستنوێژو بەوەی کە نامەی کارەکانیان بەدەستی ڕاستیانەوەیە و بەوەی کە نەوەکانیان لە پێشیانەوە دێن و دەچن

ئومەتی پێغەمبەری خوا (ﷺ) لەو ڕۆژەدا ناوچەوان و دەست و قاچ سپین بەهۆی شوێنەواری دەستنوێژ و شوێنەواری سوجدەبردنیان بۆ پەروەردگار( ئەوە نیشانەی ئومەتی موحەمەدە) جگە لەوان کەس وانیە

**تێبینی** / هاوار بۆ ئەو کەسەی کە نوێژ ناکات و خۆیشی بە ئومەتی محمد (ﷺ) دەزانێ ! ، تۆ کە نوێژ ناکەیت و دەستنوێژت نەگرتووە ئایا لەو ڕۆژەدا کە هیچ شوێنەوارێکی دەستنوێژو سوجدەبردنت بۆ خوا پێوە دیارە ؟! ئیتر پێغەمبەری خوا (ﷺ) چۆن بتناسێتەوەو بانگت لێ بکات بۆ سەر حەوزەکەی ؟!!!

لەخۆت بپرسە لەو نارەحەتیەی گۆڕەپانی مەحشەردا کاتێک ڕیزدەکرێیت و دەوەستێنرێی ئایا لە ڕیزی شوێنکەوتووانی ئومەتی ئیسلامدا دەبیت لەکاتێکا هیچ درەوشانەوەو نورو ڕەنگی سپی دەستنوێژو سوجدەبردنت پێوە نیە ؟؟؟؟

خۆت حوکمی خۆت بدە و ئەو دیمەنە بێنەرە بەرچاوی خۆت لەو ڕۆژەداو حاڵی خۆت ببینە

لەو ڕۆژەدا دەبێت باش بزانیت کە نیشانەی سپی کردنی دەست و قاچ و دەم و چاو تەنها بۆئەوانە دەبێت کە بەتەواوی دەستنوێژ دەشۆن و هەموو سونەتەکانی

دەستنوێژ جێبەجێ دەکەن بەبێ زیادەڕۆیی چونکە ڕووناکی تا شوێنی دەستنوێژ دەبێت بۆ کەسانی ناو بەهەشت و ئەو جێگایانە ڕۆشن دەبێتەوە

لەو ڕۆژەدا ڕوناکی و نوری ناوچەوان لە سوجدەبردندایە وەکو پەروەردگار دەفەرمووێت { ... سيماهم في وجوههم من أثر السجود ركعا ....} (الفتح ٢٩)

پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەفەرمووێت ( ئومەتەکەم لە ڕۆژی کۆتاییدا ناوچەوان سپین بەهۆی سوجدەبردنیانەوە و دەست و قاچ سپین بەهۆی دەست نوێژیانەوە )

لەو ڕۆژەدا مسوڵمانان بە بۆنی خۆشی دەمیان دەناسرێنەوە بەهۆی ڕۆژووەکانیانەوە بەجۆرێک کە لە بۆنی میسک خۆشترە ( ئەوانەی بەڕۆژوو بوون لە پێناوی پەروەردگاردا لەو ڕۆژەدا ئەو فەزڵەیان دەدرێتێ و بۆنی دەمیان خۆش دەکرێت بەجۆرێک زیاتر لە خۆشترین بۆنی میسک )

## ڕفاندنی هەندێك کەس لەسەر حەوزی کەوثەر !

لەو ڕۆژەدا لای حەوزی کەوثەر کۆمەڵە کەسانێک لە مسوڵمانان دەڕفێندرێن و دوور دەخرێنەوە دەخرێنە ناو جەهەنەمەوە ، لەوانە چینی مونافیقەکان

**تێبینی** / پێدەچێ هەندێک لە مونافیقە زۆر خراپەکان تا لای حەوزەکەش بێن لەگەڵ مسوڵمانان دواتر لە کۆتایی ڕێگەکەدا بڕفێندرێن و فڕێ بدرێنە جەهەنەمەوە

نمونەی ئەو مونافیقانە / ئەو دووڕووە بێ باوەڕانەی کە لەگەڵ هاوەڵە بەڕێزەکاندا دەژیان و ئیسلام بوونی خۆیان نیشان دەدا بە ئاشکرا بەڵام بێ باوەڕبوونی خۆیان دەشاردەوە بەپەنهانی خوای گەورەش چەندین جار لەسەر زمانی پێغەمبەرەکەی (ﷺ) ئابڕووی دەبردن هەروەها ئەو کەسانەی دوای وەفاتی پێغەمبەر (ﷺ) پاشگەز بوونەوە لە ئیسلام و لە ڕیزی موسەیلەمەی کذاب و عەنسیدا کوژران

پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەفەرمووێت ( ... پیاوانێک لەوانەی کە ( هاوەڵداریێتی منیان کردووە یاخود لە ئومەتەکەی منن ) دێن بۆ لام بۆ سەر حەوزەکەم تاکو دەیانبینم و لێمەوە دیار دەبن ، لەوێدا دەیانفڕێنن و دووریان دەخەنەوە لێم لە حەوزەکە و دەیانبەن بەلای ڕاست وچەپدا و منیش بۆیان دەپاڕێمەوە لای پەروەردگاری هەموو جیهانەکان و دەڵێم : ئەی پەروەردگار ئەوانە کەسانی سەر بەمنن ، ئەی پەروەردگارم ئەوانە ئومەتی منن و لە ئومەتەکەمن ، ئەویش دەفەرمووێت : ئەی موحەمەد تۆ نازانیت چیان دروست کرد دوای تۆ ( واتە بدعەو داهێنراوەکان ) ( ئەوانە پاشگەز بوونەوە بەشوێن پێی خۆیاندا دوابەدوا کشانەوە لەو کاتەدا تۆ لێیان جیابوویتەوە ، منیش دەڵێم (واتە پێغەمبەر (ﷺ) دەڵێت) : من شاهید بووم بەسەریانەوە هەتا لەناویاندا بووم ، کاتێک تۆ منت مراند تۆ چاودێر بووی بەسەریانەوە و تۆ ئامادەو شاهیدی بەسەر هەموو شتێکەوە ئەگەر سزایان بدەیت ئەوان بەندەی تۆن و ئەگەر لێیان ببوریت تۆ شکۆمەندو دانایت ) .

**تێبینی** / پێغەمبەری خوا (ﷺ) لەو ڕۆژەدا بۆ ئەم دووڕووە دوورخراوانە دەپاڕێتەوە، بەسیفەتی مرۆڤبوونی خۆی نازانێ کە ئەمانە چ موونافیق و بێدینێک بوون بۆیە پەروەردگار وەڵامی پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەداتەوەو دەفەرمووێ ئەی موحەمەد تۆ نازانی دوای تۆ ئەمانە چیان دروست کردو (چیان داهێنا) ، هەر لەبەرئەوەش پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەڵێ ( ئەگەر سزایان بدەیت ئەوان بەندەی تۆن و ئەگەر لێیان ببوریت تۆ شکۆمەندو دانایت ) واتە : تەنها خۆت عالم وداناو زانایت بەوەی کە بۆچی سزایان ئەدەیت (چونکە تەنها خوای گەورە زانایە بە نیەت و باوەڕبوون و بێ باوەڕبوونی ناو دڵەکان )

پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەفەرمووێت ( کەسانێک لە ئومەتەکەم دێن بۆلام بۆ سەر حەوزەکەو دەیانناسمەوە ئەوانیش من دەناسنەوە هاواریان لێدەکەم بەرەو ئێرە وەرن ، ئەو تاقمانە نزیک دەکرێنەوە لە حەوزەکە و تا دەیبینن ئینجا دەفڕێنرێن و دوور دەخرێنەوە و فڕێ دەدرێنە ناو دۆزەخەوە ).

پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەفەرمووێت ( لەکاتێکدا کە من وەستاوم تاقمێک دێن و هەتا دەیان ناسمەوە پیاوێک پەیدا دەبێت لەنێوان من وئەواندا دەڵێت : وەرن بۆلای من و منیش دەڵێم بۆ کوێ ؟ ئەوانە لەمنن و ، مەلائیکەیەک وەڵام دەداتەوە دەڵێت : بۆلای ئاگر دەبرێن سوێند بەخوا ، وە منیش دەڵێم : ئەوانە چیان کردووە ؟ ئەویش دەڵێت : تۆ نازانیت ئەوانە دوای تۆ چیان کرد و چۆنیان زیادکرد ئەوانە پاشگەز بوونەوە بەشوێنی خۆیاندا پشتاو پشت لە ئاینەکەت هەڵگەڕانەوە ئەوان گۆڕان دوای تۆ و ، ( منیش دەڵێم : ڕیسوایی ڕیسوایی بۆ ئەو کەسەی کە گۆڕا دوای من ....) (.. وە من باوەڕناکەم ڕزگار بێت لێیان تەنها وەکو ون بوو لە ئاژەڵەکاندا ) .

پەروەردگار پەنات پێدەگرین لەوەی کە بگەڕێینەوە بەشوێن خۆماندا یاخود توشی سەرلێشوان و فیتنە ببین لە ئاینەکەماندا ). خوایە نیعمەتی چوونە سەر ئەو حەوزەمان پێ ببەخشیت و بەدەستە پیرۆزەکانی پێغەمبەرەکەت (ﷺ) لە ئاوی کەوثەر بخۆینەوە .

لەو ڕۆژەدا تاقم و گروپە گومڕاو زیادکراوەکانی ناو ئاینی پاک و بێگەردی ئیسلام دەفڕێندرێن و فڕێ دەدرێنە جەهەنەمەوە وەک تاقمی (خەوارج و موعتەزیلەکان ، قەدەریەکان ، مورجیئەکان ...هتد )

پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەفەرمووێت ( دوو تاقم هەن لە ئومەتەکەم نایەن بۆلام بۆ سەر حەوزەکەم وە ناچنە ناو بەهەشت : قەدەریەکان و مورجیئەکانن )

**تێبینی** / بیرۆکەی ئەم تاقمە گومڕایانە بەردەوام دەبێت تا هەستانی ڕۆژی کۆتایی و ئەم بیدعانە خەڵکان بە سوننەتیان دەزانن و لانادەن لێی وە هەرگیز ناتوانن سوننەتە صەحیحەکانی پێغەمبەر (ﷺ) جیابکەنەوە لەو بیدعانەی کە فەیلەسوفەکان و بێ باوەڕان و هەندێک باوەڕ لاوازەکان دروستیان کردووە ، وە بە بیرۆکە گومڕاکانی خۆیان هەڵخەڵەتاون و گومڕابوون

سەبارەت بەم باسە ( ابن مسعود) (خوای گەورە لێی ڕازی بێت) دەفەرمووێت: ( حاڵتان چۆنە کە فیتنەیەکتان بەبەردا کراو پیرەکانی لەسەر پیربوون وبچوکەکانی لەسەر پەروەردەکران ، خەڵکان بە سوننەتیان دانا ، و ئەگەر گۆڕا دەڵێن : سوننەتێکت گۆڕی ، وتیان ئەی باوکی عبدالرحمن کەی ئەوە دەبێت ؟ فەرمووی : کاتێک قورئان خوێنەکانتان زۆر بوون و تێگەیشتووەکانتان کەم بوون و فەرمانڕەواکانتان زۆر بوون و دەست پاک و ئەمیندارەکانتان کەم بوون و دونیا بەکارەکانی ڕۆژی کۆتایی پەیداکرا و ( تێگەیشتن تەنها بۆ زانیاریەکانی دوور لە دین بوون )) ، ئەم تاقمانە ئەوانەن کە دوور دەخرێنەوە لە حەوزی کەوثەر چونکە پێغەمبەر کاتێک پرسیار دەکات بەهۆکاری دوورخستنەوەی ئەوان (بەپێغەمبەر ) دەڵێن (( .... تۆ نازانیت ئەوانە چیان دروست کرد دوای تۆ ...ئەوانە گۆڕان لەدوای تۆ ...)) ، لەوەڵامیشا پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەفەرمووێت ( ... ڕیسوایی ڕیسوایی بۆ ئەو کەسەی کە خۆی گۆڕاوەو ئاینەکەی گۆڕیوە لەدوای من ...) .

لەو ڕۆژەدا خەڵکانێکی تر هەن کە ناگەنە سەر حەوزەکە ....

پێغەمبەری خوا (ﷺ) بەم شێوەیە بۆمان باس دەکات و فەرمانمان پێدەکات و دەفەرمووێت ( .... دوای من کاربەدەستانێک دەبن ڕێگای من ناگرن و سونەتەکانی من پشتگوێ دەخەن و ئێوە درۆکانیان بەڕاست نەخەنەوە و لەکارە ستەمکارەکانیاندا پشتیگیریان لێ مەکەن چونکە هەرکەس بچێتە لایان ودرۆکانیان بەڕاست بخاتەوە و پشتگیری لە ستەمەکانیان بکات ئەوە لەمن نیە و منیش لەو نیم و نایەتە لام بۆ سەر حەوزەکەم ، هەر کەسێک درۆکانیان بەڕاست نەخاتەوە

و پشتگیری لە ستەمەکانیان نەکات ئەوە لەمنەو منیش لەوم و ئەویش دێتە لام بۆ سەر حەوزەکەم )

ابن عباس (خوا لێی ڕازی بێ) دەفەرمووێ ( … هەرکەسێک بچێتە دەرگای کاربەدەست توشی فیتنە دەبێت وە هەرکەسێک لەکار بەدەستێک زیاتر نزیک بێتەوە ئەوا زیاتر لەخوا دووردەکەوێتەوە ) .

لەو ڕۆژەدا ئەوانەی باوەڕیان بەچوونە سەر حەوزی کەوثەر نەبووە و بەدرۆیان زانیوە لەژیانی دنیایاندا خوای گەورە بێ بەشیان دەکات لەو حەوزە

ئیمامی قورتوبی (ڕەحمەتی خوای لێبێ) فەرموویەتی :

زانایانمان فەرموویانە : هەر کەسێک پاشگەز بێتەوە لە ئاینی خوا یاخود بیدعەیەکی تیا دروست بکات کە خوا پێی ڕازی نیە و ڕێگەی پێ نەداوە ئەو کەسە یەکێک دەبێت لە دوورخراوەکانی حەوزی کەوثەر و، لە هەموویان زیاتر کە دووردەخرێتەوە کەسێکە کە پێچەوانەی کۆمەڵی مسوڵمانان ( واتە ئەهلی سونەو جەماعەت ) بێت وەک : خەواریجەکان و ڕافیزەکان و موعتەزیلەکان بەهەموو بەشەکانیانەوە و هەموو ئەوانە کە ئاینی خۆیان گۆڕیوە ، هەروەها ستەم کارەکان کە زیادەڕەویان کردووە لەناهەقی و ستەم کردن و سڕینەوەی ڕاستی وسەرشۆڕکردنی ئەهلی حەق وە ئەوانەی کە تاوانە گەورەکانیان بەئاشکرا ئەنجام داوە و تاوان کردنیان بەلاوە ئاسان بووە ، و کۆمەڵی ئەهلی بیدعەو لادەر لە ئاینی خوا ).

ئیمامی سەفارینی (ڕەحمەتی خوای لێبێ) دەفەرمووێت : ( کەواتە ئەوانەی کە دووردەخرێنەوە لە حەوزی کەوثەر ئەو کەسانەن کە درۆیان کردووە بەناو خوا و پێغەمبەرەکەیانەوە و ئەوانەی کە بیدعە تازە پەیدابووەکانیان هێناوەتە ناو ئاینەوە وەک : ڕافیزەکان و خەواریجەکان و سەرجەم خاوەن بیدعە و ئارەزووە گومڕاکان و هەروەها ستەمکارە زیادەڕەوەکان کە زیادە ڕەوییان کردووە لە زوڵم و ستەمدا و هەروەها ئەوانەی کە سوکایەتیان کردووە بە ئەنجامدانی کارە حەرامەکان و ئەوانەی بەئاشکرا گوناهو تاوانەکانیان ئەنجامداوە ).

لێرەدا كۆتایی بە هەموو مونافیق و دووڕووەكان دێت و هەموو فڕێ دەدرێنە دۆزەخەوە ، تەنها باوەرداران دەمێننەوە لای باخەكان و كانیاوەكانی بەردەم دەرگاكانی بەهەشت كە دڵیان لەسەر دڵی یەك پیاوەو پاك و بێگەردن و ئامادەی چوونە ناو بەهەشتن .

لێرەدا هاتینە كۆتایی سەرجەم نارەحەتی و ڕووداوەكانی ڕۆژی قیامەت .

## ئایا دەرگاکانی بەهەشت چۆن دەکرێنەوە ؟
## ئایا چۆن ئیزن وەردەگیرێت بۆ کردنەوەی دەرگاکان ؟!

خوێنەربن :

دەرگاکانی بەهەشت دەکرێتەوە بۆ خاوەن باوەڕە موەحیدەکان ( یەک خوا پەرستەکان )

ئینجا لەئێستاوە کاتی خۆشترینی خۆشیەکانە ئەویش کردنەوەی دەرگاکانی بەهەشتەو چوونە ناوەوەی خاوەن باوەڕەکانە بۆناوی

دوای ئەوەی خەڵکان لە ئاوی حەوزی کەوثەر دەخۆنەوە ڕادەوەستن و چاوەڕوانی چوونە ناو بەهەشت دەکەن ، بەهەشت بەرامبەریانە و لە دوورەوە دەیبینن دەرگاکانی داخراوە

دواتر خەڵکان لەناوخۆیاندا مقۆ مقۆیانەو لەناویەکدا دەگەڕێن بۆ کەسێک کە دەرگاکانی بەهەشتیان بۆ بکاتەوە :-

خەڵکان لەوێدا بەئادەم (علیه سلام) دەڵێن : (ئەی باوکی ئێمە داوای چوونە ناو بەهەشتمان بۆ بکە ) ئەویش دەڵێت : ( ئەی ئێوە بەهۆی هەڵەکەی باوکتانەوە لەبەهەشت نەکرانە دەرەوە ؟! من خاوەنی ئەو کارە نیم ). ... بەڵام برۆن بۆلای نوح (علیه سلام) ،

دەچن بۆلای پێغەمبەر نوح (علیه سلام) و ئەویش دەڵێت : من دوعاو نزایەکم کرد لەوانەی کە لەسەر زەویدا دەژین و سەرجەم هەموو لەناوچوون

بەڵام برۆن بۆلای پێغەمبەر ئیبراهیم (علیه سلام) دەچن بۆلای پێغەمبەر ئیبراهیم (علیه سلام) وئەویش دەڵێت : (من خاوەنی ئەو کارە نیم ) من سێ درۆم کردووە .

**تێبینی/** ( پێشتر باسی ئەو ٣ درۆیە کرا کە هەموو یەکێک لەوانە بۆ پارێزگاری بووە لە دینەکەی خوا و لە ئەسڵدا درۆ نەبووە )

پاشان پێغەمبەر ئیبراهیم (علیه سلام) دەڵێ بڕۆن بۆلای پێغەمبەر موسا (علیه سلام) دەچن بۆلای پێغەمبەر موسا (علیه سلام) و ئەویش دەڵێت من خاوەنی ئەوە نیم من نەفسێکم کوشتووە ( بەهەمان شێوە پێشتر ئەو کوشتنە باسی لێوە کراوە )

بەڵام بڕۆن بۆلای پێغەمبەر عیسا (علیه سلام)

دەچن بۆلای پێغەمبەر عیسا (علیه سلام) و ئەویش دەڵێت : ( من خاوەنی ئەو کارە نیم) من جگە لە خوا پەرستویانم ، بەڵام بڕۆن بۆلای پێغەمبەر محمد (ﷺ) .

پاشان خەڵکان دێن بۆلای پێغەمبەر محمد (ﷺ) دەڵێن : ئەی پێغەمبەری خوا ، تۆ خوای گەورە دەرگای هەموو چاکەیەکی بۆ کردوویتەتەوە و لێت خۆش بووە لەهەموو گوناهەکانی سەرەتاو دوایت ، وە تۆ دەبینیت ئێمە لە چ حاڵێکداین تکامان بۆ بکە لای خوای گەورە ، ئەویش دەفەرموویێت : من ئەو هاوەڵەتانم ، لەوێدا پێغەمبەر (ﷺ) دێتە دەرەوە و بەنێو خەڵکاندا دەڕوات و خۆی دەفەرموویێت ( ... من ئالای (حەمد و ستایشم) پێیە و دەڕۆم و خەڵکانیش لەگەڵ مندا دەڕۆن ، تا دەگەمە بەردەرگای بەهەشت )

هەروەها (ﷺ) دەفەرموویێت ( من دەڕۆم تا دەگەمە ژێر عەرش ...) ، ( ... دواتر خوای گەورە دام دەنێت لە جێگەیەک کە لەپێش من کەس بەو جێگەیە نەگەیشتووە و دوای منیش کەس پێی ناگات ... داوای ڕێگە پێدان دەکەم لە خوای گەورە و ڕێگەم پێ دەدات (( من دەچمە بەردەم خوای گەورە و پێشوازیم لێ دەکرێت .. و کە دەیبینم کڕنووشی بۆ دەبەم ، دواتر خوای گەورە چەندین سوپاس و ستایشی جوانم دەخاتە دڵەوە کە پێشتر بە هیچ کەسێکی نەبەخشیوە وە دواتر بەهیچ کەسێکی تری نابەخشێت

لەوێدا من بەو سوپاس وستایشە جوانە سوپاس و ستایشی خودا دەکەم ... لەوێد لێم دەگەڕێن لە سوجدەدا دەمێنمەوە تا ئەو کاتەی خوای گەورە ویستی لێیەتی ، پاشان دەوترێت : .... ئەی محمد سەرت بەرزبکەرەوە بڵێ گوێت لێ دەگیرێت ، داوا بکە تا داواکەت بۆ جێبەجێ بکرێت ، تکا بکە تا تکات لێ وەربگیرێت ، منیش سەر بەرزدەکەمەوە و دەڵێم : خوای گەورە ئومەتەکەم ئومەتەکەم ، دەوترێت : ئەی موحەمەد ئەوانەی لە ئومەتەکەتدا لێ پرسینەوەیان لەسەرنیە

لە دەرگای لای ڕاستی دەرگاکانی بەهەشتەوە بیانکەرە ژوورەوە ، وە ئەوانەش بەشدارن لەگەڵ خەڵکانی تردا لەدەرگاکانی تری بەهەشتدا .

ئەو پێغەمبەرە نازدارە (ﷺ) دەفەرموویت ( ... وە من یەکەم کەس دەبم کە دەچم بۆناو بەهەشت بەبێ شانازی ، ئەڵقەی دەرگای بەهەشت بەدەست دەگرم و دەیلەرێنمەوە ... لەوێدا داوای دەرگا کردنەوەو چوونە ژوورەوە دەکەم ، دەرگاوانی بەهەشت پێم دەڵێ : کێی تۆ ؟ منیش دەڵێم : محمد ، ئەو دەڵێت بەخێر هاتی محمد، فەرمانم پێکراوە لە پێش تۆ دەرگا بۆ کەس نەکەمەوە ... دەرگام بۆ دەکەنەوەو پێشوازیم لێ دەکەن و بەخێرهاتنم دەکەن

پاشان هەموو مسوڵمانان و خەڵکانی ئەهلی بەهەشت بەدوای پێغەمبەری خوادا (ﷺ) دەچنە ناو بەهەشتانێکەوە کە خۆشترینی خۆشیەکانە هەتاهەتاییە و ئەوەی هەم و غەم و خەم و ترس و ناڕەحەتی بێتاقەتی بێت تیای نیەو ئیتر ژیانی ڕاستەقینەی پڕ لە خۆشیەکان بۆ هەتا هەتایە لێرەوە دەست پێدەکات و ئەو بەهەشتانە پڕن لە مەملەکەت و نیشتیمانی گەورەو پڕن لە خۆشی و نازو نیعمەت و باخ و باخات و ڕوباروو و باڵەخانەو ڤێلاو کۆشک و تەلارو کەشتی و باخیرەی ئاڵتوون .. هتد .. وە بەجۆرێکن و هێندە پێشکەوتوون کە چاوەکان نەیانبینیوە گوێکان نەیان بیستووەو و بە خەیاڵ و ختورەش بەدڵەکاندا نەهاتوون ...

هەروەک کاتێک لە ئیمامی احمد (ڕەحمەتی خوای لێبێ) دەپرسن ( کەی ئیسراحەت دەست پێدەکات ؟ ئەویش دەفەرموویت ( بەیەکەم هەنگاوی قاچت کە دەیخەیتە ناو بەهەشتەوە ) .

لێرەدا هاتینە کۆتایی سەرجەم ڕووداو هەنگاوەکانی ڕۆژی قیامەت بەڕیزبەندی و یەک لەدوای یەک .

پەروەردگار بەگەورەیی و بەڕەحمی فراوانی خۆت داوات لێدەکەین بەبێ حساب و کتاب و لێپرسینەوە لەو ڕۆژە ناڕەحەتە ڕزگارمان بکەیت و بمانخەیتە بەهەشتی فیردەوسی اعلاوە

**سُبْحَانَ رَبِّكَ رَبِّ الْعِزَّةِ عَمَّا يَصِفُونَ وَسَلَامٌ عَلَى الْمُرْسَلِينَ وَالْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ**

**کۆتــــــــــــایی**

## سەرچاوەکان

سەرچاوەو بەڵگەکان و ڕووداوەکانی ئەو جیهانە کە لەم کتێبەدا باسکران هەمووی هەڵهێنجراوی ئایەتەکانی قورئانی پیرۆزو فەرموودە شیرینەکانی پێغەمبەری خوایە (ﷺ) .

دەتوانن بۆ دەستکەوتن و زانینی سەرچاوەی هەموو (ئایەتەکان و فەرموودەکان و ڕیوایەتەکان) بگەڕێنەوە بۆ کتێبی قیامەتەکەی مامۆستای خۆشەویست (م. محمد مەلا فائق شارەزووری ) .

بابەتە پزیشکیەکان: لە سەرچاوە پزیشکیەکانەوە وەرگیراوە ، نوسەر خۆی پزیشکە.

# نـــــاوەڕۆک